**ناصری سوبحانی**



# بەندایەتی

**پوختەی ١٣ شریتی بەندایەتی**

چاپی دووەم

زنجیرەی بەرهەمەکانی شەهید ناصری سوبحانی ٢

# بەندایەتی

## پوختەی ١٣ شریتی بەندایەتی

زنجیرە باسێکە دەربارەی

⚙چۆنیەتی بەندایەتیکردن بۆخوا

⚙حەقیقەتی یەکتا پەرستی ⚙حیکمەتی پەرستشەکان

⚙ چمکێك لە ڕەوشتە سەرەکییەکانی موسوڵمان


مامۆستا

ناصری سوبحانی



چاپی دووەم

١٤٢٧ك - ٢٠٠٦ز

دەزگای (بەرهەم) بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی سوبحانی

dazgayberham@yahoo.com




- ناوی کتێب: بەندایەتی
- نوسینی: م. ناصری سوبحانی
- ژ. سپاردن: (٤٩٥) ی ٢٠٠٦ ی دراوەتێ
- ساڵی چاپ: ئابی ٢٠٠٦
- نۆبەی چاپ: دووەم
- نرخی کتێب: (٣٠٠) دینار

## پێشەکی چاپی دووەم

پاش سوپاسی بێپایان بۆ خواو درورود بۆ گیانی پێغەمبەری خواو یارانی و شوێن کەوتوانیان:

کاتێ ئەم بەرهەمە کەوتە بەردەستی خوێنەران لە بڕوای کەسدا نەبوو بە دوو مانگ نوسخەی لە بازاڕدا نەمێنێ و هەزار دانەی لەو ماوە کەمەدا ببێتە میوانی خوێنەران.

بەوە دڵنیابووینەوە کە لاواغان تینووی ئەم بابەتە ئیمانیانەن.. بۆیە یەکسەر چاپی دووەممان کردەوە تا نوسخە بگاتە دەستی تامەزرۆیانی خواناسی و ڕەوشت بەرزی.

ئێستە جێی‌خۆیەتی کە بڵێین: ئەم بەرهەمە لەو بەرهەمانەن کە دەبێ بخوێنرێنەوە. دەبێ ئەوەی نوێمان لەسەر ئەم چەمك و تێگەیشتنانە گۆش بکەین، تا بیرۆەی بن لە شالاوی بڕوا کزبوون و بیرو بیرۆکە لەدەرەوە هێنراوە چەوتەکان.

ئامۆژگاریمان بۆ خوێنەران ئەوەیە ئەم بەرهەمە لە کەش و هەوایەکی هێمن و ئارامدا بخوێننەوە. ئەگەر بکرێ بە شێوەی خێزانی و دورر لە جەنجاڵ، یا بەشێوەی دەستە جەمی چەند هاوڕێیەك، چونکە کاریگەری و بەرەکەتی تایبەتی خۆی دەبێ.

بەهەرحاڵ ئەمە کتێبی موتاڵای سادە نییە. ئەم بەرهەمە پوختەی ئیمان و ئیسلامە، پیاوێکیش واژۆی‌کردووە کە ژیانی هەموو بۆ

خواناسی و خوا ویستی تەرخانکرد. پوختەی ئەزموون و تێگەیشتنی مامۆستا ناصری سوبحانی‌یە لە قورئان و ژیاننامەی پێغەمبەری پێشەواو یارانی پێشەنگی ..

هیوادارین خوشك و برایانی خوێنەر بە نیازی سوودمەندی بیگرن بە دەستەوەو، بە گوێی دڵ بەهرە لە گەوهەرەکانی بەرن.

خوێنەرانیش دڵنیا دەکەینەوە کە ئەم بەرهەمە بۆ چاپی دووەم بەوردی سەیر کراوەتەوە و هەندێ هەڵەی چاپی و زمانەوانی تێدا چاك کراوە و، هەندێ دەستەواژەو ڕستەی تۆخ کراونەتەوە لەبەر بایەخ و گرنگی‌یان.

هەروەها بۆ ئاسانکاریی خوێنەران و سوود بینین لە ناوەرۆکی کتێبەکە، بەش بەش کراوەو لە شەش بەشدا پۆلێنی بابەتەکان کراوەو پێڕستی بۆ دانراوە.

خوای گەورە لە خێرو پاداشتی نەبڕاوەی خۆی بێ بەشمان نەکات.

دەزگای بەرهەم

ئابی ٢٠٠٦

## پێشەکی چاپی یەکەم

مامۆستا ناصری سوبحانی یەکێکە لەو زانا و بیریارە هاوچەرخانەی کوردستانی ئێران، کە زۆر دەخایەنێ تا وەك خۆی بناسرێ و، هەڵکەوتوویی‌و، ئاستی زانستی‌و، ڕادەی ئیمانداری و، دڵسۆزی ولێبڕانی بۆ ئاین وگەل و وڵاتەکەی، وەك پێویست بۆ هەمووڵا ڕوون ببێتەوە.

شەهید سوبحانی هاوشانی زانا هەڵکەوتووەکانی سەدە زێڕینەکانی دونیای ئیسلام بوو.لەتێگەیشتنی قورئان و واتاکردنی و سوود لێ وەرگرتنیدا، کەم وێنەبوو. دەتوانین بێ دوو دڵی بڵێین لە بواری چوونە ناوەرۆکی چەمکە قورئانیەکان و وەرگرتنی دیلالەتە گەورەکانیدا ـ بەلای کەمەوە لەم سەردەمەدا ـ وێنەی نەبوو.

لە دونیای تێگەیشتن لەزانستە ئیسلامیەکانی ( علوم القران ) و( علوم الحدیث )و (اصول الفقه ) دا چەندین داهێنانی گەورەی کرد.

ڕەنگە خوێنەرانێ کە نەیناسن یەکسەر پرسیاری ئەم کەسایەتیە گەورە گومناوە بکەن. بەڵام زۆر ئابا باش دەیناسن و بەرهەمە ئاپابەکانی دەبینن. ئاخر ئەویش قوربانیەکی تری دونیای بێ‌تازی و بێ ڕەحمی وڵاتەکەی خۆی بوو..زۆری تر هەبوون هەروەك ئەو لەهاوچەرخانی، بزرکران، بەڵام زۆری ئەبرد تیشکی توانای

بەھرەکانیان دڕیدا بەتاریکی ناھەقیو، باسیان کەوتەوە ناو کۆڕ و کۆمەڵانو، وەك خۆیان ناسرانەوە.

مامۆستا ناصر ناکریٚ لەم پێشەکییە کورتەدا بناسریٚ.لێرەدا ئەوەندە بەسە کە بڵێین یەکێکە لە سەرکردە کوردەکانی شۆڕشی گەلانی ئێران دژی ڕژێمی ستەم شاھی، دواتریش یەکیٚ بووە لە ڕابەر و پێشەنگە ناودارەکانی ڕابوونی ئیسلامی ھاوچەرخ لە کوردستانی ئێران و ئێران بەگشتی.

لەساڵی١٩٥١ ی زاینیدا لە گوندی (دوریسان) ی نزیك شارۆچکەی (پاوە) ی ھەورامانی ئێران، لەدایك بووە. پاش تەواو کردنی قۆناغی ناوەندی چۆتە خوێندنی فەقێیەتیو، لای گەورە زانایانی ئێران خوێندویەتیو، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە.

لەچەند ساڵێکی پێش شۆڕشی ئێرانەوە دەستی داوەتە خەباتی ئیسلامی و بایەخ دان بەقورئانی پیرۆز و زانستە ئیسلامیەکان. لە شۆڕشی گەلانی ئێراندا- لەناوچەکەی خۆیدا - ڕۆڵی سەرکردەییو پێشڕەویی بینیوە. لە سەرەتای شۆڕشی ئێراندا چەندین جار سەردانی سەرکردەکانی ئێرانی کردووەو، داواوگلەیی و گازەندەی خەڵکی کوردستانی ئێرانی گەیاندووە پێیان. ھاوکارێکی دڵسۆزی مامۆستا ئەحمەدی موفتی زادە - کەسایەتی ناوداری ئێران - بووە.

چەند جارێك سەردانی دەرەوەی ئێرانی کردووەو، دیدارو ڕاگۆڕینەوەی لەگەڵ گەورە ناودارانی ڕابوونی ئیسلامیی هاوچەرخ هەبووە. چەندین بەرهەمی زانستی نوسراوی هەیە، بە سەدان کاسێتی بە هەر سێ زمانی کوردیو فارسیو عەرەبی، لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە. لەچەندین گۆڤاری ئیسلامیدا بەناوی خوازراوەوە بابەتی بڵاو کردۆتەوە. بابەتە زانستیەکانی لە ئاستێکی ئەکادیمیی زۆر بەرزدان. لەبەر هەلومەرجی سیاسی تایبەتی ناوخۆی ئێران، نەتوانراوە تا ئێستە بەرەمی بەرهەمەکانی بڵاوبینەوە، بەلام لە زۆربەی ماڵ و مەدرەسەو ناوەندە ئیسلامیەکاندا، سوودیان لێ دەبینرێ.

## پوختەیەك لەكەسێتی مامۆستا ناصری سوبحانی

مامۆستا ناصر مرۆڤێكی هیممەت بەرزو گەورە بوو. لەسەر خۆو ئارام و بێ دەنگ بوو. بێدەنگییەكەی گوزارشتی لەدەرون بەرزیءودەولەمەندی فكری دەكرد. وردبوونەوەی زۆر بوو. هێزی عیبرەت وەرگرتن وهەڵهێنجانی لەدەق و رووداوەكان كەم وێنە بوو.. زۆر سوور بوو لەسەر رێز گرتن لە كاتیءخۆی وكاتی دۆستانی..نوێژەكانی زۆر بە (خشوع) و ملكەچیءیەوە دەكرد.لە نزاو پارانەوەكانیدا نمونەی بڕوادارێكی بەمتمانە بوو. لە گەشتو سەیرانو سەفەرەكانیدا لە هەموو دیمەن و دیاردەو حاڵەتێك پەندو عیبرەتی دەردەهێنا.. زۆر حەزی لەئەدەب وشیعری بەهێزی شاعیران بوو. لەقورئان خوێندندا زۆر ملكەچی و تێڕامانی هەبوو، بە مەبەستی بیر كردنەوە لەئایەتەكان زۆر دەوەستا. لە شەوو رۆژدا چەندین جار دەچووە خزمەتی قورئان. دەفتەرێكی لەلا بوو سەرنج وتێبینی و (خواطر) ی خۆی تۆمار دەكرد..

لەڕووی جەستەییءیەوە لاواز بوو، ٤٨ تا ٥٠ كیلۆ كێشی هەبوو، زۆر كەمی دەخوارد وحەزی لەخواردەمەنیءیە كوردەوارییەكان بوو، هەمیشە جل وبەرگی كوردی لەبەر دەكرد، هەرگیز جل وبەرگی گرانبەهای لەبەر نەدەكرد.زستانان پەستەكێكی بێ قۆڵی لەبەر دەكرد..

زۆرکەم دەنووست. قەناعەتی وابوو کە مرۆڤی بانگخوازو زاناو بەرپرسان نابێ بەزۆر خەو بە خۆیان بێنن. کاتی ڕۆژانەو هەفتانەی بە بەرنامە بوو. زۆر دژی کات بەفیرۆدان بوو.پرۆژەی نوسین وتوێژینەوەی زۆری لە زیهندا بوو. نوسین و یاداشتەکانی زۆر وردو ئەکادیمی و زانستی بوون. خەتێکی زۆر جوان و نایابی هەبوو. بە بەلگەوە ڕاو بۆچوونی خۆی دەردەبڕی. زۆر پشتی بە قورئان دەبەست بۆ بەلگە هێنانەوە، هێزو توانایەکی کەم وێنەی هەبوو لەدەرهێنانی بەلگەو ئەحکام دیاری کردندا.

لە کاتەکانی پێش بانگدا لەحالەتەکانی (فجر) و (زوال) و (غروب) و (شفق) ورد دەبۆوە.بڕوای وا بوو حیکمەتی دیاری کردنی نوێژەکان لەو کاتانەدا دەبێ ڕەچاوبکرێ بە وردبوونەوە لە لەحزەی یەکەمی کاتی نوێژ، قەناعەتی وابوو کە بۆ یاد کەوتنەوەی (تحول) و گۆڕانکاریی گەورەی بوونەوەر (واتە هاتنی ڕۆژی دوایی) یە.

بەڕێزمامۆستا ناصر زەوقێکی جەمالیی کەم وێنەی هەبوو. حەزی لە ئاوازی خۆش بوو.بۆخوی شیعر و(تواشیح)ی بەئاوازەوە تۆمارکردووە و لەکاسێتدا پارێزراون. هەروەها زۆر حەزی لە گوڵ و زینەتی سادەی بێ مسرەفی ناو ماڵ بوو. پاك وخاوێنی زۆر مەبەست بوو. لە خوێندنەوەی کتێب و بابەتە زانستیەکاندا زۆر خێرا بوو، لە

ساتێکی زۆر کورتدا چەند لاپەڕەیەکی دەخوێندەوە، لەگەڵ ئەوەش دا هەموو ناوەرۆکی ئەو بابەتەی لەبەر ئەکرد.

مامۆستا زۆر سەر قاڵ بوو لەگەڵ قورئانـدا. زۆربـەی چـەمك و تێگەیشتنـەکانی لەوەوە وەردەگـرت. فـەرموودەکانی پێغەمبـەری (ﷺ) بەرروونکـەرەوەی قورئـان دەزانـی، زۆربـەی کتێبـی (امهـات) وسەرچـاوەکانی خوێنـدبووەوە.خـۆی بـە (مُجتهـد) و خـاوەن (رأي) دەزانی. زۆر بە متمانە بەخۆ و بە جورئەتـەوە بۆچـوون و ڕەئی‌یـەکانی خۆی ئاراستە دەکرد.

مامۆستای ڕەحمەتی زۆر لە سەرخۆ قسەی دەکرد، دەنگی نزم بوو، زۆر بە ئارامی دەچووە ڕێوە، بەڕاستی میصداقی ئایەتی﴿الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا﴾ بوو، بەچوار مشقی دادەنیشت، زۆرجار بەسەر خوێندنەوەی کتێبەوە خەوی لێ دەکەوت، هەرگیز توڕە نەدەبوو، مەگەر کاتێ نافەرمانی‌یەکی ڕەچاوبکردایە. توڕەیی دەخواردەوە.

لە ڕووی مەسەلەی نەتەوەیی‌یەوە هەڵپێکانێکی جوانی دەکرد لە نێوان کێشەی نەتەوەیی وچەمکە ئیسلامی‌یەکاندا، زۆر بەپەرۆش بوو بۆ کێشەی کوردی ئێران. ستەمەکانی هەڵەبجەو ئەنفال و ئاوارەیی زۆر هەژاندی، بابەتی زۆر کاریگەری نووسی سەبارەت بە کیمیابارانی هەڵەبجە..نامەیەکی ئاراستەی پێغەمبەران (عليهم السلام) کردووە بە عەرەبی بە ناونیشانی (رسالة آلام من أرض بلايا الى معشر الانبياء) کە

تێیدا سکاڵای گەلی کورد بۆ گرژی پێغەمبەران و سەرقافڵەیان پێغەمبەری ئیسلام محمد ﷺ بەرز دەکاتەوە.

لەژیانیدا کەسایەتی گەورەو ناوداری ئیسلامیی زۆری دیوە، لەوانە: (شەهید عبداللە عزام، عمر تلمسانی، حامد ابو النصر، عدنان التمیمی، کمال السنانیری، اسامة تکریتی، عادل شویخ، نعمان السامرائی، د.علی قەرەداغی، مامۆستا صلاح الدین محمد بهاءالدین ومحمد احمد الراشد) و زۆرێکی تر لە سەرکردەکانی ڕەوتی ئیسلامی لە کوردستان.

مامۆستای ڕەحمەتی هەرگیز سوێندی نەدەخوارد، زۆر بڕواشی بە کەسێك نەدەکرد کە سوێندی زۆر بخوا. بە موبالەغە کردن و قسەی زۆری بێ سوودو کات بە فیڕۆدان بێزار دەبوو. زۆر حەزی لە ڕێکخستنی کات و بەرنامەڕێژیی هەبوو.

مامۆستا ڕێزی بەرامبەرەکانی زۆر دەگرت، حەزی نەدەکرد تەنانەت نەیارەکانیشی تەریق بکاتەوە. هەندێ گفتوگۆ و حیوار و موناقەشەی لەگەڵ چەپەکانی ئێران دا هەیە کەنموونەی (منطق) داری وبەهێزیی بەڵگە و جوانی شێوازی مامەڵە کردن و بەرامبەر خوێندنەوە و دایەلۆکە.. لەگەڵ هاوسەری ومناڵەکانیدا زۆر نەرم و نیان و میهرەبان بوو. لەکاروباری ماڵەوەدا یارمەتیەکی زۆری خێزانی دەدا.لەگەڵ مناڵان یاری دەکرد.لەکاتی وانە وتنەوەدا مناڵە

بچکولەکەی لە کۆشی یا لەسەر ڕانی دادەنا.لەگەڵ خزمانی هاوسەریدا زۆر بەڕێز بوو. لەگەڵ هاوەڵانی زۆر (متواضع) و ڕەوشت بەرز بوو، ڕێزی دەگرتن، گوێی لێ دەگرتن، بەنەرمی پێشنیاری خۆی و ئامۆژگاریەکانی ئاراستە دەکرد. هەر ڕاو بۆچوونێکی بەرامبەری بەدڵ نەبوایە بەنەرمی وەڵامی دەدایەوە.

لەژیانیدا سێ جار سەفەری کردووە بۆ دەرەوەی ئێران، دووجار بۆ پاکستان و نزیکەی ساڵێك ماوەتەوە.جارێکیش بۆ تورکیا بۆ بەشداریی کۆنگرەیەك کە تایبەت کرا بەکێشەی کورد و تیایدا لەلایەن چەند کەسایەتیەکی ئیسلامخوازی کوردستانەوە، بڕیاری دامەزراندنی ڕێکخراوی (رابیطە ی ئیسلامی کورد) درا، کە لە ساڵی ١٩٨٨ی زایینی لە ئەستەمبوڵ بەسترا.

ئەوە گۆشەیەك بوو لە پێناسەی کەسێتی مامۆستا سوبحانی. دیارە باشترین ڕێگەو هۆکار بۆ زیاتر ناسینی ئەو کەسایەتیە لەڕووی فکری یەوە، یا لە ڕووی بەرزی پلەی ئیمانی و دەرخستنی ڕادەی دەوڵەمەندی هزر و بیریەوە، یا لە ڕووی خەستیو فراوانی بۆچونەکانی یەوە، ئەو بەرهەمانەن کە هەندێکیان دەست نووسن و هەندێکی تریان لە کاسێتی تۆمارکراودان..[1]

---

[1] ئەم پوختەیە لە کتێبی ژیاننامەی (محەمەدی ئازادی بیروڕا ، مامۆستا ناصری سوبحانی) وەرگیراوە . لە ئامادەکردنی دەزگای سەرھەم .

## سەبارەت بەم بەرهەمە

ئەم بەرهەمەی لەبەر دەستی خوێنەری بەڕێزدایە لە ئەسڵدا بابەتێکی فکری و پەروەردەیی یە کە مامۆستا ناصر لە سێزدە کاسێتدا تۆماری کردوون و بە (شریتەکانی بەندایەتی ) ناسراون.

ڕاستی یەك هەیە زۆر پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێ بکرێ، کە ئەم بەرهەمە پاش هەوڵ و ماندوبونێکی زۆر لەلایەن چەند براو دۆستێکی مامۆستای شەهیدەوە دوای چەندین قۆناغ کەوتە ئەم قاڵبە کۆتایی یەی:

- سەرەتا کاسێتەکان نوسرانەوە.
- پاشان نوسراوەکە بەراورد کرا لەگەڵ کاسێتەکە.
- دواتر لەلایەن کەسێکی دۆست و نزیکی مامۆستاوە کاری داڕشتن و شەن و کەوکردنی وشەو دەستەواژەکانی تێدا کرا.
- پاشان چەند جارێك خوێنرایەوە و بەراورد کرا لەگەڵ ئەسڵەکە.
- ناونیشان بۆ تەوەرەو بابەتەکان دانران .

لەگەڵ هەموو ئەو کارە ، هەوڵ دراوە کە بەهیچ جۆرێك دەسکاری ناوەڕۆك و، تەنانەت زۆربەی ڕستەکان نەکرێ، بەڵکو تەنها ڕستەی دوبارە و، زۆرجار وشەی (مترادفات) و هەندێ وشەی زیاد لابرێ .

بۆیە لەوە زیاتر دەستکاریی نەکراوە تا تایبەتمەندی خۆی لەدەست نەدات .

## لەکۆتاییدا

داوا لە هەموو خوێنەرێکی بەڕێز دەکەین کە ئەم نوسراوە بسپێرێ بە کەسانی تر، بانگەشەی خوێندنەوەی یا گوێگرتن لە ئەسڵی شریتەکان بکات ، چونکە بابەتێکی پەروەردەیی و فکریی گرنگە و، بە دڵنیایی کاریگەری خۆی لەسەر هەموو خوێنەر و بیسەرێك هەیەو ، بۆ دارِشتنەوەی کەسیەتی (فکری) و(سلوکی) هەر بڕوادارێك پێویستە.

بە هیوای بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی تری مامۆستای شەهید .

دەزگای بەرهەم

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی سوبحانی

dazgayberham@yahoo.com

## سەبارەت بەم بەرهەمە

ئەم بەرهەمەی لەبەر دەستی خوێنەری بەرێزدایە لە ئەسڵدا بابەتێکی فکری و پەروەردەیی‌یە کە مامۆستا ناصر لە سێزدە کاسێتدا تۆماری‌کردوون و بە (شریتەکانی بەندایەتی ) ناسراون.

راستی‌یەك هەیە زۆر پێویستە لێرەدا ئاماژەی پێ بکرێ،کە ئەم بەرهەمە پاش هەوڵ و ماندووبونێکی زۆر لەلایەن چەند براو دۆستێکی مامۆستای شەهیدەوە دوای چەندین قۆناغ کەوتە ئەم قاڵبە کۆتایی‌یەی:

- سەرەتا کاسێتەکان نوسرانەوە.
- پاشان نوسراوەکە بەراورد کرا لەگەڵ کاسێتەکە.
- دواتر لەلایەن کەسێکی دۆست و نزیکی مامۆستاوە کاری دارشتن و شەن و کەوکردنی وشەو دەستەواژەکانی تێدا کرا.
- پاشان چەند جارێك خوێنرایەوە و بەراورد کرا لەگەڵ ئەسڵەکە.
- ناونیشان بۆ تەوەرەو بابەتەکان دانران .

لەگەڵ هەموو ئەو کارە ، هەوڵ دراوە کە بەهیچ جۆرێك دەسکاری ناوەرۆك و، تەنانەت زۆربەی رستەکان نەکرێ، بەڵکو تەنها رستەی دوبارە و، زۆرجار وشەی (مرادفات) و هەندێ وشەی زیاد لابرێ .

بۆیە لەوە زیاتر دەستکاریی نەکراوە تا تایبەتمەندی خۆی لەدەست نەدات .

## لەکۆتاییدا

داوا لە هەموو خوێنەرێکی بەڕێز دەکەین کە ئەم نوسراوە بسپێرێ بە کەسانی ترو، بانگەشەی خوێندنەوەی یا گوێگرتن لە ئەسڵی شریتەکان بکات ، چونکە بابەتێکی پەروەردەیی و فکریی گرنگە و، بە دڵنیایی کاریگەری خۆی لەسەر هەموو خوێنەر و بیسەرێك هەیەو ، بۆ دارشتنەوەی کەسێتی (فکری) و(سلوکی) هەر بڕیاداریك پێویستە.

بە هیوای بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی تری مامۆستای شەهید .

دەزگای بەرهەم

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی سوبحانی

dazgayberham@yahoo.com

# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين ، وصلوات الله وبركاته على عبده ورسوله محمد وعلى آله أجمعين. رَبِ أدْخِلْنِي مُدخَلَ صِدقٍ وأخْرِجْنِي مُخْرَج صدقٍ واجْعَلْ لِي مِنْ لدُنْكَ سُلْطاناً نَصيراً.

هەموومان دەزانین خوای (متعال) بۆ بەندەیی و عیبادەت خەلقی کردووین . بەندەییش بەوە ئەکرێ ئینسان پەیڕەوی بەرنامەیەك بێت کە خوای (متعال) بۆی داناوە، ئەو بەرنامەیەی لە کتێبەکەیدا ناردوویەتی . دیارە کتێبەکەی خوا ـ یانی قورئان ـ بە زمانی عەرەبییەو هەموو کەس ناتوانێ عەرەبی فێربێ ، تاخۆی بتوانێ لەو کتێبە حالی بێ و سوودی لێ وەرگرێ .. لەبەرئەوە واجبە لەسەر ئەوانەی توانایان هەیە فێری زمانی عەرەبی بن ، دوای ئەوە وایان لێ هات کە لە بەرنامەی کتێبەکە حالی بوون، وەری گێڕن و بیگەیەنن بەخەلکی تر ، بەو کەسانەی ناتوانن خۆیان بۆ خۆیان لە قورئان ئیستفادە بکەن .

جا بەم بۆنەوە خۆمان بەمەسئول دەزانین ـ لە حەدێکا کە توانامان هەیە ـ ئەوەی پێویستە بۆ هەر ئینسانێ بیەوێ ڕێگەی بەندەیی خوا بگرێ ، ڕوونی بکەینەوە ، بۆ ئەو کەسانەی بڕوایان هەیە کە ئەم قسانە لەڕووی دڵسۆزییەوە ئەکەین، ڕێگای خۆش بەختییان بۆ ڕۆشن ئەکەینەوە . ئەوەی لازمە لەڕێگەی بەندەییا بیزانن ، تا بتوانن بەوجۆرە

کە پێویستەو لای خوا قبوڵە، ڕێگەی بەندەیی بگرن . تا بەئیزنی خوا ئێمەش وئەوانیش بەهرەمەندو خۆشبەختی دنیاو ئاخیرەت بین .

هەوڵیش ئەدەین – بەئیزنی خوا- ئەم باسانە بە زمانێکی سادەبن، بۆ ئەوەی کە نەخوێندەواران لێی حاڵی بن . بۆ زۆرێکیش لە خوێندەواران هەر لازمە ئاگایان لێ بێ،کەسانێك کە بۆیان نەکراوە ڕێیان بکەوێت لە ئاوەها شتانێك .

هەر لەئێستاشەوە داوا ئەکەین لە هەرموسڵمانێك بڕوای بە دڵسۆزی ئێمە هەیە، بڕوای بەوە هەیە کە قەسدمان خۆشبەختیوسەربەرزی ئەو کەسانەیە کە ئەم قسانەیان بۆ ئەکەین ، ئەوانیش بەپێی توانای خۆیان هەوڵ بدەن بۆ ئەوەی بە خەڵکی ڕاگەیەنن . ئەگەر هەر موسڵمانێك توانای بێ بەلای کەمەوە (١٠) نەفەر تێ بگەیەنێت لەم باسانەی لێرە ئەکرێن، کارێکی زۆر گەورە ئەکرێت و خزمەتێك ئەکرێ بەخەڵك کە جەزای گەورەی ئەبێ .

# بەشی یەکەم

## چۆنیەتی بەندایەتی بۆ خواو ماناى ڕاستەقینەی ئیسلام

- بەندەیی ، یا بەندایەتی بۆ خوا یانی چی؟
- واتای ئیسلام
- واتای تەواوی بەندایەتی
- هۆی گومڕایی ئینسان
- خۆشبەختی و بەدبەختی ڕاستە قینە
- ژیانی بەرزەخ
- واتای( پەروەردەکردن) و چۆنیەتیەکەی
- واتای ڕەحمەت و پەروەرشیاریی خوا

## بەندەیی ، یا بەندایەتی بۆ خوا یانی چی ؟

بەندەیی بۆ خوا ئەوەیە لەژیانتا بە جۆرێك بیت خوای (متعال) لێت داوا ئەکات . ئەو ئەفەرموێت : ئەبێ بڕوات بەچی بێ ؟ بڕوات بەوە بێ . ئەبێ بزانی کەچی هەیە؟ چی نیە؟ ئەوەبزانی . ئەبێ چی بکەی ؟ ئاوا بکەی . ئەبێ چی نەکەی؟ ئاوانەکەی...

ئەگەر ئینسان لەژیانیا ئاوابووکە خوا ئەفەرموێ، ئەوەی ئەو لێی داوا دەکات لەژیانا، ئەوەی کرد، ئەوە بەندەیی خوای کردووە . ئەگەر خیلافی ئەوەی کرد، یالە هەموو ژیانیا ئاوا نەبوو کە خوا لێی داوا دەکات، یالە بەعزێکیا وا بوو، لە بەعزێکیا وا نەبوو، ئەوە ئەوە نیە کە خوا لێی داوا دەکاتو بەندەیی خوای نەکردووە ولێی قبوڵ ناکرێ . ئەگەرکەسێك پێش ئەوە هەل وفرسەتی لە دەست دەرچێ لەمە ئاگادار بوو، ئەبێ چارەی خۆی بکاو بگەڕێتەوەو تۆبە بکا ، بڕیار بدا لەسەر ئەوەی لەهەموو ژیانیدا گوێ بەفەرمانی خوا بێ ، بزانێ چی لێ داوا دەکا بەو جۆرە بێتو ئاوا بکا .

بەندەیی خوا وایە ئینسان پێش هەموو شت ئەوە بزانێ کە لە ژیانیا هەمیشە نیازمەندە بەخوایەك کە خاوەنیەتی . بۆ هەر هەنگاوێ لەژیانیدا هەڵی دەگرێ، نیازی بەو هەیەو دەبێ شتانێك لەلایەن خواوە بۆی ئامادە بکرێنو لە بەردەستیا قەرار بدرێن .. هەروەها لەهەر

هەنگاوێکدا هەڵی دەگرێ ، کۆسپوگرفتێکی زۆر سەر ڕێگەی گرتووە، ئەگەر خوا لەسەر ڕێی لایان نەبا ناتوانێ هەنگاوێ بنێ.

کەوا بوو هەم لە ئامادەکردنی ئەو شتانەی پێویستێ بۆی، نیازی هەیە بەخوا، هەم لەلابردنی ئەو کۆسپو مانعانەی لەسەر ڕێگەیدان نیازی هەیە بەو.. جا کاتێ خۆی ئاوەها دەناسێ، دەزانێ ئاوەها مەخلوقێکە هەمیشە نیازی هەیە خوا شتانێکی بۆ ئامادە بکاو کۆسپ لەسەر ڕێی لابا، ئیتر خوای خۆیشی بەو جۆرە دەناسێ .. ئەمە لەبارەی خواوە یەکەم شتێکە دەبێ بیزانێ . وەختێ ئەمانەی زانی نەتیجە ئەوە دەبێ هەموو گیانی پڕبێ لە ئومێدو مەیلو ڕەغبەت بۆلای خوای (متعال)و هەر ئومێدی بەو بێت .. *

دوای ئەوە دەبێ ئینسان بیری ئەوەش بکاتەوە کە خوا هیچ شتێك بەبێ حیکمەت ئەنجام نادات، کارێکی بێ هوودە ناکات، هەرشتێك دەیکات لەبەر حیکمەتێکەو فائیدەیەکی تیایە، بە تایبەت لەگەڵ ئینسانا ، هەرکارێك بۆ ئینسانی دەکا، هەرشتێك لە ئینسان داوای دەکا کە بیکا، یاهەر شێ بۆی ئەنجام دەدا، حەتمەن یا بۆ ئەوەیە سوودێك بەئینسان بگەیەنێت، یا زیانو زەرەرێکی لێ دوورخاتەوە .

دەی لەبەرئەوەی خوا کاری بێ هوودە و نابەجێ ناکا، هەرشێ بکا بەجێیەو حیکمەتی تیایە، ناکرێ ئەو هەموو شتانەی ئینسان نیازی پێی هەیە بۆی ئامادە بکا و ئەو هەموو کۆسپە لەسەر ڕێگەی لابات، بێ

ئەوەی هیچ حیکمەتێك لەمەدا بێت ، بێ ئەوەی قەرار بێ ئینسان وەزیفەیەك ئەدا بکا، مەسئولیەتێك بگرێتە ئەستۆی خۆی . شتی وا نابێت ، حەقەن شتێکیشی لێ داوا ئەکا . لێی داوا دەکا رێیەك بگرێتە بەر کە خۆی بۆی دیاری دەکا، بۆ ئەوەی بگا بەسەرئەنجامێك کە ئەویش هەرخۆی بۆی دیاری کردووە .

ئەگەر بیەوێ لەو شتانە کەڵك وەرگرێ، بەڵام وا ئەبێ خوا دەیەوێ ، وابزانێ لە دەستی دەردەچێتەو، خوا لەدوایدا موحاکەمەی ناکاو لێی ناپرسێتەوە کە چیت کردو چیت نەکرد؟ ئەمە وا نیە . خوا هەر وەك ئەو شتانەی بۆ رێك خستووە و ئەو موشکیلاتو کۆسپانەی لەسەر رێ لابردووە، هەروایش دەسەڵاتی تەواوی بەسەریەوە هەیە ، ئینسان لەدەستی دەرناچێ وحەقەن لەدوا رۆژا لێی دەپرسێ کە من ئەو هەموو نیعمەتەم لە ئیختیاری تۆدا قەراردا، ئەو هەموو گرفت وکۆسپانەم لەسەر رێت لابرد، بۆ شتێك بوو، وەرە بزانم ئەوەی من لێم داواکردی ئەنجامت دا؟ کردت یان نا؟؟

دەی کاتێ ئینسان بیری لا ئەمە دەکاتەوە کە خوا بێ هوودە هیچ شتێك ناکات، کەوا بوو حەقەن لێی دەپرسێتەوەو موحاکەمەی دەکات لەسەر ئەوەی بۆی کردووە .

لێرەدا شتێکی تریش ئەزانێ، ئەویش ئەوەیە خوای گەورە مالـك‌و ساحێبی رۆژێکە کە تیایدا لـە ئینسان ئەپرسێ، موحاکەمەی دەکا،

ئەیکێشیتە دادگا، لێی داوا دەکات کە جوابی ئەوە بداتەوە چی کردووەو چی نەکردووە لەژیانیا؟ ئەوهەموو نیعمەتوئیمکاناتەی بۆئامادە کردووە . ئەو هەموو کۆسپوماناعانەی لەسەر رێی لابردووە .. ئەبێ جواب بداتەوە کە ئەمانەی بۆ کراوە، کەلکی دروستی لێ وەرگرتوون یان نا ؟ دیارە بەپێی ئەوەی وا کردوویەتی جەزاو پاداشتی ئەدرێتەوەو ئەیگەیەنێ بەسەرەنجامو عاقیبەتێ کە حەتمەن تووشی ئەبێت و لێی رزگاری نابێ .

ئەگەر ئاوا ژیانی بەسەر بردبێت کە خوا لێی داوا کردووە، پاداشتێکی ئەدرێتەوە گونجاو بێت لەگەڵ ئەو ژیانەی بەسەری بردوە .. ئەگەر بەجۆرێکی تر ژیانی بەسەر بردبێ، نە بەو جۆرەیخوا لێی داوا کردووە، ئەویش سزایەکی وای پێ ئەدرێتەوە گونجاو بێت لەگەڵ ئەو ژیانەی کە بردوویەتە سەر.

جا، کاتێ ئینسان زانی کە سەرەنجامو دوارۆژی لەدەست خوادایەو لەدەستی دەرناچێ، ئیتر هەموو گیانی ، هەموو وجوودی، ئەبێ پڕبێ لە ترسو ئیحساسی مەسئولیەت .. یانی ئەوەی بۆ دروست ببێ کە لەبەردەم خوادا لێپرسراویی هەیە، حەتمەن ئەبێ جوابی ئەوە بداتەوە کە چۆن ژیانی بەسەر بردووە، چۆن ئیستفادەی کردووە لەو ئیمکاناتەو نیعمەتانە، چی کردووە وچی نەکردووە؟ وەختێك ئەزانێ رۆژێك دێتە پێشەوە ئەکەوێتە بەر ئەو موحاکەمەو لێپرسینەوانە ، زۆر ڕۆشنە ئینسان

ئەگەر کەمێك بۆ خۆی دڵی بسوتێ ، بەتەواوی لە غەفڵەتا نەبێت، کەمێك هۆشی بەخۆیەوە بێ، ترس‌ولەرز هەموو گیانی داگیر دەکا، بەجۆرێك ئیتر حازر نابێت کاری بکا لەوڕۆژەداو لەو مەحکەمەیەدا بەسەرشۆڕیو ڕووڕەشی دەربێتو، تووشی بەدبەختیو عەزابی ئەبەدی بێ . بۆیە کاری ئەکاو هەوڵ ئەدا بۆئەوەی بەڕووی سوورو بەسەربەرزی لە موحاکەمەو لێپرسینەوەکە دەربێت و، خۆشبەختی ئەبەدیی دەست کەوێت ..

کاتێ ئینسان خوای گەورەی ئاوا ناسی، هەموو گیانی پڕبوو لە (ئومێد)و (ترس)، ئالێرەدا ئینسان هیچ ڕێیەك لەبەر پێی خۆیا نابینێ ، مەگەر ئەوەی لەگەڵ خوای خۆی پەیمانی بەندەیی ببەستێ، بڕیاربداو بڵێ : خوایە، من نیازم بە هەرچی هەیە، بۆت ئامادەکردووم، هەر کۆسپ‌وگرفتێك کە بێتە سەر ڕێم، دەتوانی لای ببەیو کارێکت کردووە لابچێ ، وا ڕێکت خستووە لەسەر ڕێم لاچێ، ئەیشزانم لەدوایدا لێپرسینەوە هەیە، دادگاو مەحکەمەیەك هەیەو لەدەست دەرناچم ، دەی ئەوا من بەڵێنو پەیمان ئەدەم بەتۆ کە تۆ چۆن ئەفەرمووی ئاوابم . دیارە خوای گەورەش هەر فەرمانێکی پێ ئەدا بۆ ئەوە پێی ئەدا لەو ئیمکاناتو نیعمەتانە چاك ودروست کەڵك وەرگرێت ، بەو جۆرە خوا لێی داوا ئەکا ئاوا کەڵکیان لێ وەرگری، دیارە سوودەکەشی هەر بۆ خۆی ئەگەڕێتەوە، ئەگەر نا، خۆ خوا

ئەسودێکی دەست ئەکەوێ بەوەی ئینسان بەندەیی بکا، ئەتووشی زیان‌و زەرەرێك ئەبێت بەوەی ئینسان لەرێی بەندەیی لابدا.. خوا فەرمانی پێ ئەدا ئاوا کەلَك وەرگرە لەو نیعمەت‌و ئیمکاناتە. ئاوا مەکە. ئاوابکە .وا بەوئاوامەبە .

بەندەیی‌و عیبادەت ئەمەیە ئینسان پەیمان ببەستی لەگەل خاوەنەکەی خۆی : هەرچی تۆ ئەفەرمووی من ئاوا دەکەم. ئەفەرمووی عەقیدەو بڕوات ئاوا بێ ،وا ئەبم، بزانە ئەوە هەیە، ئەزانم. بزانە ئەوە نیە، ئەزانم کە نیە . ئەفەرموی: ئەوە بکە، ئەیکەم . ئەفەرموی: ئەوە مەکە، ئەوە ناکەم . ئاوەها عەهد و پەیمانی بەندەیی‌ئەبەستی ..

جالێرەدا موسلَمان ئەوەیش ئەزانێ کە بەندەیی و عیبادەت کردن بۆ خوا، هەروەك هەرئیش‌و کارێکی تر، هەر تەنها بەکۆمەکی خوا رێك ئەکەوێ، ئینسان ناتوانێ یەك هەنگاویش هەلَگرێ بەبێ ئەوەی خوا کۆمەکی بکا .

دەی لەبەرئەوەی ئەمە ئەزانێ ، ئەزانێ ئەگەر خوا کۆمەکی نەکا یەك هەنگاویش ناتوانێ هەلَگرێ، هەر لەوکاتەدا پەیمانی بەندەیی ئەدا بەخوا، لێشی داوا ئەکا کۆمەکی بکا، بۆ ئەوەی بتوانێ لەرێگەی بەندایەتیدا هەنگاو هەلَگرێ .کە عەرزی خاوەنەکەی خۆی ئەکا خوایە من ئەوە لەمەولا حازرم تۆچی ئەفەرمووی ئاوابکەم؟! بەلاَم ئەشزانم کە ناتوانم یەك هەنگاویش هەلَگرم بەبێ کۆمەکی خۆت، جا ئەمەوێ

خۆت کۆمەکم بکەیت و هەرچییەك کە پێویستە بۆ ئەوەی بەندەیی بکەم، بۆم ئامادەبکە . هەر کۆسپ‌و مانعێکیش دێتە سەرە ڕێم و ناهێڵێ بەندەیی بکەم، لەسەر ڕێم لای ببە . ئەوا من ئەوەی لە دەستمایە ئەوەیە پەیمان بدەم و عەزم بکەم لەسەرئەوە ، جا دوای ئەوە ئیتر هیچ نازانم و بەدەستی تۆیە، ئەگەر کۆمەکم بکەیت ئەتوانم، ئەگەر کۆمەکم نەکەیت ناتوانم. جاداوات لێ ئەکەم کۆمەکم بکەیت ... ئا ئەمە ئەبێتە کورتەیەك لەوەی ئینسان لەژیانیا لەو ڕۆژەوە بالغ ئەبێ، بەعەقڵەوە لەگەڵیایەتی تا ڕۆژێ لە دنیا ئەڕوا . پوختەوکورتەی ژیانی ئینسان – ئینسانێ ئەیەوێ بەندەی خوابێ – ئائەمەیە کە وتمان . خوای وا بناسێ کە وتمان، دەروونی پڕبێ لە ئومێدو ترس . دوای ئەوە (پەیمانی بەندەیی) لەگەڵ خوای خۆی ببەستێ ، بیکاتە پشت‌و پەنای خۆی، (داوای کۆمەك)ی لێ بکا، بۆ ئەوەی بتوانێ ئەو ڕێی بەندەیی یە بگرێتە بەرو پیایا بچێ .

جا ئەگەر ئینسان ئاوای لێ هات ئیتر ئەو ئافەت‌و دەردانەی ڕووئەکەنە ئینسان، ئەو خەتەرو بەلایانەی کە گرفتاریان ئەبێت و پێیان لەبەین ئەچێت، هەموو تیا ئەچن‌و لێی دوور ئەکەونەوەو، سەلامەتی بۆ پەیدا ئەبێت . هەر لەبەرئەوەیشە بەو بەرنامەیەی ئینسان بۆ بەندەیی کردنی خوا قبووڵی ئەکات‌و، ئەو ڕێگەیەی کە ئەیگرێتە بەر بۆ لای خوای گەورە، ئەوترێت (ئیسلام).

## واتای ڕاستەقینەی ئیسلام

ئیسلام یانی ئەوەی ئینسان خۆی لەو نافەت و بەلایانە ـ کە ئەگەر بێنە سەر ڕێی لەبەینی ئەبەن ـ سالم کات و ڕزگار کـات . نافەتـەکانیش بەم جۆرەن :

ئینسـان ئەگەر وای زانی کەسێکی تریش – هەروەك خوا – ئەتوانێت شتێك لەوانەی ئینسان نیازی پێەتی نامادەی بکات بۆی و، سـودێکی پێ بگەیەنێت ، یا ئەتوانێ کۆسـپێك لەسـەر ڕێیـدا لابـات و زیـان و زەرەرێکی لێ دوور خاتەوە، ئەگەر وای زانی ، ئەوە تووشـی نافـەتێك بووە نابوودی ئەکات . ئەگەر وای زانی غەیری خوا کەسـێکی تـریش دەسەڵاتی بەسەریەوە هەیە و، ئەتوانێ تەئسیر بکـا، ئـەتوانێ سـەرەنجام عاقیبەتی بەجۆرێك بگرێتە ژێر دەستی خۆی وبیگۆڕێ بەلایەکا، ئەگەر وای زانی و ترسی ئەوکەسە کەوتە دڵی، ئەوە تووشـی نافـەتێك بـووە کە لەبەینی دەبا.

بەشوێن ئەم نافەتانەدا نافەتی تریش دێن، چونکە کاتێك ئینسـان وای زانی کەسێکی تـر غـەیری خـوا ئـەتوانێ سـودێکی پـێ بگەیـەنێ، یـا زەرەرێکی لێ دوور خاتەوە، پاشان ئومێدی پێ پەیدا کرد، یا وایزانـی دەتوانێ لە عاقیبەت و سەرەنجامی ئینسـانا دەخالـەت بکـا، نافـەتێکی تریش ـ هەروەك ئەمانە گەورە ـ ڕووی تێ ئـەکا، ئـەویش ئەوەیە کـە حازر ئەبێ (فەرمانی غەیری خـوا)ش لـە ژیانـدا قبـوڵ بکـا، هـەروەك

لەبەعزێك لەژیانیا، یا لە گۆشەیەك ، یالە چەند گۆشەیەك لەژیانیا، بەندەیی بۆخوا نەكا، هەروایش مەجبوور ئەبێت بۆ غەیری خوایش بەندەیی بكا و، لەهەندێ شتا فەرمانی غەیری خوایش وەرگرێ .

دەی ئەمەیش ئافەتێكی ترە كە ئینسانی پێ ئابوورد ئەبێت و بەدبەختی دونیاو ئاخیرەت ئەبێت، دیارە كاتێ وای زانی غەیری خوا كەسی تریش ئەتوانێ نەفعێكی پێ بگەیەنێ و، بەشێك لەوانەی نیازی پێیەتی بۆی ئامادەبكا، یا ئەتوانێ كۆسپ و مانعێك لەسەر رێی لابباو، زیان و زەرەرێكی لێ دووربخاتەوە، زۆر رۆشنە لەئاوا وەزعێكا، (داوای كۆمەك لەغەیری خوا) ئەكا وغەیری خوا ئەكات بەفەریادرەسی خۆی . ئەمەیش ئافەتێكی ترە هەر وەك ئافەتەكانی تر، ئینسانی پێ لەبەین ئەچێت و، بەدبەختی ئەكا .

ئەمانە هەندێ لەو ئافەتانەن كە لە ژیاندا روو ئەكەنە ئینسان . ئەڵبەتە ئافەتی زاهیری هەن روونەكەنە لاشەی ئینسان ـ ئەو جۆرە نەخۆشیانەی ئەیان ناسین ـ ئەوانە لەچاو ئەم ئافەتانەی كە وتمان هیچ نین و چارەسەركردنیان زۆر ئاسانە .

كەواتە ئیسلام ئەوەیە ئینسان خۆی سالم بكا، خۆی رزگار بكا لەو ئافەتانە . موسڵمانێتی ئابەمە ئەوترێ .كەسێك پێی ئەوترێ موسڵمان و (مُسْلِم) ئاوای كردبێ لەخۆی، یانی: ئەمەی زانیبێ هەر خوا ئەتوانێ سوود بگەیەنێ بەبەندەی خۆی و، ئەوەی پێویستیەتی بۆی ئامادەبكا ،

هەر خواش ئەتوانێ کۆسپ و گرفت لەسەر ڕێی لابیا ، هەروەکو دەسەڵاتی بەسەریەوە هەیەو ئەتوانێ بەهەر لایەکا بیەوێ بیبا . ئەوکاتە هەر ئومێدی بەو بێ، هەر ترسی لەو بێ، پەیمانی بەندەیی لەگەڵ ئەو ببەستێ ، قەولی پێ بدا ئەوەی ئەو داوای ئەکا لە ژیانیا ئەوە بکا . بۆ ئەوەش بتوانێ ئەمە بکا، داوای یارمەتی لێ بکا ، بۆ ئەوەی بتوانێ بەو ڕێگەیەدا بڕوا.

ئەگەر کەسێك ناوا بوو ئەوە پێی ئەوترێ (موسڵمان)، ئەو ڕێگەو ڕەوشتەش گرتوویەتە بەر پێی ئەوترێ (ئیسلام) و موسڵمانی . بەڵام ئەگەر یەکێك لەو نافەتانە کە باسمان کردن تووشی هات، ئەوە ئەگەر چی ناویشی موسڵمان بێت و بوترێ ئەمە ئەهلی ئیسلامەو موسڵمانە ، هیچ نیە . چونکە هیچ کەڵکێکی پێ ناگەیەنێ، نەلە دونیا ، نەلە ئاخیرەتدا .

## بەندایەتی بۆخوا مەسەلەیەکی چارەنوس سازە:

هەرکات ئینسان ڕووی کردە بەرنامەی خواو کتێبەکەی خواو ڕێگای بەندەیی خۆی ناسی، ئەوە شتێکی سادەو چکۆلە نیە تا هەروا بە ئاسانی بڵێ ئەتوانم خۆمی لێ لادەم و خەریکی نەبم ، قابیلە چی ئەبێ؟! وەك شتێکی دنیایی، لەو جۆرانەی ئینسان ئەتوانێ دەستبەرداریان بێ و چاویان لێ بپۆشێ ، یا ئەگەر زیان و زەرەرێکی پێ نەگا ئەڵێ ئەتوانم تەحەمولی بکەم و نایەوێ خۆم تووشی دەردەسەری

بکەم . ئەگەر شتێك ناوا بوایە، نەکرا کەسێك زۆرموبالاتی پێ نەکاو گوێی پێ نەداو ڕێگای بەندەیی نەگرێتە بەر. بەلآم (خۆشبەختی دنیاو ئاخیرەت) و (بەدبەختی دنیا و ئاخیرەت) لەسەر ڕێی ئینساندا بەم مەسەلەیەوە بەستراوە . ئەگەر ڕێگای بەندەیی نەگرێتە بەرو بەندەی خوا نەبێ، لەدنیا و ئاخیرەتا خۆشبەخت ئەبێ . ئەگەر ئەوە نەکات لەدنیاو ئاخیرەتا بەدبەخت ئەبێ.. دەی کاتێك ناوایە ئیتر وەك ئەو شتە دونیاییانە نیە ، ئینسان سادە بتوانێ ڕووبەڕوویان بێتەوە، بتوانێ لەسوودەکانی چاوپۆشی بکاو گەرەکی نەبێ، یا وابزانێ ئەتوانێ تەحەمولی زیانو زەرەرێك کە لەو ڕێگایەوە تووشی ئەبێت بیکا . ئەگەر وەك تیجارەتێك ، وەك صەنعەتێك ، وەك جوتیارییەك، وەك یەکێك لەو کارە دونیایییانە بوایە ، بەهەر حاڵ ئەکرا ئینسان ئەهەمیەتی پێ نەدا ، خەریکی شتێکی تریێت ، پەیڕەوی هەوەس و ئارەزووی خۆی بێت، هەرچی پێی خۆشە بیکاو بڵێ من ئێستا خۆش ڕائەبوێرم ، ئەوەی هەوەسم لێیە داوا ئەکا ئەوە ئەکەم ،ئەوەی وا لەدەستم دەرئەچێ با دەرچێ زۆر گرنگ نیە، یا ئەو ئەخۆشی و دەردەسەرییە کە دێتەسەر ڕێم، بابێت بۆم، زۆر قورس وگەورە نیەو ئەتوانم خۆمی لێ ڕزگار کەم، یاهەرچی بێت زۆر دەوامی نابێت هەر ڕزگار ئەبم لێی...

وەختێ مەسەلەکە پەیوەندی بە خۆشبەختی دنیا و ئاخیرەتەوە یا بەدبەختی دونیاو ئاخیرەتەوە هەیە، ئیتر ئینسانێك ئەگەر کەمێك دڵسۆزی خۆی بێ، تۆزێ هۆشی بەخۆیەوە بێ، هەرگیز ئیجازە بەخۆی نادات هەروا سادەبێ، بێ موبالات ڕووبەڕووی ئەم مەسەلەیە بێتەوە، وەك مەسەلەیەکی دونیایی وکارو ئیشێکی دونیایی لەگەڵی بەرخورد بکا.

کە وابوو ئینسان چارەیەکی نیە غەیری ئەوەی ڕووبکاتە (کتێبەکەی خوا)، بەرنامەی ژیانی خۆی لێ وەرگرێ ، بۆ ئەوەی لەژیانیا بەندە بێت . هەڵبەتە بەندەیش بەو مانایە نیە کە لە ناو خەڵکا مەشهورە، وا ئەزانن نوێژێك بکاو ڕۆژوویەك بگرێ وحەجێك بکا، شتانێك لەم جۆرە ئیشانە بکا ئیتر کافییەو، لەباقی ژیانیداو،کارەکانی تری ژیانیدا، هەرچۆنێ کە خۆی پێی خۆشە، یا فەرمانبەرداروپەیڕەوی هەر قانوونو بەرنامەیەکی تری غەیری بەرنامەی خوا بێ، ئیتر لێی وەرنەگیرێ .

## واتای تەواوی بەندایەتی

بەندایەتی ئەوەیە ئینسان لە هەموو ژیانیدا، چ لە ژیانی شەخسی خۆی، یا لەژیانی خێزانیدا، چ لەناو کۆمەڵدا، چ لە مەجالی سیاسەتدا، چ لەمەیدانی ئابوری وکەسبو کاردا، لە هەر شتێکا ، وا بجولێ خوا لێی داوا ئەکا .

وەختێك بەراستی بەندەی خوا ئەبێ ، کە لەهەموو ژیانیا فەرمانبەردارو گوێرایەڵی خوا بێ، ئەگەر نا، لە بەشێك لەژیانیا گوێرایەڵی فەرمانی خوا بوو، لەبەشێکی تردا بەمەیلی خۆی، یا بەپێی قانوونو بەرنامەی غەیری خوا جوولا، ئەوە لێی قبوول ناکرێت ، بەبەندەی خوا حیساب ناکرێ ..

ئینسان لەگەڵ خوادا ئەبێ پەیوەندی بەم جۆرە بێ : لەگەڵ خۆی هەندێ مەسئولیەت وئەرك هەن، لەگەڵ خانەوادەی، لەگەڵ خەڵك، لەگەڵ رژێمێك کە حکومەت ئەکا، لەگەڵ ئەو نیعمەتو ئیمکاناتەی خوا لەبەردەستیا قەراری داون .. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا ئینسان سەروکاری هەیە، بۆ هەرکام لەمانە هەندێك دەستورو فەرمانی لە لایەن خواوە بۆ هاتووە ، ئەبێ لە هەموویاندا پەیرەوەی خوا بێت، تەنها لەو کاتەدا ئەبێتە بەندەی خوا.. ئەگەر نا ، بەبەندەی خوا حسێب ناکرێ، خۆشبەختی دنیاو ئاخیرەتی دەست ناکەوێ . بە پێچەوانەوە تووشی بەدبەختی دونیاوئاخیرەت ئەبێ ..

لەبەرئەوە کاتێ بۆ نمونە خەریکی تیجارەت نەبێ ، تەنها هەدەفی ئەوە نیە سەروەت و مالی زۆر بێ ، هەمیشە لەبیری ئەوەدا نەبێ خوا چی پێ خۆشە ئاوا بکاو چی پێ ناخۆشە ئاوا نەکا .

دەی ئائەوە تیجارەتێکە لەعەینی ئەوەدا مالی پێ کەسب نەکرێ ، سوودی پێ دەست ئەخرێ، لە هەمان کاتدا بەندەیی خوای گەورەشە ، خوای گەورە وا لە ئینسان رازی ئەبێ و لێی خوش ئەبێ .

ئەوەش پێویستە بزانرێت عیبادەت کردن بۆ خوا بەو مانایە نیە ئینسان دەست لە ژیان و لە کەلك وەرگرتن لەم نیعمەت و ئیمکاناتە بکێشێ و، تەرکی ژیان بکاو، بڕوا لەگۆشەیەکا هەر خەریکی نوێژ کردن و ڕۆژووگرتن و ئەو جۆرە شتانە بێت، هەروەك لەپێشا وتمان، بەلکو بەندەیی ئەوەیە ئینسان لەو ئیمکانات و نیعمەتانەی خوا بۆی داناوە ئیستفادە بکا، بەڵام نەك بەو جورە هەوەس و ئارەزوی خۆی پێی ئەلێت، بەلکو بەو جۆرەی خوا بۆی دیاری کردووە، سود وەرگرێ لەو نیعمەت و ئیمکاناتە .. ئەوە ئەبێ بەبەندەیی وعیبادەت .. بۆنمونە : بازرگانێك ئەتوانێ تیجارەت بکاو بەندەی خوایش بێ .

هەروەك ئەتوانێ تیجارەت بکا و پێچەوانەی بەندەیی خواش بکا، بەندەیی بۆ هەوەس و ئارەزوی خۆی بکا ، بو شەیتانی بکا ، ئەگەر ئەو تاجرە لەتیجارەتەکەیا ، لە کڕین و فرۆشتن و مامەڵەکانیا ، هەمیشە لەبیری ئەوەدا بووخوا چی پێ خۆشە ئەوە بکا ، چی پێ ناخۆشە ئەوە

نەکات ، ئەگەر ئاوا بوو ئەوە بەندەی خوایە، لەهەمان کاتدا خەریکە تیجارەتیش ئەکاتو سوودیشی دەست ئەکەوێت و ماڵەکەشی زۆر ئەبێت .. بەو مەبەستەوە تیجارەت ئەکا کە وەزیفەیەکە و مەسئولەتێك جێ بەجێ ئەکا، کە هەر کەسێك لەژیانیا بەپێی توانایەك هەیەتی خەریکی ئیشو کارێکە.

ئەکرێ ئەو تاجیرەگوێی لەوە نەبێ کە چی دروستە؟ چی نادروستە؟ خوا چی پێ خۆشە، چی پێ ناخۆشە؟ ئەکرێ هۆشی بەلای ئەمانەوە نەبێ و گوێی لەمانە نەبێ و، هەر بیری بەلای ئەوەدا بێ لەچ ڕێگایەکەوە زۆرتری دەست ئەکەوێ، چی بکا سەروەتی زیاتری دەست ئەکەوێ؟ ئەگەر لەدزی کردندا، لەسوو و ڕیبا خواردندا ، لە خیانەت کردن لەماڵی ئەم و ئەودا ، لە هەزاران شتی تری وەك ئەمانەیشەوە دەستی کەوێت، ئەو ئامادەیە ئەوانە بکا بۆئەوەی سەروەت و ماڵەکەی زۆر بێت، چونکە ئامانجی ئەو تەنها ئەوەیە سەروەتو ماڵی زۆر بێت .

دەی خۆ ئەمیش هەروەك ئەو تیجارەت ئەکا، بەڵام چونکە هەدەفی تەنها سەروەتو ماڵەو، هەدەفی ئەوە نیە کە مەسئولیەتێ جێبەجێ بکا، ئەمەیان هەر هەنگاوێ لە تیجارەتەکەیا هەڵی ئەگرێت، ئەبێتە سەبەبی ئەوەی زیاتر خوا لێی بڕەنجێو، غەزەبی لێ بگرێ، هەر هەنگاوێ هەڵی ئەگرێ لە خوا دوورترو دوور تری ئەخاتەوەو، ئەبێتە

سەبەبی ئەوەی لەدنیاو ئاخیرەتا تووشی بەدبەختی ببیٚ .. دەی ئەوەتا هەردوو کیشیان خەریکی تیجارەتن، یەکیٚکیان بەتیجارەتەکە بەندەیی بۆ خوا ئەکا، یەکیٚکیان گوناه ئەکاو خیلافی ڕیٚگای بەندەیی ئەڕوات .
یەکەمیان کە بەندەیی ئەکا، کەسبی ماڵو سەروەتەکە نابیٚتە هەدەف بۆی، بە جۆریٚك ئەرکو مەسئولیەتیٚك ئەدا ئەکا، جا لەبەر ئەوە کە مەسئولیەت ئەدا ئەکا ئیتر هەمیشە لەبیری ئەوەدایە خوا چی پیٚ خۆشە لەتیجارەتەکەیدا ئەوە بکا ، چی پیٚ خۆش نیە نەیکا . دووەمیشیان هەدەفی تەنیاو تەنیا ماڵو سەروەتەکەیە، ئیتر بیری بەلای ئەوەوە نیە چی دروستەو چی نادروستە، خوا چی پیٚ خۆشەو چی پیٚ ناخۆشە . بۆیە تیجارەتەکەی ئەبیٚتە خیلافی بەندەییو ئەبیٚتە گوناهو نافەرمانی .

هەموو شتیٚکی تریش هەر وایە . لە کیشاوەرزی (کشت وکاڵ) دا، لەپیشەسازیدا، لەحەیوانداریدا، لەهەر شتیٚکا، ئەکریٚ ئینسان بەو ئیشو کارەی بەندەیی بکا بۆ خوا، ئەشکریٚ خیلافی بەندەییش بکا . دکتۆریٚك (پزیشکیٚك) خەریکە پزیشکی ئەکا، ئەگەر هەدەفی ئەوە بیٚت بە موعالەجەکردنی نەخۆشان، پولو پارەی زیاتری دەست بکەویٚت ، ئیتر چاوی لەمەنەبیٚ و بیری بەلای ئەوەوە نەبیٚت ، ئەمیٚ چی بکا خوا پیٚی خۆشە، لەچی دووری بکا کە خوا پیٚی ناخۆشە، ئەوە بە پزیشکیەکەی گوناه ئەکاو لەخوا دوورئەکەویٚتەوە، ئەو ئیشو کارەی ئەبیٚتە سەبەبی ئەوەی تووشی بەدبەختی دنیاو ئاخیرەت ببیٚت .

بـەلام ئەگـەر پزیشـكێك لـە ئـیش و كارەكـەیا هـەدەفی ئـەوە بـوو مەسئولیەت و وەزیفە جێبەجێ بكا، هەدەفی ئەوە بوو ئەویش وەك هەر ئینسـانێكی تـری بەنـدەی خـوا مەسـئولیەتێك ئـەدا بكـا، خزمـەتێك بەخەڵك بكا، لەبەر ئەوە ئیتر بیری بەلای بەرنامەی خـواوە بـوو، چـی خوا پێی خۆشە ئەوەی ئەكرد، چی پێ ناخۆشە لەوە دووری ئـەكرد، ئەوە ئەو پزیشكە بەو پزیشكیەی كە ئەیكا خەریكی بەندەیی كردنە .

هەروەك چۆن نوێژەكەی ئەكا خەریكـە بەنـدەیی وعیبـادەت ئـەكا، هەرواش وەختێك خەریكی موعالەجەی نەخۆشێكە، خەریكە بەنـدەیی خوا ئەكا . هەروەها هەر ئیش و كارێكی تر لە ژیانـدا، ئـەكرێ ئینسـان بەندەیی پێ بكا و، ئەشكرێ خیلافی بەندەیی پێ بكا .

بەم جۆرە ڕۆشن ئەبێتەوە بەندەیی شتێك نیـە تایبـەتی بـەعزێك لـە ئیش و كارەكـانی ژیـانی ئینسـان بـێ‌و، تـەنها گۆشـەیەك یـان چـەند گۆشەیەك لەژیانی ئینسان پڕكاتەوەو، ئیتر لایەنەكانی‌تر فەرامۆش بكا .

## هۆی گومڕایی ئینسان

**بۆ چی ئینسان لە ڕێی بەندەیی لادەدات؟**

لێرەدا جێی ئەوەیە ئینسان لە خۆی بپرسێ یالە کەسێکیتر: کاتێ سەرەنجامی بەندەیی کردنو بەندەیی نەکردن ئاوایە ( یا بەدبەختی دونیاو ئاخیرەت، یا خۆشبەختی هەردووکیان)، ئیتر بۆچی ئینسان ئەبێ بێ موبالاتی بکاو گوێ بەمە نەداو، ئاوەها خۆی تووشی بەدبەختی دونیاو ئاخیرەت بکاو، لەخۆشبەختی دونیا خۆی مەحروم بکات؟!

چی ئەبێتە هۆی ئەوەی ئینسان وا بکا؟ بەڕاستی جێی سەرسوڕمانە کاتێ ئینسان ئەمە ئەزانێ ، لەگەڵ ئەوەیشا ئەو ڕێیە ناگرێتە بەر، بەپێی هەوەس و ئارەزوی خۆی و بەپێی ئەوە ئەڕۆی کە شەیتان پێی ئەڵێ، بەو ڕێگایەدا ئەڕوا شەیتان بۆی دیار ئەکات .. وەڵامی ئەم پرسیارە بەکورتی ئەمەیە :

خۆشویستنی ژیانی دونیاو هەڵبژاردنی ژیانی دونیا، ئەبێتە هۆی هەرچی گومڕاییو لە ڕێگەی خوا لادانو هەرچی بەدبەختییە .

ئەگەر ئینسان ژیانی دونیای کرد بەمەبەست بۆ خۆی، هەوڵی هەر بۆ ئەوە بوو ژیانی دونیای دەست کەوێ، ئەوە ئیتر حەتمەن تەنها بەرەوعەزابو بەدبەختی ئەبەدیی ئەڕوا. تەنها لە کاتێکا ئینسان تووشی بەدبەختی دونیاو ئاخیرەت نابێ، کە ژیانی دونیای ئەبێتە هەدەفو

نەبێتە مەبەستی، لە جیاتی ئەوەی هەوڵی بۆ دەست خستنی ژیانی دونیای بێت، تێکۆشێ بۆ ئەوەی خوایی خۆشە .

جا ئەمەی کەئەیلێین ، مانای ئەوە نیە ئینسان ئەگەر بیەوێ بەدبەخت نەبێ وخۆش بەخت بێ ،نەبێ ژیانی دونیا تەرك کاو لەو ئیمکانات و نیعمەتانەی خوا خەلقی کردوون ئیستفادە نەکا، نەخێر. لەبەرابەری ژیانی دونیاوە تەرکی ژیان نیە، ئەوە کاتێکە ئەو نیعمەت و ئیمکاناتەی خوا لە ئیختیاری ئینسانا قەراری داون، خۆیان ببن بەهەدەف بۆ ئینسان . خۆ ئەگەر نیعمەت و ئیمکاناتێ خوا لە ئیختیاری ئینسانا قەراری داون نەبوون بەهەدەف ، بەڵکو هەروەك خوا خۆی بڕیاری داوە ئینسان بۆ ئەوە ئیستفادەی لێ کردن کە بەندایەتی خوا بکا، وا ئیستفادەی کرد کە خوا فەرمانی داوە، ئەوە لەهەمان کاتدا کە ئیستفادە نەکا، ناشوترێ ئەو کەسە ژیانی دونیای بۆ خۆی هەڵبژاردووە .

جا بۆئەوەی ئەمە باش ڕۆشن بێتەوە یەك دوو وێنەیەك، یەك دوومیسالێك باس ئەکەین :

فەرز ئەکەین فەرمانڕەوای وڵاتێك دەستورئەدات بەڕەعیەتەکەی لەغەیری ئەو پایتەختەدا کە خۆی تیایەتی، واتە لەشارەکانی ترەوە ، هەموو لە یەك ڕۆژا بکەونە ڕێو بڕۆن بۆ لای ئەو. کاتێ خەڵکەکە هەموو کۆئەبنەوەو ئەگەنە لای ، ئەویش بێت لەگەڵیان دیدارێك

بکاتو بیبینن‌و کەلکێ وەرگرن لەبینینەکەی‌و شانازیەکیان دەست کەوێ .. جا خەلکەکە هەموو ئەکەونە رێ، ئەرۆن بۆ لای فەرمانڕەواکەیان، بەرەو پایتەختەکەیان . هەرکەس خواردەمەنی‌یەك لەحەدێکا کە دەستی ئەکەوێ لەگەڵ خۆی ئەبا . لەو سەرە رێیەیشدا کە لێیەوە ئەرۆن لەهەر چەند کیلۆمەترێکا جێگایەك هەیە بۆ ئەوەی موسافیرەکان دابەزن، ئیسراحەتێ بکەن‌و نان‌و ئاوێ بخۆن‌و دووبارە هێزیان تێ‌دەکەوێتەوە بۆ ئەوەی بتوانن پاشماوەی رێگاکە ببڕن، وەختێك لەشوێنێ لەو شوێنانە دائەبەزن‌و دەست ئەکەن بەپشوودان، تەماشا ئەکەن لەملاو لەولای رێگاکەوە باخ‌و بێستان‌و شتی‌تر هەن، زۆرێکیان ئەچنە ناو باخ‌و بێستانەکەو دەست ئەکەن بەخواردنی ئەو شتانەی کە هەن . وەختێك لەزەتی ئەو شتانەی کە ئەیخۆن ئەچەژن ، زیاتر حەز ئەکەن بمێننەوە، زیاتر لەو باخانەدا ئەرۆن‌و دوور ئەکەونەوە لەو رێگایەی قەرارە پیایدا برۆن ، ئەڕۆنە ناو باخەکەو سەیری ئەم درەخت‌و ئەو درەخت دەکەن، بەجۆرێك زۆرێکیان لەبیریان ئەچێتەوە بۆچی هاتوون؟ لەبیریان ئەچێتەوە ئەمانە هاتوون برۆن بۆ ئەو پایتەختە ی فەرمانڕەواکەیانی تێدایە، لێرەدا کە دابەزیون بۆ ئەوە بووە ئیسراحەتێ بکەن‌و خواردنێك بخۆن و هەڵسن بکەونەوە رێ .. کەچی ئەرۆن خەریکی خواردن‌و لەزەت بردن ئەبن ، بەجۆرێك لەبیریان

نەچێتەوە کە ڕەفیقەکانیان دوای ئەوە ئیسراحەتی خۆیان کرد، نەکەونەوە ڕێو ڕێگەکەیان درێژە پێ نەدەن و ئەمان بەجێ دەمێنن .

دوای ئەوەی کە زۆرێک ئەخۆنو زۆرێک ئەملاوئەولا ئەکەن، ماندوو ئەبنو لەوێدا ئەکەون، خەویان لێ دەکەوێ، سەرەنجام لە کاروانەکە جێ ئەمێنن، لەحاڵێکا ئەوانەی وا هۆشیار بوونو هۆشیان بەخۆیانەوە بووەو زانیویانەکە بۆچی هاتوون، دوایی هەڵساون و کەوتونەتەوە ڕێ، ڕۆیشتونو، زۆریش دوورکەوتونەتەوەو ئەمانیان جێ هێشتووە لەناو ئەو باخەدا .. بەڵام ئەوانەی کەوا ئەخەڵەتان و غافڵ نەبوون، لەگەڵ ئەوەی کە چوونە ناو باخەکە، بەڵام هۆشیان بەخۆیانەوە بوو، ئەیانزانی بۆچی هاتوون . ئەیانزانی کە نەهاتوون بۆ ئەوەی لەناوئەو باخەدا بمێننەوە . بەڵکو هاتوون بۆ ئەوەی بڕۆنو بگەنە پایتەختی حاکمو فەرمان ڕەواکەیان، ئەو ببینن، دابەزینیان لەو مەنزڵەداو چوونە ناو باخەکە، تەنها بۆ ئەوە بوو کە پشوویەک بدەنو پاشان بکەونە ڕێ . لەبەرئەوەی ئەمانەیان زانیویانە هەدەف چیە، کاتێ ئیستفادەشیان کردووە لەپشوودانەکە هەدەفەکەشیان بیر نەچۆتەوە ، بەڵکو وا کەڵکو سوودیان لێ وەرگرتووە کەکۆمەکیان بکات بۆ ئەوەی بتوانن بگەن بەهەدەفیان

ئەم دوو دەستە موسافیرە لەیەک شتا وەک یەک وان ، هەردوولا لە بەرهەمی باخەکەیان خواردووە، بەڵام یەکەمیان هەر خواردنیان لەبیرە،

دروەمیان هەدەفەکەشیان لـەبیر نەچـۆتەوە . عـەیب لـەوەدا نـەبووە خواردنی باخەکە بخۆن، لـەوەدا بـووە ئـەوە بووبـێ بەهـەدەف‌و، ئـەو پایتەختەو ئەو فەرمان ڕەوایەی قـەراربووە بـڕۆن بـۆ ئـەوێ‌و ببیـنن، ئەوەیان لەبیر بچێتەوە

بەندەیی کردن‌و بەندەیی نەکردنیش بۆ خوا(بێ تەشبیە) ئاوایە .

کەوا بوو موسڵمانێتی و بەندەیی بەو مانایە نیە ئینسـان بـێ بـەش‌و مـەحروم بـێ لـە خۆشـی .. موسـڵمان‌و ناموسـڵمان بەوەنیـە کـە ناموسڵمان لەم نیعمەت‌و ئیمکاناتە ئیستفادە بکا، موسڵمان نـەیکا . نەخێر، هەردوو سوود وەرئەگرن، بەڵام موسڵمان ئەیەوێ بەندەی خوا بێ پێش لەوەی کە ئیستفادە بکا، بـەڵام ناموسـڵمان، یـا ئەوکەسـەی بەندەی هەوەس‌و ئارەزووی خۆیەتی‌و بەندەی شەیتانە، گوێی لەمە نیە خوا ئەفەرموێ چی بکەو چی مەکە؟ چۆن ئیستفادە بکـە لـەئیمکانات ونیعمەتەکان‌و چۆن مەیکە؟ پێی خۆشـە ئیستفادەیان لێ بکا ، ئەیکات‌و تەواو.

ئەمەیـە فـەرقی بـەینی بەنـدەیی‌و موسـڵمانی لەلایەکـەوە، ناموسڵمانیش لەلایەکی ترەوە

## خۆشبەختیو بەدبەختی ڕاستەقینە

ئەگەر کەسێك وەك پەیامنێرێك بکەوێتە سەر ئەم زەوی‌یە، لەتەواوی ئەم خەڵکە بپرسێ : ئێوە چیتان ئەوێ ؟ بۆچی هەوڵ ئەدەن ؟ ئەتانەوێ بەچی بگەن ؟ چیتان پێ خۆشە ؟ لەچی بێزارن ؟ لەچی ئەترسن کە تووشتان بێت؟ ڕەنگە لەوەڵامەکاندا وشەکانیان جۆرجۆر بن، بەڵام هەموویان لەوەدا یەك ئەگرن کە ئەڵێن :

خۆشبەختیمان ئەوێت، لەبەدبەختی بێزارین، ئەمانەوێ بەدبەختیمان تووش نەبێت ..

هیچ ئینسانێك نیە هەدەفی لەمە زیاتر بێت .

بەڵام ئایا خۆشبەختیو بەدبەختی چیە ؟، چۆن ئینسان دەستی دەکەوێ؟ ئالێرەدا خەڵکان دەستە دەستەبوون و، زۆرێك ڕێگایان ون کردووە و نەیان زانیوە چۆن بەرەو خۆشبەختی بڕۆن؟ یا خۆشبەختی چیەو چۆن ئەتوانن دەستی بخەن؟!

زۆرێك وایان زانیوە خۆشبەختی بەوەیە سەروەتو ماڵ زۆربێو لەدەستا بێ! زۆرێك وایان زانیوە خۆشبەختی لەوەدایە ئینسان مەقامو شۆرەتو دەسەڵاتی بێ! زۆرێك لەپیاوان وایان زانیوە خۆشبەختی لەوایە ژنیان بێ! ژن وای زانیوە مێردی بێ! شتانی تری لەم جۆرە بابەتانە .

جا دوای ئەوە کە ئەوەی ویستوویانە دەستیان خستووە، دیویانە نەخێر، خۆشبەختی لەوەدا نیە .. ئەوەی وای زانیوە خۆشبەختی لە سەروەتایە، سەروەتی دەست کەوتووە، بەڵام دوایی بۆی ڕۆشن بۆتەوە خۆشبەخت نیە ، بگرە زۆرجار زیاتر دوورکەوتۆتەوە لەوەی بەشوێنیدا گەڕاوە . ئەوەی وای زانیوە خۆشبەختی لەمەقامو پلەوپایەدایە، دوای ئەوە کە دەستی کەوتووە سەیری کردووە لەوەی وابە شوێنیا گەڕاوە، زۆرتر دوورکەوتۆتەوە . هەروەها لە شتەکانی تریشدا، عالەم هەمووی هەوڵ بۆ خۆشبەختی ئەداو، بێزارە لە بەدبەختی .. بەڵام خۆشبەختی چیە، چۆن ئینسان خۆشبەخت ئەبێ، چۆن بەدبەخت ئەبێ؟ ئەمەیە زۆرتری ئەفرادی ئەم نەوعی بەشەرەی بەعەلەولاڕێدا بردووە .

بۆ ئەوەی زیاتر ڕوون بێتەوە کە ئەوشتانە ئینسان ناگەیەنن بە خۆشبەختی، یەك دوو وێنە و نمونە باس ئەکەین :

وا دانێین ئینسانێك لە شارێکدایە، هیچ مەقامو پۆستێکی نیە ، ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەم ئارەزووە ئەکەوێتە سەری کە ببێ بە شەهردار (بەڕێوەبەری ناحیە)ی شارێكو ئەبێ بە ئاوات بۆی! وا ئەزانێ ئەگەر بوو بە بەڕێوەبەری ناحیە، ئیتر خۆشبەختی تەواوی دەست کەوتووە؟! وەختێك بوو بەوە، دوای بەینێك سەیر ئەکا ئارەزوویەکی گەورەتر لەدڵیا پەیدا بووە ، ئیتر زۆرتر ڕەنج ئەدا، لەوەوپێش ئارەزووی هەر ئەوەبوو ببێتە(بەڕێوەبەری ناحیە)، بەڵام ئێستە بیر ئەکاتەوە ئەوە کەمەو

ئارەزووەکەش کەمە ، ئێستا سەیر ئەکا لەسەروو خۆیەوە فەرمانـدار (قائمقام)ێك هەیە ، ئیتر ئەو ئاواتە ئەکەوێتە دڵی کە بگاتە ئەو مەقامە .. جا کە بوو بە فەرماندار ئیتر سەیر ئەکا لەسەری ئەویشەوە ئوستاندار (پارێزگار)ێك هەیە، بۆیە ئاواتی زلتر ئەبێ ، چونکە پارێزگاریی زیاترە، ئاواتەکەی زل ترە، دیارە زەحمەتیش زیاترە بۆ دەست خستنی .. بەوەشەوە ناوەستێ، کە بوو بە پارێزگار سەیر ئەکا لەسەروو ئەویشەوە کەسیتر هەیە، بۆ نمونە (وەزیری ناوخۆ) هەیە، بۆیە ئاواتێکی گەورەتر ئەکەوێتە دڵیو ئەڵێ : خۆزگە ببوایەم بە وەزیری ناوخۆ.. ئەگەر فەرزەن بوو بەوەش، لەسەرترەوە (سەرۆك وەزیران) هەیە، (سەرۆك کۆمار) هەیە، ئەگەر بوو بەوەش سەرەك کۆماری گەورەتر هەیە، بەلامانەوە سەیر نەبێ ئاواتی ئەوەش بخوازێ کە دەسەلاتی بەسەر ئاسمانیشا ببێت ..

بە کورتی ئینسان تا زیاتر مەقامی دەست کەوێ ئاواتی گەورەترو بەربلاوتر ئەبێ، لەبەرئەوەی وەختێ شتێ بووە ئاواتیو دەستی نەکەوت خەفەتی پێ ئەخوا، بۆیە تا مەقامی زیاتر بێ ، خەفەتی زیاتر ئەبێ . بە پێچەوانەوە کەسێك کە ئاواتی کەمە، خەفەتی کەمە .

لەلایەکی تریشەوە ئەوەی وا پلەوپایەی نیە ترسی ئەوەی نیە شتێکی لەدەست دەرچێ، بۆیە ناترسێ . بەلام لەو رۆژەوە کە ئەبێ بە شتێ، ترسی ئەوەی هەیە کەسێکی تر بێتو ئەو شتەی لەدەست دەرکا،

چونکە هەروەك ئەم ئەو شتەی پێ خۆشە خەڵکی تریش پێیان خۆشە، هەر ئێستا کەسانی تریش هەن هەوڵ ئەدەن بۆ ئەوەی جێگاکەی بگرن . ئەگەر بوو بەشتێکی گەورەتر ترسی بەقەدەر ئەو شتە زیاتر نەبێ .. وە هەروەها .

کەواتە مەقامی زۆرتر خەفەتی زۆرتر ساز ئەکا بۆ ئینسان، هەروەها مەقامی زۆرتر ترسی زۆرتریش ئەگەیەنێ بە ئینسان .

سەروەت و سامانیش بە هەمان جۆرە . فەرز ئەکەین کابرایەك لەدێیەکا دوکانێکی بچوکی هەیە، قەراری وایە هەر ڕۆژێ (١٠٠) تمەن یا سەد دینار سوودی دەست کەوێ، سەرمایەیەك کە هەیەتی و دوو کانەکەی پێ داناوە، مەسەلەن ١٠ هەزار تمەنە ، ئەو کەسە بەقەدەر ئەو سەرمایەیە ئاواتی هەیە .

ئەگەر ١٠ هەزارەکەی بوو بە ١٠٠ هەزارو، لەشارێکا دوکانی دانا ئاواتی بەقەدەر ئەوە زۆرتر نەبێتو چاوەڕوانی ئەوە ئەبێت لەڕۆژێکا چەند بەرانبەری ئەوەی وا لەدێیەکەدا ئاواتی بۆ ئەخواست دەست کەوێ .. ئاخر سەروەت زۆربووە ئاواتیش زۆر بووە، پێش لەوە ئەوەی ئاواتی بۆ ئەخوازێ دەستی کەوێ خەفەتی بۆ ئەخوا، کەوابوو بەپێی زۆربوونی سەروەتەکەی خەفەتیشی زۆر بوو.

هەروەها لەولایشەوە ئەوەی کە ١٠ هەزار تمەنی هەیە، ئەگەر بترسێ ١٠ هەزار تمەنەکەی لەدەست دەرکەن، بەقەدەرئەوە ئەترسێ .

بەقەد ١٠ هەزار تمەنەکە ئەترسێ، ئەوەی کە (ملیۆنێك)ی هەیە بەقەد (ملیۆنێك) ئەترسێ، هەروەها ئەوەی کە (ملیارد)و زیاتری هەیە .

دەی ئەوە (پلەو مەقام)، ئەوەش (سامانو سەروەت)، کە هەرکات کامیان تا زیاتر ئەبێ خەفەتی زیاترو، ترسی زیاتر ئەدا بە ئینسان، هەرکەسیش ترسو خەفەتی ببێت، ئیتر لەو شتەی وا هەیەتی کەلکێ وەرناگرێو ئیستفادە ناکا.

حەقیقەت ئەوەیە ئەو خۆشبەختی‌یەی وا خەڵك بۆی ئەگەڕێن، بەڵام دەستیان ناکەوێ ، ئەوەیە ئینسان حاڵەتێکی بێ کەلەو حاڵەتەدا خەفەتی نەبێ وترسی نەبێ، ئەگەر ئینسان ئاوا حاڵەتێکی بوو ئەوا خۆشبەختە، بەڵام هەروەك روون بووەوە نە سەروەت رێگەی ئەوەیە ئینسان بگا بەو حاڵەتە، نە مەقام و نەهیچ شتێکی‌تر لەوانەی ئەهلی دونیا ئەیانەوێ .

ئەی‌چۆن‌وبەچی ئینسان ئەگا بەخۆشبەختی، بەچی وای لێ دێت نە خەفەتی بێ‌و نەترسی بێ ؟!

ئینسانێك کە رێگای بەندەیی خوا ئەگرێتە بەر ، بەکورتی تەنها بیری لەسەر ئەوەیە کە خوا چی لێ داوا ئەکا ئەوە بکا، ئەفەرموێ چی مەکە ئەوە ئەکا؟ بیری بەلای ئەوەوە نیە کە چی‌بووەو چی ئەبێ؟ لەمەوپێش چی بووەو لەمەولا چی ئەبێ .. بۆ ؟ چونکە ئەزانێ هەر چی‌یەك ئەبێ خوا ئەیکا، هیچ شتێك بەبێ ئیرادەو بەبێ ویستی خوا

نابێ ، هەرچی‌یەکیش ئەو بیکا خێرەو حیکمەتە ، هەر ئەوکارە دروست‌و بەجێ‌یە وغەیری ئەوە نابەجێیە !

کەواتە ئینسانێك بەندەی خوا بێت‌و ئەمە بزانێ، نەبیری ئەوە ئەکا کە چی‌بووە؟ نە بیری ئەوەش ئەکا کە لەمەولا چی ئەبێ؟ ئەوانە ئەسپێرێ بەخاوەنی خۆی، ئەیسپێرێ بەخوا . بەندەی خوا تەنها بیری لای ئەوەیە ئەبێ چی بکاو چی نەکا؟

وەزیفەو مەسئولیەتی چیە ، ئەوە جێبەجێ ئەکا . بڕواو قەناعەتی وایە لەمەوپێش هەرچیەك بووە ئەوە خوا خۆی کردویەتی‌و هەمووی حیکمەتەو بەجێ‌یە، شتێك نیە نابەجێ‌و نادروست بوو بێت ، تا ئینسان خەفەتی بۆ بخواو بڵێ خۆزگە وا نەبوایە . شتێکیش لەوانەی کە خێرو حیکمەتی تیابووە لەدەست دەرنەچووە ، تا بڵێ : ئاخ ! ئەو شتەم لەدەست دەرچوو، ئەبوایە ببوایەو نەبوو. پێی وایە هەرچی‌یەك وا خێرو حیکمەت بووە خوای گەورە کردوویەتی‌و، هەرچی‌یەك شەڕو نابەجێ بووە، نەیکردووە . تیز هیچ جێگای ئەوە نیە کە ئینسان خەفەت بخواو نارەحەت بێ‌و، بڵێ خۆزگە ئەوە ببوایەو ئەوە نەبوایە ..

لەمەولاش هەر شتێك ئەبێ ئەوەیە کە خوا ئەیکا، هەر خێرە و حیکمەتەو بەجێ‌یە، ئەوەی نادروستە خوا نایکا . کەوابوو لەمەودواش ترسی ئەوەی نیە شتی نابەجێ‌و نادروست بێتە دی. هەروەکو خەفەتی نەبوو بۆ لەمەوپێشتریش .

ئـەوەی خـەڵکیش ئەیکـەن هەروایـە . هەرچـی‌یەك لەمـەوپێش کردوویانە ئەگەر ئیش‌وکاری باشیان کردووە، خۆ ئەوە جێی خەفـەت نیە، ئەگـەر شـتی نابـەجێ‌و نادروسـت کـراوەو گونـاهو سەرپێچی‌و نافەرمانیان کردووە، خۆ ئەوە رۆشتووە، ئەم تەنها ئەوەی لەسـەرە کـە پێی ناخۆش بێت ئەو شتانە کراون و لێیان پەشیمان بێ، غـەیری ئـەوە شتێکی تری لەدەست نایەت .

ئەوانەش وا نافـەرمانی و سەرپێچـی‌یان کـردووە لەفـەرمانی خـوا، ئەگەر دەسەڵاتی بوو لێیان داوا ئەکا لەمەولا ئاوا نەکەن، بەوە ئـەرکی خۆی ئەدا ئەکا .. بۆ لەمەولاش بریاری لەسەر ئەوەیە ئەگەر کەسێکی دی نافـەرمانی کـرد، یـا گونـاهێکی ئـەنجام دا ، یـا مەسـئولیەت‌و وەزیفەیەکی تەرك کرد، ئەمری پێ بکا بەچاکەو مەنعی بکا لە خراپە .. ئەمە بۆ لەمەولای خۆیشی ، هەروەك قەرارە ئـەرك بـەجێ بێنـێ، ئـیتر ترسی ئەوەشی نیە لـەداهاتوودا خـەڵك نافـەرمانی بکـەن‌و سەرپێچی لەفەرمانی خوا بکەن ، چونکە ئـەوەی لەدەسـتیایە قـەرارە لەئاینـدەدا بیکا، ئیتر غەیری ئەوە شتێکی تر لە گەردنیا نیەو ئەم مەسئول نیە لێی .

ئیتر باسی ئێستای(ئەو کاتەی کە تیایەتی) ئەوەیە بزانێ ئـەبێ چـی بکاو چی ئەکا؟ ئەوەی خوا داوای لێ ئەکا ، بیکا .. ئەوەی لێی داوا ئەکا نەیکا، نەیکاوتەواوبوو. ئەو ئەوەی لەسەرە لەوساتەی کـە تیایـا ئەژی بیری لای ئەوەبێ کە خوا ئەیەوێ، وەختێك ئاوا بوو ئیتر ترسـی

نیە بۆ داهاتوو، هەروا کە خەفەتی نیە بۆ ڕابووردوو . بەنیسبەتی خۆشیەوە لەمەوپیش ئەگەر نافەرمانییەکی کردووەو گوناهێکی تووش بووەو، ئێستا بیری لێ ئەکاتەوەو خەفەتی پێ ئەخوا، ئەتوانێ بەیەك شت لەکۆڵی خۆی بکاتەوە، بە تەوبەیەکی ڕاست و بە ئیخلاسەوە خەت ئەکێشێ بەسەر هەموو گوناهەکان و هەموو نافەرمانیەکانیا، خۆی ئەجات ئەدا لەدەست ئەو شتانەی لەمەوپێش کردوونی .. کاتێ تەوبەی کرد، خەت ئەکێشێ بەسەر گوناهەکانیا وەك ئەوە کە نەیکردبن ، ئیتر جێگای خەفەت نیە ، بۆچی ئەوەم کردو بۆچی ئەوەم نەکرد؟ بۆ لەمەولاش ، بڕیارو عەزمی لەسەر ئەوە ئەبێ ،هەرچی خوا پێی خۆشە ئەوە بکا، هەرچی ئەو پێی ناخۆشە لەوە دووری بکا . هەر ئەوەی لەسەرە .. دەی وەختێ ئاوا ڕەتی خۆی کۆکردووە ، ئیتر لەڕەت بڵاوی دەرئەچێ‌و ڕزگاری ئەبێ . خەفەتی لەمەوپێشی ئەما، ترسی لەمەودواشی نیە مەسئولیەتی خۆی ئەدا کردووە ، ئیتر ئەشتێکی لە دەست دەرچووە تا خەفەتی بۆ بخوا، ئەشتێك لەسەرەڕێیایەتی کە خەتەر بێ بۆی‌و ترسی لێی بێت . تەنها هۆشی بەئێستاوەیە ،(بەو ساتە وەختەوە کە تیایدایە).

بەم جۆرە ئەم بڕیارو تەصمیمە وا لە دڵیدا، دڵیشی وا لە دەست خوای گەورەدا و زەمانەتی ئەکا، هەم بۆ ئێستا زەمانەتی ئەکا – مادام ئەم عەزمی کردووەو بڕیاری داوە لەسەر ئەوەی خوا چی لێ داوا ئەکا

ئاوا بێت، خواش کۆمەکی ئەکات - هەم بۆ داهاتوویش، کە بڕیاری لەسەر ئەوەیە بەندەی خوای خۆی بێت، خـواش کۆمـەکو زەمانـەتی ئەکا کە بۆ لەمەولاش بەو ڕێیەدا بڕوا خوا پێی خۆشە .

واتە هەرچی لێی داوا ئەکرێ وا لـە دڵیـا، دڵیشـی وا لـەدەسـتی خاوەنەکەیاو ئەو زەمانـەتی ئـەکا. زۆر وەخـت ئـاوات ئـەخوازێ بـۆ شتێکو دەستی ناکەوێ . ئەوەی وا ویستویەتی دەستیکەوتوە. چونکە ئەوەی ئەم ئەیەوێ ئەوەیە بەندەی خوابێ . ئەوەش وا دەستی کـەوتووە ترسی نیە کە لەدەستی دەرچێ . بۆ؟ چـونکە ئـەو شـتە وا لـەدڵیا، دڵیشـی وا لـەدەسـتی خوادایـە . نەشتێکی لەدەسـت دەرچـووە، نـە ئاواتێکی هەیە ئەیەتە دیو خەفەتی بۆ بخوا، نەترسی هەیـە لـەوەی ئـەو شتەیش وا هەیەتی لەدەستی دەرچێ .. خۆشبەختیش ئەوەیە وا وتمان ، خەڵك هەموو بەشوێن ئـەوەدا ئەگـەڕێن، بـەڵام نـازانن چـۆن دەسـتی بخەن .

ئەمە جەزاو پاداشتێ کە هەر لەدونیادا دەسـتی ئینسـانی موسـڵمان ئەکەوێ . ئائەمەش خـۆی ئەوەنـدە گەورەیـە، کـە ئەگـەر بـە ڕاسـتی ئینسـان غەیری ئەمە جەزایەکی تریشی نەبێت ئەمەی بەسە .

چونکە هەروەك وتمان هەر کەس لێی بپرسی لە دونیایـدا هـەوڵی چی ئەدا؟ بۆچی خەریکە؟ وەڵامی ئەمەیە کە ئێمە باسـی لـێ ئەکـەین، ئەیەوێ خۆشـبەخت بێ . دەی ئەو هەموو تێکۆشانە خەڵك هەیانـە بـۆ

ئەوەی خۆشبەخت بن، دەستیان ناکەوێ، بەڵام لەم ڕێیەوە ئینسان دەستی ئەکەوێ، لەڕێگەی بەندەیی خواوە، لەڕێگەی ئیمانو عەمەلی صالحەوە.

خوا بۆ ئەوە ئەفەرموێ : ﴿ لَنُحْيِيَنَّهُ حَيَاةً طَيِّبَةً ﴾ : ژیانێکی خۆشی پێئەدەین لەدونیادا. ئەوەیە ئەو ژیانە خۆشە کە نە خەفەتی ببێ، نەترسی ببێت .

جگە لەوە کاتێ ئینسان لە حاڵەتێکدا بوو نە خەفەتی بوو نەترس، لەبەر ئەوە کە ڕووی دڵی لەخاوەنەکەی خۆیەتی، ئیتر لەوپەڕی سەربەرزیشا ئەژی . هەر لەوکاتەدا کە زۆرێك لەخەڵك سەریان بۆ ئەمونەو دانەواندووە، زەلیلی دەستی ئەمو ئەون، موسڵمان بەرانبەری هەرچی دەسەڵاتدارو زۆردارە سەربەرزو سەرفرازە، ئامادە نیە سەر بۆ هیچ کەسێك، بۆ هیچ قودرەتو دەسەڵاتێك دانەوێنێ . ئەمەش خۆی بەهەشتێکە ئینسان تیایدا ئەژی .

دوای ئەوە کە ژیانی دونیایش دوایی پێ هات، ئینجا نیعمەتی گەورەتر دەست پێ ئەکەن، کە ئێستا دێینە سەر باسی هەندێکیان .

## ژیانی بەرزەخ

**بەشیّ لە ژیانی بەرزەخ و چۆنیەتی پاداشت و سزا تیایدا:**

موسڵمان تۆزێك بەرلەوەی گیانی دەرچێت، لەسەرە مەرگدا فریشتەكان پێشوازی دەكەن، كە دێن بۆ گیان كێشانی بە رێزلێنانوئیحترامەوە گیانەكەی ئەكێشن و، ئەیبەن بۆ جێگای خۆی .

لەوەختی گیان كێشانەوە تا رۆژی قیامەت - كە پێی ئەوترێ (بەرزەخ)- ئینسانی موئمین یەكێك لەم دوو حاڵەتەی هەیە :

ئەگەر لە موسڵمانی پلە یەكەمە - ئەوانەی قورئان ناوی ناون ( سابقین )یا (مقرّبین)- ئەوە لە هەرئافەت و بەڵایەك، لەهەر شتێك ناخۆش بێ ، لەو دەورەداو لەو بەینەدا رزگارە . ئەوەش كە خۆشحاڵییەو موناسیبی حاڵیەتی، گونجاوە لەگەڵ دەرەجەو مەقامیّ كە هەیەتی، دەستی ئەكەوێ. باخێك كە پڕە لەنازو نیعمەت، لە وێنەی بەهەشت لەئیختیاریدایە، هەروەك ئەفەرموێ :

﴿ فَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ ، فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّةُ نَعِيمٍ ﴾ سورەی (الواقعه).

بەڵام ئەگەر لە موسڵمانانی دەرەجە دووەم بوو، ئەوانەی قورئان ناوی ناون :(أصحاب اليمين)یا (أصحاب الميمنه) یا ( مقتصدين)، ئەوە ئەگەر چی دەرەجەی لەخوارەوەیەو جەزاو پاداشتی لەخواری موسڵمانانی دەرەجە یەكەوەیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا لای كەمی پاداشتی

ئەوەیە کە لە هەر ئافەتو بەڵاو ڕەنجێك لەو دەورەدا ڕزگارەو تووشی هیچ بەڵاو دەردەسەرییەك نابێت :

﴿ وَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ ، فَسَلامٌ لَكَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ ﴾ .

ئەمەش بەرزەخ ، لەکاتی مردنەوە تا ڕۆژی قیامەت . لەقیامەتیشا لەوکاتەوە زیندوو ئەبێتەوەو لە قەبرەکەی دەردێت، ئیتر هەر نیعمەتو ڕێزلێنانو ئیحترامە و یەك لەدوای یەك پێی دەدرێ .

هەرکە زیندوو ئەبێتەوە ئەزانێ چ خەبەرەو بۆچی هەڵساوەتەوەو بۆ کوێ ئەچێ . ئەو وەختە بەسەرفرازی و بەڕووسووریەوە ئەکەوێتە ڕێ بەرەو مەحکەمەو دادگای خوا.. کاتێ ئەوانەی خۆیان ئامادە نەکردووە بۆ ئەو ڕۆژە هەموو وان لەترس و لەرزدا، ئەو سەربەرزو سەرفراز، دوور لەترس و خەفەت ، ئەڕوا بۆ حزووری خاوەنەکەی، نامەی عەمەلی ئەدرێ بەدەستی ڕاستیەوەو بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە بانگ ئەکاتە ئەوانەی کە لەدەوروبەریدان : وەرن سەیر کەن، تەماشای ئەم نامەی عەمەلی منە بکەن، بزانن چی تیایە؟ لەبەرئەوەی کە شتی خراپی تیا نییە، هاوار ئەکا : بێن تا نامەی عەمەلەکەم بخوێنمەوە بۆتان، کە پڕە لەکردەوەی چاکو پڕە لەئیمانو عەمەلی صالح .

دوای ئەوە لێپرسینەوەی ئاسانی بۆ جۆر ئەکرێ لەدادگای خوادا، بەڕەحمەتی ئەجاتی ئەبێتو کاری تەواو ئەبێو،کاری دادگاو

مەحکەمەیشی دوایی دێت‌و، دوای ئەوە ئەکەوێتە ڕێ بۆ بەهەشت کە وەصفی ئەو مەگەر خوا هەر خۆی بیکا .

کەم‌و زۆر هەر کەسێك شتێك لە بەهەشت ئەزانێ . بە کورتی ئەو دوو عەیبە کە وا لەژیانی دونیایـدا، لـەوێ نیـە، یـەکێکیان ئەوەیە ئینسان لەژیانی دونیا خەفەت لەکۆڵی ناکەوێ . ئەوی تریشیان ئەوەیە بێ ترس نابێ، ژیانی پڕە لـە خەفـەت‌و لـەترس . بەهەشـت لـەو دوو عەیبە دوورە، نە خەفەتی تیایە‌و نەترس .

چونکە ئینسان هەر ئاواتێکی بێ بۆی دێتـە دی ﴿ لَهُمْ فِيهَا مَا يشاءُونَ ﴾ هەرچیان ئەوێت بۆیـان هەیـە . ئـیتر ئینسـان بـەو هـەموو تـەماع‌و چـاوەڕوانی‌یەوە کـە هەیـەتی، هەرچـی لـەوێ داوای ئـەکاو خۆزگەی بۆ ئەخوازێ لەوێ دەست ئەکەوێ .

هەرچـی‌یەکیش پـێی ئـەدرێ بـۆ هەمیشـە پـێی ئـەدرێ و لێـی ناسەندرێتەوە ﴿ خالدين ﴾ بەردەوام‌و هەمیشەن لە ناز‌و نیعمەتدا.

خەفەت نیە چونکە هەموو ئاواتەکانی دێتە دی . ترسیش نیە چونکە هیچـی لەدەسـت دەرناچـێ. لـەخۆراك، لەخواردنـەوە، لەپۆشـاك، لەمەسکەن، لەنیعمەتی مەعنەوی، لەبینینی خوای موتەعال لـە شـتانی ترکە مەگەر هەر خوا بزانێ چین . هەرچی‌یەك ئینسان بیەوێت دەسـتی ئەکەوێت و پێی‌ئەدرێ‌و لێی ناسەنرێتەوە . ئەوەش بەهەشت .

دوای ئەوە خوا ئەفەرموێ : ﴿ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ﴾ : ڕەزامەندییەك، لێخۆش بوونێك لەلایەن خواوە، لەو شتانە هەموو گەورەترە، لەو هەموو نیعمەتەی لەبەهەشتدایە . جا ئیتر مەگەرخوا خۆی بزانێ ئەو ڕەزامەندی و لێخۆش بوونە چۆنە كە لەهەموو نیعمەتەكانی بەهەشت گەورەترە .. مەگەر ئینسان لەوكاتەدا ئەچێتە ئەوێو ئەگا بەو (رضوان)و لێخۆش بوونە، بزانێ كە چییە

ئەمە جەزاو پاداشتی كەسێك كە ڕێگای بەندەیی خوا بگرێتە بەر لەدونیادا، ئەو ژیانە خۆشە بگرێتە بەر لە دونیادا كە قورئان ناوی ناوە ﴿ حیاة طیبة ﴾ كە نە خەفەتی تیایە و نەترس .

لەم لاشەوە ئەوەی واتووشی ئەوانە ئەبێ كە ڕێگای بەندەیی نەفس‌و شەیتان ئەگرنە بەرو فەرمانبەرداری لە فەرمانی نەفس‌و شەیتان ئەكەن ، ئەوەی ئەبێ بە تابعی هەوەس‌ونارەزووی خۆی و، ئەكەوێتە شوێن فرمانی شەیتان، (لەبەرئەوەی ژیانی دونیا ئەبێ بەهەدەف بۆی) تا زیاتری دەست كەوێ خەفەتی زیاتر ئەبێت، ترسی زیاتر ئەبێ . نمونەشی هەمیشە ئەبینین ، هەروەك نموونەی ئەولا ئەبینین . ئەبینین ئەوانەی وا دەسەلاتیان زۆرترە، ترسیان لەحەدێكایە كە وەك بنیادەم ناتوانن بگەڕێن، خەلك نازادن بێ ئەوەی ئیحتیاجیان بێت بە پاسەوان‌و پارێزەرێك، بێ ئەوەی نیازیان بێ بە بەكارهێنانی مەسائیلی جۆرجۆر

لەگەڵ ئەمەشدا سەرشۆڕیو زەلیل بوون هەیە، ئینسان زەلیلی دەستی نەفسو شەیتان نەبێت، نەبێتە بەندەی نەفسی خۆی .

دوای ئەوە کە ژیانیشی تەواو بوو، تۆزێك بەر لەوەی گیانی دەرچێ، پێشوازیی پڕ لەئیهانەتو ناخۆشی ئەو مەلائیکانەی کە دێن بۆ گیان کێشانی دەست پێ ئەکا . وەك قورئان ئەفەرمووێ :

﴿ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ وَأَدْبَارَهُمْ ﴾ : دەست ئەکەن بەتێهەڵدانیان، تێ هەڵدان لەدەمو چاویانو لە پشتەوەش، بەوپەڕی سەرشۆڕیو زیللەتەوە گیانیان دەرئەچێت . ئیتر لەوەولا عەزاب بەشێوەیەکی تر دەست پێ ئەکا لەمردنەوە تا ڕۆژی قیامەت تاگر هاوڕێیانە، وەك لە سورەی واقیعەدا ئەفەرمووێ : ﴿وَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنَ الْمُكَذِّبِينَ الضَّالِّينَ، فَنُزُلٌ مِنْ حَمِيمٍ وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ ﴾ : ئەگەر ئەوکەسەی گیانی دەرئەچێ لەوانە بێ کە باوەڕیان نەبوو بە زیندووبوونەوەی دوای مردن و بەدادگای خواو مەحکەمە و بەهەشت و جەهەننەم، بەدرۆیان ئەزانی، ڕێیان گووم کرد و ڕێگای بەندەیی نەفسو شەیتانیان گرتەبەر، ئەوە ئاوێکی زۆر داخو کولاویان بۆ ئامادەکراوە کە بەوە میوانداریان لێ ئەکرێتو، ئەبن بەمیوانی ئاوەها جێگایەك . هەروەها گرفتار ئەبن بە ئاگرێکی زۆر سەختو هەڵگیرساوەوە کە مەگەر خوا بزانێ چۆنە .

هەروەکو لەبارەی فیرعەون و داروودەستەی فیرعەونەوە ئەفەرموێ: هەرلەو لەحزەیەوە کەوتنە ناو ئاوەکەو خنکان، هەر لەوکاتەوە تا

رۆژی قیامەت بەیانی‌و ئێوارە ئەدرێتە بەر ئاگرو ئەخرێتە سەر ئاگر. تا لەرۆژی قیامەتا ئەفەرموێ : ئەمە هیچ نەبووە، جا ئێستا بیانخەنە ناو سەختترین عەزابەو، تووشی سەختترین سزایان بکەن .

ئەوەش بەرزەخ‌و بەینی مردن تا قیامەت ، بۆ ئەوانەی رێگای بەندەیێ نەفس‌و شەیتان هەڵئەبژێرن بۆ خۆیان . لەقیامەتیشا هەر لەو لەحزەیەوە کە زیندوو ئەبنەوە ئیتر سەرشۆڕی‌یەو زیللەتەو بەدبەختی‌یە، بەرووی رەش‌و تۆزگرتووەوە، بە سەرشۆڕی‌و زیللەتەوە، بەجۆرەها ئیهانەت‌و ئەزیەت‌و ئازاردانەوە ئەیەن بۆ دادگای خواو، بەوپەڕی سەختی‌و ناخۆشی‌یەوە پرسیاری لێ ئەکرێت، موحاکەمەو موحاسەبەی ئەکرێ . دوای ئەوەیش فەرمانی زیندانی ئەبەدیی لەگەڵ هەموو ناخۆشی‌یەکا لەجەهەننەما دەرئەچێ بۆی، ئەکەوێتە ناو جەهەننەمێك هەرچی ناخۆشە تیایدا هەیەو لەهەر خۆشیەك بەدوورە . جەهەننەمێك کە شوێنی ئەو کەسەی تێی ئەکەوێ ژوورێکی چکۆلەیە لە ئاگر ﴿ إِنَّهَا عَلَيْهِمْ مُؤْصَدَةٌ ، فِي عَمَدٍ مُمَدَّدَةٍ ﴾ : بۆ هەر فەردێك ژوورێکی بچکۆلە دروست ئەکرێ لە ئاگر، ئەویش بە ستونۆکۆلەکە لەملاولەولاوە مەحکەم ئەکرێت بۆ ئەوەی رێگای دەرچونی نەبێت. ئەوە مەسکەن و شوێنیەتی ..

پۆشاکیشی : لیباسێکە لە (قەتران)، کە مادەیەکە هەم ڕەشە و ڕەنگەکەی ئەزیەت ئەکا، هەم بۆگەنە، هەم چەورە کە گڕ ئەگرێو لەبەرکردنەکەی زیاتر ئەبێتە مایەی ڕەنجو زەحمەتو دەردیسەر..

خۆراکیشی : قورئان ئەفەرموێ خواردنێکە ئەکەلکی ئەوەی هەیە ئینسان تێربکا، ئەسوودێکی پێ ئەگەیەنێ ، غەیری دەردیسەریو ئەزیەت زیاتر هیچی‌تیانیە.ئەو شتە (زقّوم) یا،(ضریع)ە، کە ئەبێ تێریشی لێ بخوا.

دوای ئەوەی تینووی ئەبێ، داوای ئاو ئەکا، ئاوی پێ ئەدرێ، بەڵام ئاوێ کە زۆر زۆر گەرمە، وەختێ ئەیخواتەوە هەمرو ناو سکی لەت‌وپەت ئەبێ‌و ئەڕژێ . هەروەها هەر جارێك کە پێستی لاشەی ئەبرژێ و، تەواو ئەبێ، دوبارە پێستێکی تری بۆ دروست ئەکرێتەوە بۆ ئەوەی زیاترو باشتر عەزابەکە بچەژێ .. ئاوا حاڵەتێك تووش ئەبێت لە جەهەننەما . لە هەمووی زیاتر تووڕەیی سەختو غەزەبی خوای موتەعالە کە لەحەدێکی زۆردایە ، ئەو خوایەی ڕەحمەتی هەموو شتی داگیر کردووە، وەختێ کە هاواریان بەرز ئەبێتەوە و ئەڵێن: خوایە ئیجازەمان بدە با بێینە دەرەوە، برۆین ئەمجارە جۆرێکی تر بژین. ڕێگای بەندەیی تۆ بگرینەبەر. ئیتاعەت لەفەرمانەکانی تۆ بکەین. بەڵکو ئیتر ئەیەینەوە ئێرەو ڕزگار ببین ئالەم عەزابەو بەڵایە.. وەختێك ئاوەها

هاواریان لێ هەڵنەسێ، لەوەلآمدا شتێك نەفەرموێ کە خەڵکی بو دەرکردنی سەگ بەکاری نەبەن:

﴿ قَالَ اخْسَئُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴾ بە چەخە! جوابیان نەداتەوە . بەئیهانەوەو بە نائومێدکردنیان لەوەی کە هیچ جورە رەحمێکیان پێ بکرێ ، پێیان نەفەرموێ : ﴿ فَذُوقُوا فَلَنْ نَزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴾: بچەژن، هیچێك غەیری عەزابو شکەنجەتان بو زیاد ناکەین . ئەگەر قەرار بێ شتێکتان بۆ زیاد بکەین عەزابو شکەنجەیەو هیچێکی تر نیە ئەمەش سەرەنجامی‌ئەوانەی رێی بەندەیی نەفسو شەیتان ئەگرنە بەر و، لەرێگای بەندەیی لائەدەن.

جا دوای ئەوە کە زانیمان عیبادەتو بەندەیی خوا چی بەدوادا دێت، عیبادەتو بەندەیی نەفسو شەیتانیش چی لەشوێن دیت.. دوای ئەوە کە زانیمان هەڵبژاردنی ژیانی دونیاو کردنی ژیانی دونیا بەهەدەف چ نەتیجەیەکی هەیەو، بەپێی فەرمانی خوا ژیان بەسەربردن چ نەتیجەیەکی هەیە، زۆر ئاسان ئەبێ بۆمان کە بزانین کام لەم دووانە ئەبێ هەڵبژێرین بۆ خۆمان..؟

دیارە تەنها پێویستی بەعەزمو ئیرادەیەك هەیە بو ئەوەی کام لەو دووانە هەڵبژێرێ. نیازی بەوە هەیە ئینسان لە لەزەتوخوشی و شوێنی نەفسو شەیتان کەوتن بتوانی دەست بەردار بێت، ئەگەر بتوانی عەزم بکا لەسەرئەوە . تەنها ئەوەی سەختە ئینسان بتوانی ئەو

هەڵبژاردنە بکات ، بەعەزمو ئیرادەوە ڕێگای بەندەیی خوا بگرێتەبەر. تەنها ئەم هەنگاوی یەکەمە زەحمەتە .

ئەگەر ئینسان تەصمیمی گرتو بڕیاری دا ئەو ڕێگەیە بگرێ، ئیتر باقی هەنگاوەکانی تری ئاسان ئەتوانێ بنێ . دوای ئەوە ئیتر لەزەتی چوون بەو ڕێگایەدا ئەوەندە زورە کە هەزاران دەردیسەرو نارەحەتیش تووشی ئینسان ببێ ، ئەتوانێ تەحەمولی بکاو پێی خۆشە ..

تا ئێرە بەکورتی باسی ئەوە کرا کە بەندەیی خوا چی‌یە؟ موسلمانیی‌و ئیسلام بوون چی‌یە؟ چۆن ئینسان ئەتوانێ بەندەی خوا بێت وموسڵمان بێ؟ چ شتێك ئەبێتە مانعی ئەوەی ئینسان بەندەی خوا بێت‌و موسڵمان بێ؟ چون ئینسان ئەتوانێ ئەم مانعەو ئەم کۆسپە لەسەر ڕێگای لابیا؟ ئەگەر ڕێگای بەندەیی خوا بگرێتە بەر بەرەو کوێ ئەچێ؟ چی دەست ئەکەوێ ؟ ئەگەر لەو ڕێگایە لابدا تووشی چی ئەبێ؟

دیارە تەنها لەکاتێکا ئینسان ئەتوانێ بەندەیی خوا بکاو ڕێگەی بەندەیی بگرێتە بەر،کە ئیمانی بەقیامەت بێ، ئەگەر ئیمانی بەقیامەت نەبوو. یا زەعیف بوو ئەوە یا ناتوانێ بەندەیی خوا بکات یا بەندەیی‌یەکەی ناوا نابێ کە بە کەڵکی بێت‌و دەردی بخوا..

بۆیە لەقورئانا زۆر زۆر باسی قیامەت‌و ئەو ڕووداوانەی پەیوەندی‌یان بەقیامەتەوە هەیە کراوە، زۆر ئەهمیەتی پێ دراوە،

بەجۆرێك ڕەنگە لاپەڕەیەك لەقورئاندا نەبێت (بەشێوەیەك لە شێوەكان) باسی قیامەتی تێدا نەبێ ..

## واتای (پەروەردەكردن) و چۆنیەتیەكەی

جا بۆ ئەوەی باش دەركەوێ كە (ئیمان بەقیامەت) چۆن ئینسان وا لێ دەكات كە ڕێگای بەندەیی خوا بگرێ، ئەبێ لەپێشا شتێك ڕوون بكەینەوە . ئەویش ئەوەیە كە ئینسان لەسەرەتاوە دروستكراوێكە ئامادەیی هەیە بۆ ئەوەی زیاد بكا، بۆ ئەوەی وەك دانەی گیایەك، وەك تۆوێك، وەك ئەمامی درەختێك، ئەگەر بێتو زەمینەیەكی بۆ فەراهەم بكرێو بۆی ڕێك كەوێ، زیاد بكاو كامڵ ببێت، جا بۆ ئەوەی ئینسان بتوانێ زیاد بكا خوای بەخشندە هەرچییەك لازمە لەئیمكانات لەدەست ڕەسیا قەراری داوە، ئەگەر دروست كەڵكیان لێ وەرگرێ، بەو ڕێیەدا ئەچێ، زیاد ئەكاو ئەگا بە حاڵەتی كامڵو تەواو بوونی، بەو جۆرەی كە خوا ئەیەوێ ..

هەروەها ئەگەر دروست كەڵكی لێ وەرنەگرتنو ئیستفادەی لێ نەكردن، ئەبێ بەسەبەبی ئەوەی ئەو ئامادەییەی هەیەتی لە بەین بچێ، لە جیاتی ئەوەی زیاد بكا . هەروەك تۆوێك كە فاسد ئەبێو زایە ئەبێ، ئاوەها لە بەین ئەچێ . ڕێگای دروستی ئیستفادەش لەئیمكاناتو نیعمەتەكان هەر خۆی دیاری كردووە بۆ ئینسان .. خوا خۆی دیاری

کردووە کە چون کەڵك وەرگرێ‌و بیبتە هۆی خێر بۆی‌و، بیبا بەرەو کەماڵ . دیاریشی کردووە کە ئەگەر چۆن بکا بەرەو کـاملی ناچـێ‌و زیاد ناکاو زایە ئەبێ.. خوای گـەورە هـەروا بـێ هـوودە ئـەم هـەموو نیعمەت‌و ئیمکاناتەی خەلق نەکردووە . بۆ ئەوە خەلقی کردووە لەبەر دەستی ئینسانا بێ ، تا بەو شێوە دروستە سـوودیان لێ ببینـێ، تـا زیـاد بکاو بەرەو کامڵ بوون بڕوا ..

جا هەرلەبەر ئەوەشە کە ڕۆژێکی داناوە بۆ ئـەوەی ئینسـان بـانگ بکاو لێی بپرسێتەوەو موحاکەمەی بکا کە چۆن ئیـستفادەت کرد لـەو نیعمەتانە و چۆن نەت کرد؟

ئایا بەوجۆرە من پێم وتی کەڵکت وەرگرت لێیان، یا بە مەیل و، ئارەزووی خۆت بوو؟

جا ئەمە پێویستە کەمێك زیاتر ڕۆشـن بکرێتـەوە تـا باشـتر ئینسـان مەسئولیەتی خۆی بزانـێ، باشـتر دەرکـەوێ چـۆن ئیمـان بەقیامـەت پێویستە بۆ ئەوەی ئینسان ڕێگەی بەندەیی خوا بگرێ .

ئەگەر ئێمە دانەی گەنمێك لەمەزەرا بگرین، ئەگەر دیققـەت بـدەین ئەبینین ئەو دانە گەنمە لەڕاستیدا گیایـەکی تـەواوە، یـانی ئـەو گیایـەی دوایی ئەڕوێ‌و سەوز ئەبێ ،کە ڕیشووی هەیەو ساقی هەیـەو گـەڵای هەیەو گوڵەگـەنمی هەیـەو گوڵەکـە پارچـەی هەیـە.. ئـەو گیایـە کـە بەوجۆرە لەدوایدا کامڵ ئەبێ‌و تەواو ئەبێ، هەمووی لەو دانە گەنمـەدا

دەردێت کە وتمان، ئەو دانە گەنمیە کە لەناخرا ئەبێ بەو گیا تەواوە ..
دەی ئەوە مانای ئەوەیە ئەو گیا کاملە لەناو ئـەو دانەگەنمـەدا بـووە..
بەجۆرێکی تر بڵێین : ئەو دانە گەنمە هەر لەرۆژی یەکەمیەوە ئامـادەیی
بـووە بـۆ ئـەوەی گیایـەکی کـاملی لێ دروسـت ببـێ، بەهـەموو
بەشەکانیەوە. جا ئەگەر بۆی رێك کەوێ، ئەگەر زەمینەی بـۆ فەراهـەم
بکرێ، ئەگەر ئیمکاناتی بۆ رێك بخرێـت، ئـەوەی سـەوز ئـەبێ ئەبێتـە
گیایەکی کامڵ . هەروەها ئەگەر بۆی رێك نەکەوێ هەر بە دانەگـەنمی
ئەمێنێتەوە، بگرە دوای ماوەیەك زایە ئەبێو لەبەین ئەچێ .

جا ئێستا ئەو دانە گەنمە نیازی بەوە هەیە جێگایەکی گونجاو ببێت بۆ
ئەوەی تیایا بڕوێو سەوز ببێ .. خاکێك بێ مەوادی غەزایی تیا بـێ،
ئاوی بێ، هەوایـەکی موناسـیب بـێ، ئـەزۆر گـەرمو ئـەزۆر سـارد،
هـەروەها تیشـکی خـۆری پـێ بگـاو هتـد. ئـەبێ ئەوانـە هـەموو
ئامادەبن، رێك کەون، تا ئەو دانە گەنمە بتوانێ دەست بکـا بـەڕوواندو
سەوز بوونو بچێ بەرەو تەواو بوونو کامڵ بوون. هەروەها لەلایەکی
تریشەوە ئەبێ ئافەتو کۆسـپو مـانع نەیەتـە رێگـای، ئەگـەر هـاتوو
سەرمایەکی زۆر سەخت، یا گەرمایـەکی زۆر سـەخت، یاکرمێـك، یـا
هەر ئافەتێکی تر، هاتە رێگای ، ئیتر ناهێڵـێ بچـێ بـەرەو ئـەو تـەواو
بوونو کامڵ بوونە.

کەواتە هەم پێویستە خاکو تیشکو ئاوو ئەو شتانەی بۆ ئامادە بکرێ، هەم ئەبێ مانعو کۆسپو ئافەتو بەڵایش لەسەر ڕێی لابرێ، تا بتوانێ بەرەو ئەوکامڵ بوونە بچێ .

ئەم ئینسانەش ئاوا حاڵەتێکی هەیە . لەسەرەتاوە ئینسان مەخلوقێکە دارای بیروبڕوا نیە، لە دەورانی منالیدا کەسێك نیە بتوانێ کردەوەی چاك ئەنجام بدا، کەسێك نیە بتوانێ ڕێگایەك بۆ ژیانی خۆی هەڵبژێرێو بەرێگایەکی چاك یا خراپدا بڕوا، بەڵام ئامادەیە بۆ ئەوە . خوا توانای ئەوەی پێ داوە لەدوایدا- واتە دوای بەینێك – بتوانێ دروست و نادروست لەیەك جیا بکاتەوە. بزانێ چی دروستە ، چی نادروستە . بزانێ چی خێرەو چی شەڕە. بزانێ ئەبێ بڕوای بەچی بێ و چی قبوڵ نەکا. ئەتوانێ بزانێ چ شتێك ئەبێ بکا، چ شتێك ئەبێ نەکا . توانای ئەوانەی هەیە . ئامادەیە بۆ ئەوەی دوای بەینێك ئەو شتانە بزانێ ، هەروەك ئامادەیە بۆ ئەوەی وەختێ دوو ڕێگای لەیەك جیاکردەوەو زانی ئەمە چاکەو ئەمە خراپە، بتوانێ یەکێکیان هەڵبژێرێو ئەوەکەی تریان دەست لێ بەردا .. لە منالیدا ئەوانە ناتوانێ بکا بەڵام ئامادەیە لەدوایدا بیان کات، هەروەك گەنمەکە، لەوەختێکا کە دانە گەنمێکە گیا نیە ، بەڵام ئامادەیە بۆ ئەوەی ببێ بەو گیایە ..

ئەم ئینسانەش لە منالیەوە ئامادەیی هەیە بۆ ئەوەی بچێ بەرەوکەماڵو تەواو بوونو زیاد بکا. ئامادەیی هەیە بۆ ئەوە ڕۆژێك

وای لیٚ بێت سەیری ئەم مەخلوقاتەی خوا بکا، ئاسمانو زەویو دارو بەردو خاك و ئاووگیاندارو بێ گیانو ئەمانە، سەیری ئەمانە بکا، خوایان پێ بناسێ ..

سەیری ئاسمانو زەوی بکا بەو هەموو گەورەییەوە، بەوە خاوەنەکەی خۆی باشتر بناسێ، هەروەك کەسێك تەماشای ئەم دەزگای (مسجّل)ە ئەکا، کاتێ ئەبینێ زۆر جوان دروست کراوە، ئەزانێ ئەو کەسەی دروستی کردووە وەستایەکی باش بووە، چاکی لیٚ زانیوە، مەهارەتی بووە لەدروست کردنیدا. بەلاّم ئەگەر بینی ئەو دەزگایە زۆر ناجۆر دروست بووە، ئەزانێ وەستاکەی ناشی بووە .. بەهەمان جۆر کاتێ ئینسان سەیری مەخلوقێك لەم مەخلوقانەی خوا ئەکا، ئاسمانو زەویو ئەوانەی تیایانداییە، تا زیاتر سەیریان بکا، تا زیاتر ورد بیتەوە، زیاتر خوا ئەناسێو زیاتر پەی ئەبا بە کەمالّی خواو ئەزانێ خوای گەورە لەهەر ناتەواوییەك دوورە.

هەر یەکێك ئامادەیی هەیە بۆ ئەوەی رۆژێك لە رۆژان بتوانێ سەیری ئەم مەخلوقانەی خوا بکا، بە سەیرکردنی ئەمانەو دیققەت کردن لەمانە، کەم کەم بگا بەناسینی خوای گەورە .

جا پاش ئەوەی ئینسان خاوەنی مەخلوقات (خوای گەورە)ی ناسی، ئەتوانێ بەرنامەو قانونێك کە لە لایەن خواوە بێت بۆ هیدایەت و

ڕێبەری کردنی ئینسان، وەرگرێ .. خوای گەورە ئاوا توانایەکی داوە بەئینسان کە بتوانێ ئەو قانونو بەرنامەیە وەربگرێ . بۆیە خوا یەك نەفەر لە ئینسانەکاندا هەڵئەبژێرێو ئەیکا بە پێغەمبەرو ئەو بەرنامەو قانونە ئەدا بەو، ئەویش وەری ئەگرێ لەلایەن خواوەو ئەیگەیێنێ بەخەڵكو خەڵكیش لەوی وەرئەگرن، بەم جۆرە هەموو ئەتوانن بەرنامەیەك کە لەلایەن خواوە دێت وەر بگرن، بەرنامەیەك کە دروستو نادروستو خێرو شەڕیان بۆ لەیەك جیا دەکاتەوە، بۆیان ڕۆشن ئەکاتەوە ئەبێ بە چ ڕێگایەکا بڕۆنو بەچ ڕێگایەکا نەڕۆن .

وەك وتمان لەسەرەتاوە منداڵ ناتوانێ دیقەت بکا لە مەخلوقاتی خواو خوای پێ بناسێ، یا ئەگەر ئەیناسێ باش بیناسێ . هەروەها دەركو فەهمو عەقڵی لە ئاستێکدا نیە بتوانێ بەرنامەو قانونێك کە لەلایەن خواوە هاتووە وەرگرێو لێیشی تێبگا، بەو جۆرە ناشتوانێ لەدوو ڕێگا یا لەچەند ڕێگایەك یەکێکیان هەڵبژێرێو لەوانی تر دەستبەردار بێ . ئەوە دیارەو هەموو کەس ئەیزانێ، بەڵام ئەوەش ئەزانین کە لەدواییدا ئەگەر بێتو کەسێك پێ بەدەمیەوە،کەسێك بێ پەروەردەی بکاو بێت بەسەر وەختیەوە، ئەتوانێ وای لێ بێت هەم باش سەیری مەخلوقاتی خوا بکاو خۆیان بناسێ، هەم بەرنامەی هیدایەتو ڕێنمایی لە خوا وەرگرێ، هەم لەو ڕێگایانەی لەیەك جیا

نەکرێنەوە، یەکێکیان هەڵبژێرێ و لەوانی تر دەستبەردار بێ .. هەردوو شتەکە ڕۆشنە، بەڵام هەروەك وتمان لەخۆیەوە ناتوانێ ئاوای لێ بێ، ئەبێ زەمینەیەکی بۆ فەراهەم بکرێ، هەروەك دانە گەنمەکە، لازمە خاکێكو ئاوێك و تیشکی خۆرێكو گەرمایەكو هەوایەك و شتێکی تر و شتێکی تری بێ تا بتوانێ بڕوێو سەوز بێ، هەروەها ئەبێ ئافەتو بەڵایش لەسەر ڕێی لابیرێت وتوشی ئافەتو بەڵا نەبێ . ئینسانیش بەهەمان جۆرە .

جا بەشێك لەو ئیمکاناتو نیعمەتانە کە لە دەسڕەسی ئینسانا قەرار دراوە ئەو (بەرنامە) یە لەلایەن خواوە هاتووە . هەر ئەو بەرنامەیە خۆی ئەوەی تیایە کە ئینسان چۆن سەیری ئەم مەخلوقاتە بکا، چۆن خوا بناسێ؟ ئەوەی تیایە کە غەیری ئەم ئاسمانو زەوی و ئەوانەی کە تیایەتی– کە ئێمە نەیانبینین – شتی تر هەن، وەك مەلائیکە، وەك جنۆکەو غەیری ئەوانە، ئەوەی تیایە کە غەیری ئەم ژیانە ژیانی تریش هەیە، جیهانی ترو عالەمی تریش هەیە . هەروەها هەر شتێ پێویستە بۆ ئەوەی ئینسان بەندەیی خوا بکا، هەمووی لەو بەرنامەیەدا باس کراوە، هەر ئەوە ئەمێنێ کە ئینسان گوێی بۆ ڕاگرێو بەدڵ قبوڵی بکاو وەری بگرێ . هەر ئەوە ئەمێنێتەوە کاتێ خێر لەشەڕ جیابووەوە، خێر هەڵبژێرێ و ڕێگای چاکە هەڵبژێرێو، لەخراپە دەستبەردار بێ .

ئەمە بەشێکە لەو ئیمکاناتەو لەو نیعمەتانە کە لە ئیختیاری ئینسـاندا قەرار دراون . غەیری ئەوەیش خوا خۆی بۆ کەسانێك بیانەوێ ڕێگای خوا بگرن، تەوفیقی هەیە بۆیانو بۆیان ڕێك ئەخا . زیـاد لـەوەی کـە بەرنامەکەی ناردووە ، کۆمەکیان ئەکا بۆ ئەوەی بەو ڕێگایەدا بڕۆن . هەروەها ئەگەر کەسێك ئەیویـست بەو ڕێیە دا بڕوا، ئـەویش کۆمـەکی ناکاو دەستی لێ بەرئەدا کە بەرەو بەدبەختی بڕوا .

## ئافەتو گرفتەکانی سەر ڕێی هیدایەت

لە ڕێی هیدایەتدا هەندێ ئافەتو بەڵا دێنە سەر ڕێـی ئینسـان ئـەبێ لابرێن تا ئینسان بەرەو تەواو بوون بڕواو بگا بەو حاڵەتەی ئـەبێ پێـی بگا.

یەکێ لەو ئافەتانە (نەزانین)ە . ئەوەی کە ئینسـان نـەزانێ سـەیری ئاسمانو زەوی بکا، سەیری ڕواڵەتـە زاهیرییەکـەیان بکـا، لێیـان ورد نەبێتەوەو دیققەتیان تیا نەکا، وەك زۆرێـك لـەو خەڵکـە کـە هەمیشـە خەریکن سەیری ئەم مەخلوقاتە ئەکەن ، بەڵام هەر خوایان ناکەوێتـەوە بیر، خالقی مەخلوقاتیان ناکەوێتەوە بیر . یا ئەگەر کـەمێك ئاسـینێیان بەسەیرکردنی ئەم مەخلوقاتە ئاسینەکەیان زیاد ناکا .. یا ئینسـان غـافڵ بێ لەو بەرنامەیە کە خوا ناردویەتیو ڕووی تێ نەکاو نەیـەوێ، هـەروا بەغافڵی بمێنێتەوەو نەزانێ خوا چی فەرمووە، نەزانێ حـەق چیەو بـاتڵ

چیە، چاکە چیەو خراپە چیە؟! ئەم جەهلو نەزانینـە ئافەتێکـە تووشـی ئینسان ئەبێ، ئەگەر بێتو هەوڵی بـۆ نـەداو خـۆی لەدەسـتی ڕزگـار نەکا، نابوودی کردووەو لەبەین چـووە .. ئەگـەر هـەزار ئیمکانـاتو نیعمەتی تر لەبەر دەستیا بێ، وەختێ نەزان بوو، خوای نەناسی، ڕێگای دروستی ژیانی نەناسی، نەیزانی چۆن بەندەیی بکا، ئەوە لەبەین چووە . تەنانەت لەوکاتەدا وەك حەیوانەکانی تریش نیە، بگرە لەهەرچی خوارە خوارترە، چونکە هەر مەخلوقێکیتر لەو سنورە دا کـە بـۆی دیـاری کراوە ئەمێنێتەوەو، مەسئوولیـەتو وەزیفەی خـۆی ئـەنجام ئـەدا، ئـەو ئەرکەی پێی سپێراوە هەڵی ئەگرێ، بەڵام ئینسان وەختێك نەزان بـوو، نەیزانی چۆن سەیری مەخلوقاتی خـوا بکـا، نـەیزانی چـۆن بەرنامـەی هیدایەتو ڕێنمایی لەخوای خۆی وەرگری، بە جۆرێك ئەکـەوێ کـە لەهەر مەخلوقێك زیاتر دێتە خوارەوە .

یەکێکی تر لەو ئافەتانەی دێتەسەر ڕێـی ئینسـان و لەبـەینی ئەبـەن، ئافەتی (هـەوەسو ئـارەزوو)ە . هـەوەس پەرسـتیو، شـوێن هەوەسـی خۆکەوتنو، دەست بەردان لەبەرنامەی هیدایـەتی خـواو لەشـەریعەتی خوا.. هەوەس ئەوەیە ئینسان بەعزە شتێکی خۆش بوێو، بەرەو ئەوانـە بچێ، لە بەعزە شتێکیش بێزار بێ ولێیان دووری بکـا، ئـەویش بـەپێی ئەو ئەزانینەی هەیەتی، نایەوێ بەرنامەی خوا بێ بـەرێنمای، بەمـەیلی خۆی چی بەچاك ئەزانێ بۆ خۆی بـەرەو ئـەوە ئەچـێ، چـی بـەخراپ

نەزانێ لەوە دووری نەکا؟! ئالەو وەختەدا ئەوترێ : ئەم ئینسانە شوێن هەوەس‌و ئارەزووی خۆی‌کەوتووە .

لە بەرنامەی خوادا باس کراوە کە ئینسان بۆ ئەوەی خۆشبەختی‌و سەعادەتی دونیاو ئاخیرەتی دەست کەوێ، ئەبێ تابعی فەرمانی خوا بێ، گوێڕایەڵی ئەمری خوا بێ .

جا ئەگەر ئەو گوێڕایەڵی‌یە بوو بەسەبەبی ئەوەی ماڵو سەروەتی لەدەست دەرچێ، مەقامو دەسەڵاتی نەمێنێ، توشی دەردی سەری‌و چەرمەسەری بێت، هەر ئەبێ فەرمانەکەی خوا بپات بەڕێوەوئیتاعەتی بکا .

کەواتە ئینسان ئەبێ وای لێ بێت ئەگەر بەرەو سەختی‌و دەردی سەرو چەرمەسەری‌و ناڕەحەتی ڕۆشت، ئەوەی پێ خۆش بێ مادام خوشبەختی هەردوو دنیای تێدایە.. هەروەها لەخۆشگوزەرانی‌و سەروەت‌وماڵ‌ودەسەڵات‌و مەقام دووركەوێتەوە، مادام لەخوا دووری دەخاتەوە .. ئەگەر ئینسان ئاوابوو ئەوە شوێن شەریعەتی خوا کەوتووە .

بەڵام ئەگەر حەزی کرد لەخۆشگوزەرانی‌و ئیسراحەت‌و ئاسایش‌و ڕابواردن، بێزار بوو لە زەحمەتکێشان‌و هەوڵدان بۆ ئەوەی خوا لێی ڕازی بێ، بێزار بوو لەوەی شتێ بکا مەقامو دەسەڵات‌و سەروەت‌و ماڵی لەدەست دەرکا، ئەوکەسە پێی ئەوترێ شوێن هەوەس‌و

نارەزووی خۆی کەوتووە، کەسی وا ناتوانێ بەندەی خوا بێ .. بگـرە بەندەی هەوەس‌و ئارەزووی خۆی ئەبێ ..

جا ئەگەر ئینسان وای لێ هات ئیتر ئەوە تووشی ئافەتێك بـووە کـە لەبەینی ئەبا.. مەگەر زوو پێش لـەوەی ئافەتەکـە جـێگیر بـبێ، تـەواو دەست بگرێ بەسەریا، زووفریای خۆی کەوێت‌و خۆی رزگـار کـات بە کۆمەکی خوا.

ئائەمە دوو ئافەتی گەورەن ، هەر ئافەتێکی تر تووشی ئینسان ئـەبێ، پەیوەندی هەر بەم دووەوە ئەبێت‌و لەم دوانەیە . هەر ئافـەتێك لـەژیانا تووشی بەندەیەك ببێ یا لە (نـەزانین‌و جـەهل)ە وەیـە. یـا لـە (شـوێن هەوەس کەوتن)ەو هەوەس پەرستیەوەیە .

## واتای ڕەحمەت و پەروەرشیاریی خوا

ئێستە ڕوون بوەوە کە ئەم ئینسانە لەسەرەتاوە تەنها ئامادەیی هەیە بۆ ئەوەی حەق و باتڵ و خێر و شەڕ و دروست و نادروست بزانێ ، ڕێگای خێر و حەق هەڵبژێرێ و لەڕێگای شەڕ و باتڵ دەست بەردار بێ، ئەڵبەتە ئەگەر زەمینەی بۆ فەراهەم بێ، ئەگەر بەرنامەی خوای پێ بگا. ئەوە وەك ئەوەیە کە دانە گەنمەکە لەناو خاکێکی باش و حاصڵخێز و پڕ لەمەوادی غەزاییدا دانرابێ، هەوای مناسب بێ و، ئاوی بێ، تیشکی خۆری بێ، گەرماو هەموو شتێکی تەئمین بێ، سەرماو گەرمای سەخت و کرم و هەر جۆرە ئافەتێکی تر لەسەر ڕێی لابرابێ، دیارە ئەو گەنمە بەتەواوی ئەروێت و سەوز ئەبێ و ئەگا بەکەماڵ و تەواوئەبێ .

تانێرە ئینسان ئەزانێ کە خاوەنەکەی بەرەحم و میهرەبانە، یاوەك قورئان ئەفەرموێ ﴿ رحمن ، رحیم ﴾ە. ڕەحمانە : هەموو زاتی هەر ڕەحمەتە، هەر بەزەیی یە . ڕەحیمیشە : هەمیشە هەر خەریکی ڕەحمکردن و میهرەبانیکردنە لەگەڵ خەڵك، هەمیشە خەریکە بەزەیی دێتەوە بەخەڵکا . ڕەحمەت و بەزەییش بەیەکێ لەم دوو شتە ئەبێ :

١- ئیمکانات و پێویستی یەکان ئامادە بکرێن .

٢- کۆسپ و گرفت و موشکیلەکان لەسەر ڕێ لابرێن .

لە نمونەی دانەگەنمەکەدا ئامادەبوونی خاك‌و ئاوو تیشكی خۆرو گەرماو شتەکە، ئەوە بەشێکە لە رەحمەت . هەر کۆسپ‌و گرفتێ بێتە سەرە رێی خوا لای بەرێ ، ئەوەیش بەشێکی ترە لە رەحمەت .

ئەوەی کە خوا ئەفەرموێ ﴿ الرحمن الرحیم ﴾ ئەمە مەعنایەتی : هەموو زاتی هەر رەحمەتە، هەمیشەش هەر خەریکی میهرەبانی‌و رەحمەت کردنە بە مەخلوقاتەکانی‌و بەندەکانی خۆی .

تائێرە خوای گەورەمان ئاوا ناسیوە. جا وەختێ ئینسان بیری لەمانە کردەوە کە خۆی وەك دانە گەنمێکە، ئامادەیە بۆ ئەوەی برویەو بەرەو تەواو بوون‌و کەمال بڕوا، خاوەنەکەیشی هەرچی کە پێویستە بۆی ئامادەکردووە، هەر ئافەت‌و کۆسپێکیش -کە لەوانەیە بێنە سەر رێی- لەسەر رێی لای بردووە، وەختێ ئینسان بیری لەمە کردەوە، دڵی پڕدەبێ لەئومێد بە خاوەنەکەی کە کۆمەکی بکاو تەوفیقی بدا بۆ ئەوەی ئیستفادە بکا لەو ئیمکانات و نیعمەتانەو، بڕوا بەرەو کامڵ‌و تەواو بوون.

# بەشی دووەم

## بڕوا بەڕۆژی دوایی و، چەمکێ لە بەڵگەی بونیو ڕوداوەکانی

- پرسینەوەی دواڕۆژ
- پلەکانی بڕوا بە دواڕۆژ
- پوختەیەك لە تەفسیری سورەتی ( التكاثر)
- پوختەیەك لە تەفسیری سورەتی ( الزلزلة)
- پوختەیەك لە تەفسیری سورەتی ( القارعة)
- پوختەیەك لە تەفسیری سورەتی ( الانفطار)
- قۆناغەکانی هاتنی قیامەت و شەیپورەکان
- گۆشەیەك لە بەڵگەکانی زیندوبونەوە
- هەندێ لە بەڵگەو نیشانەکانی ڕۆژی دوایی
- پوختەیەك لە تەفسیری سورەتی ( قاف)
- بەشێك لە تەفسیری سورەتی (الحاقة)
- بەشێك لە تەفسیری سورەتی (الواقعة)
- تەفسیری سورەتی (الماعون)

**پرسینەوەی دواڕۆژ:**

ئەزانین کە خوای گەورە ـ هەروەك لەمەوپێش وتمان ـ کاری نابەجێ ناکا، حەکیمە، هەر کارێ ئەیکا بەجێ ئەیکا، کاری بێ هوودە ناکا. کەوابوو ناکرێ ئینسانی خەلق کردبێ بۆ ئەوەی بەرەوکەمالو تەواو بوون بچێو، ئەو هەموو ئیمکاناتو نیعمەتانەشی لەبەر دەستیا دانا بێ، دوایش لێی نەپرسێتەوە: ئەرێ چیت کرد، چیت نەکرد؟! ئەبێ رۆژێك بێت خوای خاوەنی ئینسان، بانگ بکاتە ئینسانو لێی بپرسێتەوە کە : چۆن ئیستفادەت کرد لەم ئیمکاناتە؟! چۆن کەڵکت وەرگرت لەم نیعمەتانە؟! خۆ من هەروا بە هەوانتە ئەوانەم پێ نەدابووی، هەر چۆن کە خۆت گەرەکت بێ کەڵکیان لێ وەرگری؟! ئەو نیعمەت وئیمکاناتە، بۆ ئەوە پێم دای بەرەو کەماڵ بڕۆی ، پێیان بگەی بەوەی حەقو باتڵو خێرو شەڕ لەیەك جیا بکەیتەوە، رێگای حەق بگریو بەرێگای حەقا بڕۆی، رێگای خێر بگریو لەرێگای شەڕو باتڵ دەستبەردار بی، وات کرد یا نەتکرد؟

دیارە خاوەنی ئینسان دەسەلاتی هەیە بەسەر ئەم ئینسانەدا، سەرەنجامو عاقیبەتی ئینسان لەدەستایەتی، لەدەستی دەرناچێ، ئەبێ بڕواتەوە بەردەستی و، موحاکەمەی بکا، لێی بپرسێ، چۆنیش وەلام ئەداتەوە ئاوا جەزاو پاداشتی بداتەوە . ئالێرەوە لەوەش تێدەگەین کە خوا دەسەلاتدارەو سەرەنجامو عاقیبەتی ئینسان لە دەستیایەتی، هەروەك

خەڵك ئەڵێن كۆنترۆڵی ئینسان و چارەنوسی لە دەستیایەتی ولەدەستی دەرناچێ . هەروەك لەسوورەی فاتیحەدا دوای ئەوەی ئەفەرموێ: ﴿الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ﴾ ئەفەرموێ: ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ ساحێبی ئەو رۆژەیە كە جەزاو پاداشت ئەداتەوە بەئینسان، بەپێی ژیانی دونیای، جا وەختێك ئاوا خوامان ناسی، دیارە هەموو گیانمان پڕئەبێ لە ترس .. ئەبێ ئینسان وای لێ بێ لە هەموو ژیانیا، لە ئیستفادەكردنی لەهەر كام لەم نیعمەتو ئیمكاناتە بترسێ، نەبادا جۆرێك كەڵكیان لێ وەرگرێ كە خوا پێی خۆش نەبێ، ئەبێ لەبیری بێ لەدواییدا لێی ئەپرسنەوە كە چۆن ئیستفادەت لێ كردووە؟!

كەوابوو ئەبێ هەر لەئێستاوە جواب حازركا بۆ ئەو رۆژە . ئەبێ هەر لەئێستاوە وەختێ خەریكە ئیستفادە ئەكا لەئیمكاناتو نعمەتەكان، لەبیری بێ دوایی سوئالی لێ ئەكەن . ئەبێ جوابێكی دروستی بێ . ئەبێ جوابی ئەوە بێ : بەو جۆرە كەڵكم لێ وەرگرتن كە خۆت فەرمووت، بەپێی ئەو بەرنامەیەی خۆت ناردت . لەچاوم، لەگوێم، لە زبانم، لە قەلبم، لە دەستم، لە پێم، لە زاهیرم، لە باتینم، لە هەرچییەك كە پێت دابووم، ئاوا كەخۆت فەرمووت ئیستفادەم كرد. لە چاوم بۆ ئەوە ئیستفادەم كردكە سەیری مەخلوقاتی تۆی پێ بكەم، كە تۆی باشتر پێبناسم . لەگوێم بۆ ئەوە ئیستفادەم كرد خێری پێ ببیستم، بەرنامەی هیدایەتی تۆی پێ ببیستم، رێی خێرو شەڕ لەیەك جیا

بکەمەوە . لە زبانم بۆ ئەوە ئیستفادەم کرد یا بپرسم بۆ ئەوەی کە نایزانم تا فێری بم، یا ئەوەی ئەیزانم بیلێم بەخەڵك . لە دڵم بۆ ئەوە ئیستفادەم کردکە عەقیدەو بیروبڕوا بەتۆی تیا بێ، بیروبڕوا بەغەیری تۆ تێیدا جێی نەبێتەوەو دەری کەم . لە دەست و پێشم، یا هەر ئەندامێك لەئەندامەکانی تری بەدەنم، بۆ ئەوە ئیستفادەم کرد کارێکی پێ بکەم کە تۆ فەرمووتە، هەروەها لە نیعمەتو ئیمکاناتێکیش کەلەم جیهانەدا لە دەسرەسما قەرارت دابوون، هەر بۆ ئەوە ئیستفادەم کرد .. وەختێ سواری ماشێن و سەیارە ئەبووم، وەختێ جلێکم ئەکردە بەر، وەختێ خۆراکێکم ئەخوارد، وەختێ لەدەواو دەرمانێ ئیستفادەم ئەکرد، وەختێ لە هەرئیمکاناتێ سوودم ئەبینی، بۆ ئەوە بوو ساغو سەلامەت بم، توانای ئەوەم هەبێ بتوانم لە ڕێگای بەندەیی تۆدا هەنگاو هەڵگرم، زیاتربەرەو پێش بڕۆم، باشتر ئەدای مەسئولیەت بکەم .

بەراستی ئینسان ڕۆژێك دێتە پێشی کە تیایدا ئەکێشرێتە مەحکەمەو دادگای خواو، لێی پرسیار ئەکرێ : چیت کردو چیت ئەکرد؟ ئەبێ هەر لەئێستاوە ئاوا بژی کە خوا ئەیەوێ تا لەو ڕۆژەدا جوابی بێ .

بەجۆرێکیتر بڵێین : ئەبێ ئیمانی بە (قیامەت) بێ . ئیمان نە تەنها بە و مانایە کە بزانێ قیامەت هەیە .. ئەوە نایێتە ئیمان، ئەگەر ئینسان دەنگو باسەکانی قیامەتو بەهەشتو جەهەننەم ئاگادار بێو بزانێ قیامەت چۆن دەست پێ ئەکاو چی تیا ڕوو ئەدا، بەهەشتو جەهەننەم

چۆنن‌و لەسەر کامیانا چی هەیەو چی نیە؟ هەموو ئەوانە بزانێ، یەقینیشی بێ، ئەوە هیچ دەردی ناخواو، پێی ناوترێ ئیمان، مەگەر شتێکی‌تر کە ئێستا بەیانی ئەکەین لەگەڵی بێ ، ئەویش بریتی‌یە لە هەست بە لێپرسراویتی (ئیحساسی مەسئولیەت)، ئەبێ ئەوە لە دەروونیا دامەزرێ . هەروەك لەپێشا وتمان، وای لێ بێت کە لە هەر یەك لەو ئیمکاناتو نیعمەتانە ئیستفادە ئەکا، لە بیری بێ کە خوا سوئالی لێ ئەکا، وەختێ ئاوا بوو بەوجۆرەی لێ دێ کە خۆی فەرموویەتی .

## پلەکانی بروا بە دواڕۆژ

بۆ ئەوەی باشتر باسی پاشەڕۆژ ڕوون بێتەوە پێویستە ئەوە بڵێین ئیمان بە ئاخیرەت سێ دەرەجەی هەیە ، لای کەمی ئەبێ دەرەجە خوارووەکەیانی بێ . ئینسان ئەگەر ئەوەی نەبوو ئیتر ئیمانی بە ئاخیرەت نیە، ئەگەر چی هەموو باسەکانی قیامەتیش بزانێ! خۆ جولەکەو گاورو ، زۆرێکی تر لە ناموسڵمانەکان ئەو شتانە هەموو ئەزانن ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا بەکەڵکیان نایەت ..پلەکانیش ئەمانەن

پلەی یەکەم : ئەوەیە ئینسان وا قیامەتی لەبەر چاو بێ کە کاتێك گوناهێك تووش بوو، کاتێ تووشی نافەرمانیەك بوو، تۆزێ دوای ئەوە بیری دادگای قیامەت بکاتەوەو بیری ئەوەی کەوێتەوە کەلە حزووری

خوادا ئەوەستێو سوئالی لێ ئەکرێ، بۆچی ئەو کارەت کرد؟ ئەگەر تەوبەی نەکردبێ لەو کارە، تووشی سزاو جەزای ئەو کارەی ئەبێ . وەختێ بیری ئەوەی کردەوە، بۆ ئەوەی گرفتاری ئەو موحاکەمە سەختە نەبێ، گرفتاری ئەو جەزاو سزایە نەبێ! زوو، بێ ئەوەی ماتڵ بێو هەلوفرسەت لەدەست بدا ، تەوبە ئەکاو پەشیمان ئەبێتەوەو دەستبەردار ئەبێ لەگوناهەکە، تەصمیم ئەگرێو بڕیار ئەدا جارێکیتر ئەو گوناهەی تووش نەبێتەوە . ئەمە خوارترین پلەی ئیمان بە قیامەتە . کە ئینسان خۆی لێرە دادگایەك بۆ خۆی بەرپا بکا، موحاکەمەی خۆی بکا، تەوبە بکا، دەست بکێشێ لەگوناهەکە .

پلەیەکی تر لەسەرووی ئەوەوە، ئەوەیە ئیمانەکەی هێندە بەهێز بێ کەلەو وەختەدا وا خەریکە گوناهەکە ئەکا هێشتا تەواوی نەکردووە، هەر لەو کاتەدا بکەوێتە بیری قیامەت، یەکسەر بێ ئەوەی گوناهەکە ئەنجام بدا دەستی لێ بکێشێو تەوبە بکاو بگەڕێتەوە .

پلەی سێیەم کە بەرزترە لەمانە : ئەوەیە ئینسان بە جۆرێ قیامەتی لەبەرچاو بێو خۆی بەمەسئول بزانێ لەبەرانبەری خاوەنەکەیەوە، کە هەرکات ئارەزووی گوناهێك ئەکەوێتە دڵی پێش لەوەی بڕیار بدا ئەو گوناهە بکا ، دادگایەك بۆ خۆی تەشکیل بداو، خۆی موحاکەمە بکاو بێ بەهۆی ئەوەی تووشی گوناهەکە نەبێت .

ئەبێ ئینسان یەکێك لەم سێ حاڵەتەی ببێ، جا ئیمانی بەقیامەت نەبێ، ئەگەر نا هەر ئەوەی کە بزانێ قیامەت هەیەو بەهەشت‌وجەهەنم هەیە دەردی ناخوا.

جا ئەگەر ئینسان وای لێ هات ئیمانی بەقیامەت پەیدا کرد ئەو وەختە ئیتر زۆر ئاسان ئەتوانێ ڕێگای بەندەیی خوا بگرێ . وەختێ وای لێ‌هات هەموو وجوودی پڕ بوو لەهەست بە مەسئولیەت‌و خۆی لەبەرانبەر خواوە بەمەسئول زانی‌و، لێی ڕۆشن بووکە ڕۆژێك لە دادگای خوادا ئامادە دەکرێ، دەبێ جوابی ئەو سوئالانە بداتەوە، ئەو کاتە ئیمانی بەدوارۆژ تەواوە.

ئەوەیە لە سورەتی فاتحەدا دوای ئەوە کە بەیانی ئەوە ئەکرێ ئەبێ ئینسان ئیمانی ببێ بە ڕۆژی قیامەت لە﴿مَالِكِ يَوْمِ الـدِّينِ﴾ دا، دوای ئەوە دەفەرمووێ : ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾. وەختێ بەندەی خوا گەیشتە ئێرە بڕیار ئەدا بەڕاستی بەندەی خوا بێ، ئەوانەی وا تا ئێرە دەگەن هەموو بەیەك زمان دەڵێن: خوایە! بۆ تۆ بەندەیی دەکەین، تەنها ڕێگای بەندەیی تۆ دەگرینە بەر، ئێمە کاتێ ئیمانمان هێنا بەوەی کە تۆ (رحمن)و(رحیم)ی، بەوەی تۆ(ساحێبی ڕۆژی جەزای)، ڕێگای بەندەیی تۆ دەگرینە بەر، ئەوە بڕیارە، تەصمیمە، عەزمە لەسەر ئەوەی ڕێگای بەندەیی تۆ بگرینە بەر، بۆیە لەژیانـدا هەرچی تۆ ئەفەرمووی ئاوا

نەکەین، (بەئیزنی خوا لەدوایيدا هەندێ لەو شتانەی پێویستە لەرێگای بەندەییدا ئینسان ئەنجامیان بدا باس دەکەین).

جا لەبەرئەوەی ئەگەر خوا کۆمەکی ئینسان نەکاو تەوفیقی نەدا ناتوانێ یەك هەنگاویش هەلگرێ، بەندەی خوا عەرزی خوا دەکا : دیارە ئەم بەندەیيە بەخۆم ناکرێ، بەندە موخلیسەکانی عەرزی دەکەن : خوایە! ئەم بەندەیيە بە خۆمان ناکرێ . ئەگەر تۆ کۆمەکمان نەکەی، ناتوانین هەنگاوێکیش هەلگرین . لەبەرئەوە ﴿وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ واتە : داوای کۆمەکیش هەرلە تۆ دەکەین . داوات لێ دەکەین ئەوەی پێویستە ئامادەی بکەی بۆمان تا بتوانین بەندایەتیت بکەین .. هەر کۆسپو گرفتێك دێتە سەر رێمان لای بەی، ئەگەر تۆ ئەوە نەکەی ناتوانین یەك هەنگاویش هەلگرین ..

تا ئێرە روون بووەوە کە ئیمان بەقیامەت ئەبێ بەیەکێك لەپایەو ئەساسە مەحکەمەکان بۆ بەندەیی، ئینسان بەبێ ئیمان بە قیامەت ناتوانێ رێگای بەندەیی خوا بگرێ . وتمان هەر لەبەرئەوەیە قورئان زۆر ئەهەمیەتی پێ داوەو زۆر باسی قیامەتی کردووە، چونکە ئینسان ئەگەر ئیمانی بە قیامەت بوو ئیتر دیارە تەنها رێگای بەندەیی خوا ئەگرێ، ئەگەر ئیمانی بەقیامەت نەبوو ناتوانێ ئەو رێگایە بگرێ، ئەگەر هەزار هەوڵی بۆ بدرێ، ئەگەریش جارجارێ بڕواتە سەر رێگای بەندەیی هەر لێی لائەدا.. ئەوەش بزانین هەر ئینسانێك چەندە تووشی گوناه دەبێ،

حەتمەن بەقەدەر ئـەوە ئیمـان بـە دوارۆژی لاوازە . کەسـێك تووشـی گوناهێك دەبێت لەو وەختەدا ئیمان بەقیامەتەکەی لاواز بووە، چونکە ناکرێ لەوکاتەدا دادگای خـوای لەبەرچـاو بـێ‌و بزانـێ مەحکەمـەی دەکرێ، خەریکی گوناهکردن بێ .

بێگومان لەو وەختـەدا قیامـەتی لـەبیر چـۆتەوە بۆیـە خەریکـە ئـەو گوناهە ئەکا. جا ئیتر هەر بەم جۆرە کەسێك زۆر تووشی گونـاه ئـەبێ ئەوە زۆر ئیمان بەقیامەتی لاوازە، کەسێك کەمتر تووشی گوناه دەبێ ، ئەوە زەعیفی ئیمـانی کـەمترە، کەسـێك زۆر زۆر ئیمـانی بەقیامـەت بەهێز بوو تووشی ئەو گوناهانە نابێت .

## پوختەیەك لە تەفسیری سورەتی (التکاثر)

خوای گەورە ئینسـان ڕائەچڵەکێنێ لە خەوی غەفڵـەت، ئاگـاداری ئەکا : وا مەزانە ئەم وەزعیەتە کە ئێستا هەیە، ئەم ژیـانی دونیایـە وئـەم بەرنامانەی ئێسـتا هـەن هـەروا تـا سـەر ئـەبن‌و، ئاڵوگۆڕێـك نابـێ . هەرئەوەنە بزانە لەناکاو ئاڵوگۆڕێکی وا ڕوویدا کە ئەم هەموو عالـەمـە تێکچوو بەسەر یەکدا، ئاخرئینسـان تەبیعەتی وایە ئەگەر ماوەیەك لەگەڵ شتێکا بوو، خووی پێوە دەگرێ‌و وادەزانێ ئەو شتە هەر لەبەین ناچێ، وا دەزانێ ئیتر وەزعیەت تاسەر هەروا دەبێ . ئینسـانێك دڵ خۆش دەکا بەم دونیاو ماڵ‌وسەروەت‌ونیعمەت‌وئیمکاناتەی لە دونیادا هەیـە . کـەم

کەم وای لێدێت لەبیری دەچێتەوە ڕۆژێك دێتە پێشەوەکە ئەمە تەواونەبێو لەبەین نەچێو، ئینسان ئەبێ بڕوا جوابی ئەو سوئالانە بداتەوە لەپێشا باس کران . ئینسان غافڵ دەبێ لەوەی ڕۆژێکی ئاوا لەسەرە ڕێیایەتی .

بۆیە پێویستە بێدار بکرێتەوەو لەم خەوی غەفڵەتە دەربێ ، ئاگادار بکرێ کە وا ئیمو هەروا تاسەر نابێ، ئەم بەرنامەیە تێکدەچێ بەیەکاوئەم عالەمە نامێنێ و وەزعیەتێکیترو عالەم و زروفێکیتر دێتە پێشەوە کە وەك ئەمە نیە . زۆرێك لەئایەتەکانی قورئان باسی ئەوە دەکەن بەینێکیتر لەناکاو ئەم دونیایە تێك دەچێ بەسەر یەکدا، ئەوەی ئێستا ئەیبینین ئەڕوخێ ولەبەین ئەچێ .. دوای بەینێك ئینسان زیندوو دەکرێتەوە بۆ ئەوەی موحاکەمەی بکرێ .

لەسوورەی (التکاثر)دا ڕوو دەکاتە ئەو خەڵکەی وا غافڵ بوون لەمەسئولیەتیانو، قیامەتیان لەبیرچۆتەوە و، پێیان ئەڵێ : قیامەتێك هەیە و ڕۆژێك دێتە پێشەوە کە ئینسان ئامادە دەکرێ لەدادگای خواداو سوئالی لێ دەکرێ : چۆن ئیستفادەت کرد لەو نیعمەتانەو چۆن ئەت کرد؟ ئەوانەی وایان لێ هاتووە کە ئیمکاناتو نیعمەتەکە خۆی بووە بە هەدەف بۆیان! لەبیریان چۆتەوە ئەم نیعمەتانە بۆ ئەوە دراون ڕێی خوایان پێبناسن و ڕێی خوایان پێ هەڵبژێرن، کەچی خۆیان بوونەتە هەدەف بۆیان . ڕوویان تێ دەکاو دەفەرموێ :

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

﴿ أَلْهَاكُمْ التَّكَاثُرُ (١) حَتَّى زُرْتُمْ الْمَقَابِرَ (٢) كَلاَّ سَوْفَ تَعْلَمُونَ (٣) ثُمَّ كَلاَّ سَوْفَ تَعْلَمُونَ (٤) كَلاَّ لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ الْيَقِينِ (٥) لَتَرَوْنَّ الْجَحِيمَ (٦) ثُمَّ لَتَرَوْنَّهَا عَيْنَ الْيَقِينِ (٧) ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنْ النَّعِيمِ (٨) ﴾

واتان لێ هاتووە هەرکەس هەوڵ دەدا بۆ ئەوەی لەوی تر زۆرتری دەست کەوێ، خەریکن کێبەرکێ دەکەن . ئەم هەوڵ ئەدا بۆ ئەوەی پلەوپایەی بەرزتربێ لەو، ئەو هەوڵ دەدا بۆ ئەوەی سەروەتی زیاتر بێ لەم . تووشی ئەم دەردە بوونو هەر کەس هەوڵ دەدا لەوی تر زیاتری بێ؟

ئایا لەبیرتان چۆتەوە کە : تا نیعمەتو ئیمکانات زیاتر بێ مەسئولیەت زیاترە؟

ئائەمە ئێوەی سەرگەرم کردووەو غافڵی کردوون لە مەسئولیەتێك کە هەیە، لەسەرەنجامێك کە لە سەرەڕێتاندایە . تووشی غەفڵەت بوونو لە مەسئولیەت غافڵ بوون، هەروا چوونەتە پێشەوە تا کاتی مەرگ، تا وەختێ دیدەنتان کردووە لە قەبرەکانتان، ئەمە غافڵی کردن وسەرگەرمی کردن تا چوونە ناو قەبرەکانتانو دیدەنتان لێ کردن (یانی تا کاتێ کە مردن).

﴿ أَلْهَاكُمُ التَّكَاثُرُ حَتَّى زُرْتُمُ الْمَقَابِرَ ﴾ یانی : ئەی ئەوانەی واخەریکی زۆرتر بەدەست هێنانی ماڵو سەروەتی دونیاو مەقامو ئاوازەو شۆرەتی دونیان! ئەوە بۆ واتان لێ هاتووەو مەسئولیەتتان لەبیر چۆتەوە؟ بۆ واتان لێ هاتووە هەر خەریکی زیاتر بەدەست هێنانن؟ بۆ لەبیری ئەوەدا نین هەر کەس نیعمەتونیمکاناتی زیاتر بوو مەسئوولیەتی زیاترە؟ ئەوەتان کردووە بەهەموو بەرنامەی خۆتان کە زیاترتان دەست کەوێو، هەر ئاوا ژیانتان بەسەر برد تا مردنو چوون بۆ ناو قەبرەکانتان .

﴿كَلاَّ سَوْفَ تَعْلَمُونَ . ثُمَّ كَلاَّ سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾ سەرزەنشت دەکا، تەوبیخ دەکا، دەفەرموێ : نا، نا، وامەکەن، بەسیەتی . دەست بکێشن لە غەفڵەت . بەسە ئیتر کەم کارو پیشەتان هەر ئەوەبێ لەیەکتر زیاترتان دەست کەوێ . بەبێکی تر دەزانن دەنگوباس چیە؟ بەبێکیتر بۆتان ڕۆشن دەبێتەوە کە چ خەبەرە؟

﴿ كَلاَّ ﴾ نەخێر، مەکەن . دەست بکێشن لەم کارە ﴿ لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ الْيَقِينِ ﴾ ئەگەر بتان زانییایە – زانینێ کە بەڕاستی زانین بێ– ئەگەر لێتان ڕۆشن بوایە کە چ سەرەنجامێك لەسەر ڕێتانایە، ئاواتان نەدەکرد. یانی : ئەوە بۆ غافڵن؟ بۆ لەبیری ئەوەدا نین ڕۆژێك دێتەوە پێشەوە و پرسیارتان لێ دەکرێ چیتان کردوچیتان نەکرد؟ بۆ هەروان لەبیری ئەوەدا زیاترتان دەست کەوێ؟!

﴿ لَتَرَوُنَّ الْجَحِيمَ ﴾ قەسەم بەخوا ئەو ئاگرە بەتاوە –کە بەسەختی هەڵگیرساوە– ئەیبینن . سەرەتا لەدوورەوە ئەیبینن .

جا دوای ئەوە ﴿ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ الْيَقِينِ ﴾ : دوای ئەوە نزیکی دەکەونەوەو وا دەیبینن کە هیچ دوودڵیەکی تیا نەبێ، بە چاوی یەقین ئەیبینن، بەتەواوی لاتان ڕۆشن دەبێتەوە کە ئەوە ئاگری جەهەنەمەو ئامادەکراوە بۆ کەسانێکو لێی دەرناچن .

﴿ ثُمَّ لَتُسْأَلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ النَّعِيمِ ﴾ جا لە ئاوا ڕۆژێکداو لە ئاوا وەزعیەتێکدا پرسیارتان لێ دەکرێ لەبارەی نیعمەتەکانەوە، کە ئەو هەموو نیعمەتو نیعمەتانە لەبەردەستاندا بوو چۆن سوودتان لێ بینی؟

(کەی ئەم پرسیارانە دەکرێن ؟ ئەو کاتەی کە سورەی (زلزلة) باسی ئەکا ، بۆیە پێویستە باسێکی ئەو سورەیەش بکەین) .

## پوختەیەك لە تەفسیری سورەتی (الزلزلة)

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

﴿ إِذَا زُلْزِلَتِ الأَرْضُ زِلْزَالَهَا (١) وَأَخْرَجَتِ الأَرْضُ أَثْقَالَهَا (٢) وَقَالَ الإِنسَانُ مَا لَهَا (٣) يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا (٤) بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا (٥) ﴾ :

کاتێك زەوی هێنرایە لەرزە، ئەویش چ لەرزەیەك، نەك وەك ئەو زەوی لەرزانەی ئێستا ڕوودەدەن ، هەر کام لەگۆشەیەکو لەلایەك، وەختێك زەوی بەهەموو وجودیەوە هێنرایە لەرزە و، هەرچی باری سەنگینی هەیە کە لەناویایەتی هەمووی دەردایە دەرەوە- وەك چۆن گەنمێك لە بێژەنگ دەدرێو ئەگەر شتێکی گەورەتر لەگەنمەکان وەك زیخ و بەرد تیایدا بوو دەکەوێتە سەرەوە، تا ئەو شتانەی لەزەویدان کەوتنە سەرەوە - کاتێك وەزعەیەتێکی ئاوا ڕوویدا کە ئینسان چارەزێی نیە، سەرسام ئەبێ و ئەپرسێ : ئەرێ ئەو زەوییە چیەتی؟ ئەوە بۆ وای لێ هاتووە؟

ئاخر بۆیە ئەو پرسیارە ئەکا چونکە لەوەو پێش ئەگەر زەلزەلەیەك ڕووی بدایە، شتێکی سادە و بچکۆلە بوو.. لەوانە بوو دەزگاکانیان دەیانتوانی پێشبینی بکەن . دەیانزانی کە دەساڵی تر و بیست ساڵی تر و سی ساڵی تر، لەفلان شوێنا زەمین لەرزە ڕوو دەدا. بەلام ئەمە لەوانە نیە . لەگەڵ ئەو هەموو ئیمکانات و دەسەلاتەی ئینسان لەدەستیدایە بۆ

پێشبینی ئەو ڕووداوانە کە لە دوایـا ڕوو دەدەن، نـەیتوانیوە پێشـبینی ئەمە بکا، چونکە ئەمە لەو ڕووداوانـە نیـەو شـتێك نیـە وەك ئەوانـەی لـەوەوپێش، ئەوەیـە ئینسـان سەرسـام وحـەیران وسـەرگەردان دەبـێ ودەترسێ ودەپرسێ : ئەرێ ئەوە چیەتی؟ ئەوە چی لێ قەوماوە؟

﴿ يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ (٦)﴾ : ڕۆژێك ناوا بوو خـەلکی دەسـتە دەسـتەو لەملاولـەولا دەردێـن لـە قـەبرەکانیان بـۆ ئەوەی کردەوەکانیان پیشـانیان بـدرێن وبخرێنـە بەرچـاویان، هەرکـەس شریتی ژیانی خۆی بۆ لێ دەرێتەوەو سەیری فلیمـی ژیـانی خـۆی بکـا، سەیر دەکا بەتەواوی فلیمی ژیانی خۆی تۆمار کـراوە، بەهـەموو بیرو عەقیدەو قسەوکردەوەیەوە، هەرچی‌یەك کە بوویەتی لە زەمانێکـا تـاقی کراوەتەوە، هەمووی بۆ لـێ دەدرێتـەوە تـا سـەیری بکـا بزانـێ چـی کردووەو چی نەکردووە؟ جا نەتیجە ئەمە دەبێ :

﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَـرًّا يَرَهُ (٨)﴾ : هەرکەسێ بەقەد تۆزێك کاری چـاکە بکـات ئەیبینێتـەوە، هەرکەسێکیش بەقەدەر تۆزێ کاری خراپە بکات ئەیبینێتەوە..

هەرکەسـێك بیکـات نـەك کردبێتـی؟! ئەگـەر ئینسـانێك لـەکاتی نەزانی‌و نەزان کاریدا گوناهێك تووش بوو بێـت، بـەلآم زوو تەوبـەی کردبـێ‌و گەڕابێتـەوە، ئـەوە خـەتی بەسـەرا کێشـراوەوئیتر نیشـانی نادرێتەوەو سەرکوت ناکرێت بەوەی کە ئـەوەت کـردو وات کـردا!

چونکە تەوبەی کردووەو تەواو بووەو لێی قبوول کراوە . نەك ئـەوەی کـە هەرکـەس شـتێکی کردبـێ نیشـانی دەدرێتـەوەو دەیبینێتـەوە . ئـەخێر، لەفەرموێ : (هەرکەس شتێك بکا) یانی: (هەرکەس کردبێتی بەبەرنامە بۆ خۆیەو، کردبێتی بەکارو پیشـەی خـۆی کـە کـاری خێـر بکات) نەك لەدەسـتی دەرچـێ! ئـاخر کـاتی وایـش هەیـە کافرێـك، ناموسڵمانێك ،کارێکی خێر دەکات، بـەڵام لـە دەسـتی دەردەچـێت، وەك چۆن کاتی وا هەیە ئینسانێ کە خوێندەواری نیە کەسێك یارمـەتی دەدات دووخەت، سێ خەت لەکتێبێك دەخوێنێتەوە، بەڵام لە دەسـتی دەرچووە، ئەوەی خوێندۆتەوە، ئـەوە بـۆی هەڵکـەوتوە . ئەگـەر نـا خوێندەواری نیە، یا ئـەو ناموسـڵمانە کـە کـارێکی خێـری کـردووە، لەدەستی دەرچووە کردوویەتیو تـەواو بـووە، بـەڵام نـەبووە بـەکارو پیشەو بەرنامە بۆی .. ئـەوەی کـە بەرنامەیـەتی کـارە خراپەکانیـەتی . ئەوەیە کە دەیبینێتەوە!! هەروەها ئینسـانی مـوئمینیش ئەگـەر کـارێکی خراپ بکات، لەدەستی دەردەچـێ، چـونکە دڵـی دامـەزراوەوئیمانی دامەزراوە، بڕیاری لەسەر ئەوەیە بە ڕێی خوادا بڕوا، ئەگـەر کـارێکی خراپـی کـرد لەدەسـتی دەرچـووە، بۆیـە زوو تەوبـەی لێ دەکـاو دەگەڕێتەوەو نایێ بەبەرنامە بۆیو نایێ بەکارو پیشەی هەمیشە بۆی .

کەوابوو کارە خراپەکەی خەتی بەسـەردا دەکێشـرێتو نایبینێتـەوە، ئەوانەی کە بوون بە بەرنامە بۆی تەنها ئەوانەیان ئەبینێتەوە .

دیـارە هەر کـەس هەرچـیـیەك نەبینێتـەوە جـەزاو پاداشتەکەشـی وەردەگرێ. جا لێرەدا شتێك ڕۆشن دەکەینەوە کە زۆر گرنگەو دەبێ زۆر لەبەرچاو بگیرێو دیقەتی تیا بکرێت:

- ئیمان کاتێك ئیمانەو لای خوا نرخی هەیە کـە دامـەزراییو لـەدڵا جێگیر بووبـێ. ئەگـەر ئینسـان لـە ڕۆژێـك لـە ڕۆژانـا ئیمـانی بـوو بەئاخیرەت، یا ئیمانی بوو بە خوا بۆ چەند سەعاتێك ئەوە لەدڵیا بـوو، بڕێ کاری باشی ئەنجام دا، بەڵام دوایی ئیمانەکـە لـە دڵـیا دەرچـوو، پاش بەینێکیتر دووبارە هاتوو هەم لەدڵی دەرچوو، ئەوە نایێتە ئیمـانەو بەهیچ بۆی حساب ناکرێت! کاتێك بە ئیمان بەوی حیسـاب دەکـرێ جێگیر بووبێ لەدڵیا، جا بۆ ئەوە غونەو وێنەیەك بێنینەوە تا باش ڕۆشن بێتەوە:

- منداڵێك دەچێتە قوتابخانـە، یەکـەم ڕۆژ وا دانـێین ئـەلف و بێـی پـێ دەوترێ. (ئەلف، بێ، تـێ ) ئەوانـەی پـێ دەڵـێنو ئـەویش فێریـان دەبێت. بەڵام ئەگەر چەند جارێك هەر لەوکاتەدا لێکـراری نەکەنـەوە بۆیو پێی نەڵێنەوە، لەبیری دەچێتەوە، دوایش کە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە ئەگەر لەو شەوەو لە ڕۆژی دوایدا کە دەگەڕێتەوە بۆ قوتابخانـە چـەند جارێکیتر نەیخوێنێتەوە، لەبیری دەچـێتەوە، هـەروەها ڕۆژی دواتـریش ئەبێ هەم دەوری بکاتەوە، دوای ئەوەش هەرچـەند ڕۆژ جارێـك ئـەبێ دوبارەی بکاتەوە.. لە سـەرەتاوە دوو ڕۆژ جارێـك، دوایـی سـێ ڕۆژ

جارێك، دوای بەینێك چوار ڕۆژ جارێـك، دوایـی هەفتـەی جارێـك، دوای بەینێ مانگی جارێك، ئەگەر دەوری نەكاتەوە لەبیری دەچێتەوە، بەڵام دوای بـەینێك وای لێ دێـت لـەدڵیا جـێگیر دەبـێ، بەشـێوەیەك هەرگیز لـەبیری ناچـێتەوە. وەك ئێمـە ئێـستا (ئـەلفـو بـێ) دەزانـین وهەرگیز لەبیرمان ناچێتەوە.

جا كاتێك وای لێ هات كـە هـەر لـەبیری نەچـێتەوە، ئـەو وەختـە دەڵێن ئەمە (ئەلفـو بێ) دەزانێت، ئەگەر وانەبوونـەوە ڕۆژانـی یەكـەم شتەكە جێگیر نەبووە لـە دڵیـاو ڕەنگـە لـەبیری بچێتەوە. ئـەوە پێـی ناوترێ (ئەلفـو بێ) دەزانێ .

/ نموونەیەكی تر: كەسێ دەچـێتە لای خـەیاتێك (بـەرگ دروویـەك) شـاگردی دەكـا، لـەدوای بـەینێك وای لـێ دێـت لـە ژێرچـاودێری خەیاتەكەدا دەتوانێ بەعزێ شت بدورێ، بەڵام نەك بە جۆرێ كە ئـیتر بیری نەچێتەوە، تا وەستاكەی بە ڕاسەریەوە بێ، یا لە چـەند سـەعاتێكا لە بیرپایەتی و دەتوانـێ شـتێ بـدورێ، بـەڵام ئەگـەر سـێ چـوار ڕۆژ بەینی‌كەوتـەو خەریكی خەیاتی نەبوو، لەو بەینەدا لە بیری چۆتەوەوئـیتر نازانێ جارێكی ترئەو لیباسە بدورێتەوە . ئائەوە پێی نـاوترێ خـەیات . بەكەسێك دەوترێ خەیات بەجۆرێك فێربووبێت كە لەبیری نەچـێتەوە، ئەگەر دەساڵیش خەیاتی نەكات، دوایی هەركات ویستی خەیاتی بكـا، بزانێو بتوانێ .. ئائەوە پێی ئەوترێ خەیات، هەروەها ئەگەر ئینسـانێك

کە خوێندەواری نیە ئەگەر داینێ کتێبێکی بۆ بخوێنێتەوە، پێی ناوترێ خوێندەوار. لەوکاتەدا کە پێی دەڵێی، دەیخوێنێتەوە، بەڵام خۆ دوای ئەوە ئەگەر داوای لێ بکەیت دووبارەی بکاتەوە ناتوانێ . دەی ئەوە پێی ناوترێ (خوێندەوار)، ئەگەر یەك کتێبیش بخوێنێتەوە. مەسەلەی ئیمانیش بەم جۆرەیە .

ئیمان ئەوەیە بە ڕادەیەك جێگیر بووبێ لەدڵدا کە ئەگەر خاوەنی لەت و پەتیش بکرێ لەسەری، ئەو ئیمانە لە دڵیا دەرنەچێ، جا ئەگەر ئینسان ئیمان لە دڵیا ناوا جێگیر بوو، ئیتر یا هەرکاری خراپ ناکا، یا ئەگەر کردی لە بەرئەوەی ئیمان لە دڵیایەتی دوای چەند ساتێ پەشیمان دەبێتەوەو تەوبە دەکار دەست دەکێشێ، هەروەك خوای گەورە دەفەرمووێ : ﴿يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ﴾ زوو، ناهێڵن زۆری پێ بچێ تەوبە دەکەن و دەگەڕێنەوە.

## پوختەیەك لە تەفسیری سورەتی (القارعة)

بەڵێ، هەروا نابێ، وەزعیەت هەروا درێژەی نابێ، ڕۆژێك دێتە پێشەوە کە هەموونەم جیهانە بڕوخێ بەسەر یەکا ..

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

﴿ الْقَارِعَةُ . مَا الْقَارِعَةُ ﴾ ئەوشتەی وا دەکوتێ بەسەر یەکا، جا چوزانی! چی بە تۆی نیشان داوە،؟ چی تۆی فێر کردووەو وای لێ

کردووی کە بزانی چیە ئەوشتەی وا دەکوتێ بەسەر یەکا؟!! هیچێك نەبووە!

﴿ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ ﴾ چ شتێك وای لێ کردووی بزانی ئەوە چی‌یە؟ هیچ! تا ئێستا لە هیچ لایەکەوە ئەو ئاگاداریەت بۆ نەهاتووە. نەتزانیوە چیە ئەوەی وا دەکوتێ بەسەریەکاو شتەکان وێران دەکا بەسەر یەکا. جا مادام نازانی گوێ ڕاگرە باخۆمان بۆتی بەیان بکەین:

ئەوە ڕووداوێکە لەسەرەتای قیامەتا ڕوو دەدا، ئەو کورەی زەمینە ئەکوتێ بەسەریەکاو وێرانی دەکاو تێکی دەدا بەسەریەکا.

﴿ يَوْمَ يَكُونُ النَّاسُ كَالْفَرَاشِ الْمَبْثُوثِ. وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ الْمَنفُوشِ ﴾ ڕۆژێك کە خەلکی وەك پەپوولەی پرژێنراو وان. (کاتێ هەندێ پەپولە بەسەر درەختێکەوە دەنیشنەوە، ئەگەر کەسێك بڕوا هەلیان فڕێنێ، چۆن دەچن بەناو یەکاو ئەپرژێن و بەملاوبەولادا دێن و دەڕۆن).

کاتێ فەرمان لەخواوە دەردەچێ بۆ ئەوەی ئەم عالەمە تێك بچێ، ئەم زەوی‌یە وا لێی دەدرێ کە ئینسانەکان ئەپرژێن و بە ئاسمانەوە دەچن بەناو یەکا، هەروەك ئەو پەپوولانە کە چۆن دەڕۆن بەناویەکا. ئەو کێوانە- کە ئاوەها توندو مەحکەم داچەقێنراونو زەویان مەحکەم کردووە، بەوگەورە یی و مەحکەمی‌یە- لەو ڕۆژەدا وەك خوری‌یەك کە ڕەنگین بێ و تێك ئاڵابێ و بە یەکا شێوابێ، ئاوایان لێ دێ .. ئەو

کێوانە هەیانە خاکەکەی سوورە، هەیانە ڕەشە، هەیانە سپییە، لەو ڕۆژەدا تێکەڵ دەبن بەیەکا، وەك خورییەکی ڕەنگاوڕەنگ یێ تێك ئاڵا یێ بەیەکا . ئەو ڕوداوەیە کە ئاوا دەکا.

ئەوکاتە چی دەبێ؟!

﴿فَأَمَّا مَنْ ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَاضِيَةٍ﴾: جا کەسێك کەکردەوەکانی دەکێشرێن ، ئەگەر سەنگین بوون ئەوە لەژیانێکایە ئەوەندە پەسەندو باشە، کە ژیانەکە خۆی لەخۆی ڕازییە!! وەك چۆن کەسێك بێت بە خزمەتگوزاری کەسێك، ئەگەر گەورەکەی لێی ڕازی بوو خۆیشی لەخۆی ڕازییە، خۆیشی دڵی بە خۆی خۆشە، وەك چۆن مەسەلەن ژنێك ئەگەر مێردەکەی لێی ڕازی بوو خۆیشی دڵی بەخۆی خۆش دەکا، زۆری پێ خۆشە خۆیشی لەخۆی ڕازی دەبێ چونکە مێردەکەی لێی ڕازییە، ئەو ژیانەش ئاوایە کە خۆیشی لەخۆی ڕازی دەبێ!! لەبەرئەوەی هیچ کەمو کوڕییەکی تیانیە . ئەخەفەتی تیایەو ئەترس. چونکە ئینسان هەرئاواتێکی بێ پێی دەگا، هەرچیەکیشی دەست دەکەوێ لەدەستی دەرناچێ . خەفەتی نیە، چونکە هەموو ئاواتەکانی دێنە جێ، ترسیشی نیە، چونکە هیچێك لەوانەی پێی دراون لەدەستی دەرناچێ.

بەڵام کێن ئەوانەی کردەوەکانیان سەنگینن لەتەرازووی خوادا؟ ئەوانەن وا ئیمانەکەیان جێگیر بووبێ، بەوجۆرەی لەمەوپێش ڕوونمان

کردەوە . ئەوانەن دڵیان دامەزراوە. هەروەك وتمان ئەگەر کەسێك ئیمانی دانەمەزراوبێ، جارێك کردەوەیەکی چاكیش ئەنجام بدا، لەبەرلەوەی دانەمەزراوە سوودی نیە بۆی، هەروەك دەفەرموێ: ﴿وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَنْثُوراً﴾ : زۆرێك لەو ناموسڵمانانە کردەوەی باشیشیان هەیە، بەڵام لەبەرئەوەی کردەوەکانیان هاوکات لەگەڵ ئیمانی دامەزراو نەبووە، خوا دەفەرموێ : دەڕۆینە پێشەوە بۆ کردەوەکانیان، وردوخاشیان دەکەین بەسەریەکدا، وەك تۆزی پەژاو.. چونکە ئیمانی لەگەڵ نەبووە. ئاخر کردەوە خۆ زاهیرو ڕواڵەتەکەی حساب نیە . ئەگەر ئینسانێك هەزار نوێژ بکا، لەبەر خوا نەبێ، بە ئیمانەوە نەبێ، دەردی ناخوا. هەر کردەوەیەك دەبێ ڕوحێکی ببێ ، ڕوحەکەشی بریتیە لەو ئیمانە دامەزراوەو لەو ئیخلاسەو لەبەر خوا کارکردن.. کەسێك ئیمانی دامەزراو بوو، کردەوەکانی لەمیزانی خوادا سەنگینیان هەیە، ئەوە لە ژیانێکدایە کە ئەومندە لە ژیانەکەی ڕازییە، ژیانەکەش خۆی لە خۆی ڕازییە ..

﴿ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ ﴾: بەڵام کەسێك کردەوەکانی سووك بوون، ئەوە دایکی بریتییە لە شتێکی داکەوتوو، شتێکە وا لەخواری خوارەوە، ئەو دایکەی وا ئەیگرێتە باوەشی و هەڵی دەگرێ، چاڵێکی قووڵی جێگایەکی داکەوتووە ونزمە و لەخوارەوەیە . ﴿ وَمَا أَدْرَاكَ مَاهِيَهْ ﴾ جا چ شتێك تۆی وا لێ کردوە کە بزانیی و پەی بەری

بەوەی ئەو (هاویة)یە، ئەو قووڵایی‌یە، ئەو شتە داکەوتووە لـەخوارەوە، چی‌یە؟ ﴿ نَارٌ حَامِيَةٌ ﴾ ئەوە ئاگرێکی زۆر زۆر داغە . ئەوە دایکەتی، ئەوە ئەیگرێتە باوەش‌و ناهێڵێ لە باوەشی بێتە دەرەوەو ڕزگاری بێ !!

## پوختەیەك لە تەفسیری سورەتی (الانفطار)

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الـرَّحِيمِ ﴿إِذَا السَّمَاءُ انفَطَرَتْ (١) وَإِذَا الْكَوَاكِبُ انتَثَرَتْ (٢) وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ (٣) وَإِذَا الْقُبُورُ بُعْثِرَتْ (٤) عَلِمَـتْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ وَأَخَّرَتْ (٥)﴾:

کاتێك ئاسمان لەت بوو، ئەو ئاسمانە بـەو هـەموو مەحکەمی‌یـەوە . دیارە ڕووداوەکە زۆر سەنگینەو زۆرقورسە کە ئاسمانی پێ لەت دەبێ ( کاتی هاتنی قیامەت).. کاتێك ئەستێرەکان پرژوبڵاو بوونەو لـەجێگای خۆیـان هەڵکـەنران. کاتێـك کـە بـەحرەکان، دەریاکـان، تێـك دران بەیەکداو ئەو زەوییانەی لەبەینیانـدان لـەت کـران بـەجۆرێك ئـاوی بـەحرەکان هـەموو تێکـەڵاوی یـەك بـبن.. کاتێـك قـەبرەکان هەڵوەشـێنرانەوە بـەجۆرێك هەرچـیەك تیایانداپە خرایە دەرەوە.. لـە ناوەها کاتێکدا هەرکەسێك دەزانێ چ شتێکی لـەژیانی خۆیـا ئـەنجام داو، چ شتێکیشی خستە شوێن خۆی.. دەزانێ تاکاتی خـۆی زینـدوو بوو چی کردو چی نەکرد؟ دوای خۆیشی چ ڕەوشـت‌و بەرنامەیـەکی

جێهێشت بۆ خەڵکیترکە لەسەری بڕۆن؟ جا دەیزانی، تەنها هەر زانین نی‌یە؟!

بەڵێ (عَلِمَتْ): دەیزانێ بۆ ئەوەی جەزاکەی وەربگرێتەوە، ئەگەر لەژیانیا کاری باشی کردبێ بەئیمانی دامەزراوەوە، لەشوێنی خۆی ڕەوشتی جوانی جێ هێشتبێ ، جەزای باشی دەست دەکەوێ . هەروەها ئەگەر لەژیانیا کاری خراپی کردبێ ، یا کاری باشی کردبێ، بەڵام نەك بە ئیمانی دامەزراوەوەو ڕەوشتی خراپی جێ هێشتبێ لە شوێن خۆی، ئەویش جەزای خراپی خۆی وەردەگرێتەوە.

﴿ يَاأَيُّهَا الإِنسَانُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ الْكَرِيمِ (٦) الَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّاكَ فَعَدَلَكَ (٧) فِي أَيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ (٨) ﴾ ئەی ئینسان!! زۆر سەرزەنشتو لەومەیخی تیایە . تۆ ئینسانی!! دەبوایە ئینسانیەتی خۆتت بپاراستایە . دەبوایە ئینسانیەتی خۆتت لە دەست نەدایە ..

ئاخر ئینسان بۆ ئەوە بوو بە ئینسان ڕێگای بەندەیی خوا بگرێ . خۆی نەخەڵەتێنێ . شتێك نەیخەڵەتێنێو لەڕێی خوا لای بدا!.. ئەی ئینسان! (وەك کەسێك بەناو عالمی دینە بەڵام بە عیلمەکەی کار ناکا ، پێی ئەوترێ : ئەی عالمی دین!! ئەوە چی دەکەی؟! سەرزەنشتی دەکرێ)..

ئەی ئینسان! ئەوە چی تۆی هەڵ خەڵەتاندووەو وای لێ کردووی لەبیرت چۆتەوە تۆ لەبەرانبەری خاوەنەکەتەوە، (ئەو خاوەنە بەڕێزەی

ئەو هەموو چاکەیەی لەگەڵ تۆ کردووە کە باسیان دەکرێ) قەرارت گرتووە، چی لەبیری بردویتەوەو هەڵی خەڵەتاندووی؟ لەبیرت نەماوە کە تۆ لەگەڵ خاوەنەکەت مامەڵە دەکەی؟ ئەو خاوەنە بەرێزەی هەر وەصفێك شایان بێ ، هەیەتی؟ ئەوەی تۆ بتەوێ لە نیعمەتو ئیمکانات بۆی ئامادە کردووی؟ ئەوەی کۆسپو گرفت بێت لەسەر رێت لای داوە..

رۆژێکی داناوە بۆ ئەوەی ئەگەر کاری باش بکەی جەزاو پاداشتی باشت پێ بداتەوە، ئەگەر کاری خراپ بکەی پاداشتی ئەوەشت پێ بداتەوە. ئەو خاوەنەی بەرنامەی ژیانت بۆ دەنێرێو بۆت رۆشن دەکاتەوە دەبێ چی بکەیتو چی نەکەیت؟ ئەو خاوەنەی ئەگەر رێگای بەندەییت گرت کۆمەکت دەکاو بۆت فەراهەم دەکاو بۆت رێك دەخا.. ئەو خاوەنەی دروستی کردیت . پاشان رێکوپێکی کردی ، بەپێی ئەو نەخشەیەی لای خۆی رژاندبووی بۆت . چ نەخشەیەکی رژاند بۆت کە چۆن دروستت بکات، ئاوا رێك دروستی کردی .. وا دروستی کردی هیچ لایەکت زیانی بۆ ئەو لاکەی ترت نەبێ . تەوازونی بۆ دروست کردی . (ئەمە پێویستی بە روونکردنەوە هەیە): بەم مەعنایە:

واتە: وای خەلق نەکردی رۆحت زەرەر بگەیەنێت بە لاشەت، وای خەلق نەکردی لاشەت زەرەر بگەیەنێت بەرۆحت .. وای خەلق

نەکردی چاوت کاتێك خەریکی سەیرکردنی مەخلوقاتی خوابێ زیانی بگەیەنێ بەدڵت، یا بەگوێت. وای خەلق نەکردی کاتێك گوێت بیەوێ بەرنامەی خوا وەرگرێ زەرەرێ بگەیەنێت بەچاوت، یا بەدڵت. وای خەلق نەکردی دڵت زەرەرێك بگەیەنێ بەئەندامانی‌تر، بەجۆرێك خەلقی کردی هەموو ئەو شتانەی پێی داوی هاوکاری یەك بن‌و کۆمەکی یەکتر بکەن.. خوای گەورە وا دروستی کردی، تەوازونی پێ دای، وای خەلق کردی هەرچی‌یەکی پێ داوی ئەرکی خۆی ئەنجام بداو نەبێتە کۆسپ لە ڕێی ئەوانی تردا..

لە ڕواڵەتێکدا کە خۆی ویستی بەوجۆرە پێکی هێنای، ئاوا ڕێکی خستی .. ئەگەر بیویستایە بەجۆرێکی تریش خەلقت بکا وای لێ ئەکردی، هەموو شتێکت لەدەست ئەودایە، بەویست‌و بە ئیرادەی ئەوە، ئەوەیە (أحسن تقويم).

دەی تۆیەك کە ئاوا خاوەنێکت هەیە، ئاوای لێ کردووی، چۆن دەبێ بخەڵەتێی؟ چۆن دەبێ گوێ ڕاگری بۆ دوژمنی خواو بۆ شەیتان کە مەسئولیەتەکەت لەبیر بەرنەوەو لە ڕێگای بەندەیی لات بدەن ؟ .

جا تەنها وردبوونەوە لەمە، ئەبێ بەس بێ بۆ ئەوەی ئینسان داچڵەکێ‌و ڕێگای خوا بگرێ . ئەو خاوەنەی ئاوا بەرێزو کەریمە . ئەو خاوەنەی بەو جۆرە خەلقی کردووە، ئەشتوانێ ڕۆژێ لەرۆژان زیندووی بکاتەوەو پرسیاری لێ بکا، دەی زۆر بەجێیە ئینسان هەرکات

ئەمەی بیست (ئیحساسی مەسئولیەتو ئەرك ناسین) هەموو گیانی داگیر بکاو، ڕێگای بەندەیی بگرێ، بەڵام ئایا خەڵکی ئاوان؟ ئایا ئینسان ئاوایە؟!

﴿ كَلاَّ بَلْ تُكَذِّبُونَ بِالدِّينِ (٩) ﴾ نەخێر، زۆر گومڕاترو خەڵەتاوترن لەوەو بیر ناکەنەوە. (ڕوو دەکاتە ئەوانەی غافڵ بوونو خەڵەتاون). ئەو باسە بە درۆ ئەژمێرن، دەڵێن : درۆیە کە ڕۆژێك بێتو ئینسان لەو ڕۆژەدا جەزای کردەوەکانی خۆی ببینێتەوە، بەڵام دڵنیا بن جەزای ئائەو بەدرۆخستنەوەو باوەڕ پێ نەکردنە دەبیننەوە .

﴿ وَإِنَّ عَلَيْكُمْ لَحَافِظِينَ (١٠) كِرَامًا كَاتِبِينَ (١١) يَعْلَمُونَ مَا تَفْعَلُونَ (١٢) ﴾: باش بزانن هەندێ مەئمور مەسئول کراون بەسەرتانەوە، بەباشی مەئموریەتی خۆیان ئەنجام دەدەن، بەباشی پارێزگاریتان لێ دەکەنو چاودێریتان دەکەن . هەرچییەك ئێوە ئەیکەن پێی دەزانن،و هەرچییەك پێی دەزانن دەینووسن، جا دوایی ئێمەش لەسەر ئەو ئەساسەو بەپێی ئەوە، پاداشتو جەزاتان دەدەینەوە . کە بەم جۆرە دەبێت :

﴿ إِنَّ الأَبْرَارَ لَفِي نَعِيمٍ (١٣) وَإِنَّ الْفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٍ (١٤) يَصْلَوْنَهَا يَوْمَ الدِّينِ (١٥) وَمَا هُمْ عَنْهَا بِغَائِبِينَ (١٦) ﴾ : بەڕاستی ئەوانەی چاکە کارن، ئەوانەی وا ئیمانیان دامەزراوە، کارو پیشەیان کاری چاك ئەنجام دانە، ئەوانە لە نیعمەتو خۆشبەختیەکدان کە وەسفو سەنای

هەر ناکرێ، مەگەر لەو وەختەدا ئینسان لێی حالی بێت کە چی‌یە؟
ئەوانەش کە (فاجر)ن، ئەوانەی لە سنووری بەندەیی دەرچوون (وەك ئەوەی بەندایەتی حەوشە وحەسارێك بێت‌و تێکیان دابێ‌و کەلەبەریان تێ‌خستبێ‌و لەو کەلەبەرەوە چووبنە دەرەوە)، (ئەوە مانای فجورە) ئەوانەی وا لەسنووری بەندایەتی دەرچوون‌و لەرێی خوا چوونەتە دەرەوە، ئەوانە لە ئاگرێکی سەختی داگیرساودان هەر وەسف ناکرێ، مەگەر هەر لەو ڕۆژەدا بزانن چیە. دەکەونە ناوی‌و، ئیتر هەرگیز لێی جیا نابنەوەو هەرگیز لەناویا غایب نابن.

جا وا فکر نەکەن کاری دادگای خواو زیندانی خوایش وەك کاری دادگای فەرمان ڕەواکانی دونیایە، وەك کاری زیندانەکانی ئەوانە کە (وەکیل)و (مدافع)و (واسیتە) هەبێت‌و دل خۆش کەن ئەگەر چوونە ناو جەهەنەم دوایی ڕێی هاتنە دەریان هەیە .

﴿ وَمَا أَدْرَاكَ مَا يَوْمُ الدِّينِ (١٧) ثُمَّ مَا أَدْرَاكَ ما يَوْمُ الـدِّين (١٨) ﴾ :جا، چی تۆی وا لێ کردووە ئەوە بزانی‌و پەی بەری بەوەی ئەو ڕۆژە کەیە؟ تۆ چوزانی ئەو ڕۆژە کەیەو چۆنە؟!

﴿يَوْمَ لَا تَمْلِكُ نَفْسٌ لِّنَفْسٍ شَيْئاً وَالْأَمْرُ يَوْمَئِذٍ لِّلَّـهِ (١٩)﴾: ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە کەس بۆ کەس دەسەلاتی نیە، فەرمان لەو ڕۆژەدا بۆ خوایە . دەی فەرمانی خوایش لەسەرئەوە بوونەوەی وا چاکەکارە لەو خۆشبەختیەدا بێ کە وەصف‌و سەنای ناکرێ . ئەوەش کە فاجرە و

لەرێی بەندەیی دەرچووە لەو ئاگرە هەلگیرسێنراوەدا بێ ،کە ئەویش وەصف ناکرێ. ئەبێ ئەم عالەمە برِوخێنرێ بەسەر یەکاو عالەمێکیتر خۆش بکرێ، زۆروفێکیتر بێتە رِوو.. ئەم عالەمەی بۆ ئەوە دروست کردووە ئینسان تیایدا تاقی بکرێتەوە. دەبێ عالەمێکیتر دروست کا بۆ ئەوەی ئینسان جەزای کردەوەکانی تیا ببینێتەوە. ئەو عالەمەش جۆرێکیتردەبێ ، جیاواز لەم عالەمە .

## قۆناغەکانی هاتنی قیامەت و شەپورەکان

لەبارەی قیامەتەوە ئایەتی زۆر هەن لەقورئاندا ، هەر کام گوشەیەکی لێ دیاری دەکەن . وەك ئەو ئایەتانەی باس لەوە دەکەن ئاسمان لەتوپەت دەبێ و دەرِوخێ بەیەکدا، زەویش وای لێ دێت، کەژو کێوەکانیش وایان لێدێت . ئەستێرەکان ئەکوژێنەوەو دەرِژێن بەسەریەکدا. مانگو رِۆژ ئەکوژێنەوەو دەدرێن لەیەك . شتی تری زۆرکە کورتەی ئەوانە ئەوەیە پێنج قۆناغ هەیە تا دواهاتنی رِۆژی قیامەتو تا جێگیر بوونی ئەهلی بەهەشتو جێگیر بوونی ئەهلی دۆزەخ لە دۆزەخدا، قوناغەکانیش بەم جۆرەن :

**شەیپوورەکان:**

هەروەك چۆن لەناو هەندێ سوپاو نیزامی سەربازی دونیادا باوە، کاتێ ئەیانەوێ فەرمانێك بدەن بەسەربازەکان، بۆ ئەوەی زوو بگا پێیان و هەموو سەربازەکان بە یەکجار فەرمانەکە بەن بەریوەو ئیتاعەت بکەن، لەباتی ئەوەی یەکە یەکە بەو سەربازانە بڵێین : ئاوا بکەن، بخەون، هەڵسن، وەرن بۆ ریز.. لەباتی ئەوە، بڕیاریان داوە کە سێ جار شەیپوور لێ دەن. جارێکیان شەو کاتێ ئەیانەوێ سەربازەکان هەموو بخەون، یەکجار شەیپور لێ ئەدەن‌وئەبێ هەرکەس هەربەوە فەرمانەکەی بیست بخەوێ. بەیانیش بۆ ئەوەی هەڵسن هەروا شەیپورێکی تر لێ ئەدرێ بۆ ئەوەی هەموو بە خەبەر بێن‌و هەڵسن. دوای ئەوەی کە هەڵسان‌و خۆیان ئامادە کرد شەیپوری سێهەم لێ ئەدرێ، (شەیپووری ئامادەبە)، بۆ ئەوەی هەموو بچن بۆ مەیدانی تەکلیف‌وئەرك . هەروەك لەناو ئەم سوپاو نیزامی‌یانەی دونیایەدا باوە، خوای گەورەش بڕیاری داوە سێ دانە شەیپوور لێ بدرێ:

شەیپووری یەکەم که قۆناغی یەکەمی سەرەتای قیامەتە: کاتێ کە عومری ئینسان لەسەر زەویدا کۆتایی دێت‌و دەورانی تاقیکردنەوە تەواو دەبێ، ئیتر قەرار نیە ئینسان بمێنێتەوە لەسەر زەویدا. شەیپوورێك لێ دەدرێ‌و فەرمانێك دەردەچێ کە هەموو شتێکی پێ دەگۆڕێ، ئاسمان‌و زەوی پێ دەرۆخێ و، کەژوکێوی پێ ئەشێوێ‌و ئەستێرەو

مانگ‌و ڕۆژی پێ تێك دەچێ‌و، ئینسانی پـێ دەمـرێ‌و، گیانـدارەکانی هەموو پێ دەمرن. بەکورتی هەموو شت دەگۆڕێ‌و تێك دەچێ ..

ئەڵبەتە لەسەرەتاوە ئینسان دەمێنـێ تـا بـەعزێ لـەو شـتانە ببینـێ. وەختێ شەیپوورەکە لێ دەدرێ زەوی تەکان دەخوا‌و دەکەوێتە لـەرزە. کەژ‌و کێوەکان لەجێی خۆیان هەڵدەکەنرێن‌و، دەبـن بـەتۆزو دەپـژێن. لەو وەختەدا ئینسان چەند لەحزەیەك دەمێنێ بۆ ئـەوەی ئەوانـە ببینـێ. بۆیە ئەم پرسیارە دەکا، هـەروەك لـە سـورەتی( الزلـزلة) بـاس کـرا: ﴿ وَقَالَ الإِنسَانُ مَا لَهَـا ﴾: ئینسـان سەرسـام‌و سـەرگەردان ئـەمێنێ ئەڵێ : ئەمە چی‌یە؟ زەوی چی‌یەتی؟ بۆ ئاوای لێ هاتووە؟

ئـەوە شـەیپوری یەکـەم، کـە هـەموو شـت تێـك دەچـێ، خـوا دەفەرموێ : ئاسمان وەك ڕۆنێکی لێ دێ کە دێتە قوڵ‌و قوڵـپ ئەدا. یـا وەك گوڵەباخ سوور دەبێتـەوە . کـەژ‌و کێوەکـانیش وەك خورییـەکی ڕەنگاوڕەنگی ئاڵۆسکاویان لێ دێت، زەوی سـاف‌و سـارا دەبێتـەوەو، بەرزی‌و نزمی تیا نامێنێ، ئەستێرەکان هـەموو ئـەڕژێن بەسـەر یـەکاو، ڕۆشنایی‌و تیشکیان نامێنێ‌و مانگ‌و ڕۆژ‌و هتد هەموو تیادەچن.

شەیپووری دووەم : جا ئیتر دوای ئەوە کە خوا خۆی ئەزانێ چەندە درێژە دەکێشێ . چەندێك زەمان ئەبا.. کاتێ عالەمی‌تر ئامادە دەبێت‌و وەزعیـەت ئامـادە دەبـێ بـۆ ئـەوەی ئینسـان زینـدوو بکرێتـەوە تـا موحاکەمەی بکرێ، فەرمان دەدا شەیپوری دووەم لێ دەدرێ، ئـەوەش

قۆناغی دووەمی قیامەتە، هەر شەیپور لێ درا هەموو ئینسانەکانو هەموو بەندەکانی خوا زیندوو دەبنەوە، لەجێگاکەیان (لەقەبرەکانیان) هەڵئەستنەوەو دێنە دەرەوە. جا تۆزێك ماوەیان پێ دەدرێ. ئەوانەی موسڵمانن هەرکە بە خەبەر هاتن و زیندووبوونەوە دەزانن چ خەبەرەو بۆ کوێ دەڕۆن و قەرار لەسەر چییە؟ بەلاَم ئەوانەی ناموسڵمان بوونو گوێیان نەداوە بەو ڕۆژە، دەست دەکەن بەباسکردنی ترسو لەرزیانو، بەدەربڕینی خەمو حەسرەتیانو دەڵێن: ئا ئەمە چی بوو؟ ناگات لێیە چۆن زیندووکراینەوە دوای مردن!؟ ئەوەتا هەمی‌تر دووبارە چووینەوە سەر ژیان، ئاگات لێیە چۆن ڕووبەروو بووین لەگەڵ ئەم خەتەرەو چیمان لێ هاتو چیمان کرد بەخۆمان؟ تۆزێك ماوەیان پێ دەدرێ تا ئەم قسانە بکەن.

شەیپووری سێیەم : دوایی قۆناغی سێیەمی قیامەت دەست پێ دەکاو، فەرمانی شەیپوری سێیەم دەردەچێ! تا هەموو ڕاکەنو بڕۆن بۆ ئەو جێگەیەی کە بڕیارە دادگا ئامادەکرابێ. وەك لەسورەی (یس)دا ئەم سێ شەیپورە باس دەکاو دەفەرمووێ:

﴿ وَيَقُولُونَ مَتَى هَذَا الْوَعْدُ إِنْ كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴾ ئەوانەی کە باوەڕیان نییە بەقیامەتو ئیحساسی مەسئولیەت ناکەنو ڕێگای بەندەیی خوا ناگرن، دەڵێن : ئائەمە کە وەعدەی دەدەن کەیە؟ ئەگەر

نێوە ڕاستگۆن؟ ئەگەر ڕاست ئەکەن ڕۆژێك دێتە پێشەوە، دەی پێمان بڵێن کەیە؟

﴿ مَا يَنظُرُونَ إِلاَّ صَيْحَةً وَاحِدَةً تَأْخُذُهُمْ وَهُمْ يَخِصِّمُونَ ﴾، دەفەرمووێ : یاهەر ئاوا بڵێن. با بڕوایان نەبێ. تا کاتەکەی دێتە پێشەوە، مەگەر چاوەڕوانی چی دەکەن؟ چی لەسەر ڕێیانە جگە لە یەك شریخە(یەك نرکەی گەورە) کە داگیریان دەکاو دەنیشێتە ملیان، لەحالێکا خەریکی کێشمەکێشو جەنگو داواو شەڕو شۆڕن لەسەر دنیاو لەسەر مەتاعی دونیا؟! ئالەو حاڵەدا داگیریان دەکا ، بەجۆرێك داگیریان دەکا کە ﴿ فَلاَ يَسْتَطِيعُونَ تَوْصِيَةً وَلاَ إِلَى أَهْلِهِمْ يَرْجِعُونَ ﴾ کە نە دەتوانن وەسیەت بکەن – ئاخر کێ بۆ کێ وەسیەت بکا؟ هەموو کەس تووش هاتووە! وانیە کە کەسێك گرفتار بوو بێ‌و کەسێکی‌تر گرفتار نەبێ ، تا ئەم وەسیەتێك بکا بەلای ئەوەوە. نە دەتوانن وەسیەتێ بکەن- نە دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ لای خێزانو کەسوکاریان (ئەمە شەیپوری یەکەم).

﴿ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَإِذَا هُمْ مِنَ الأَجْدَاثِ إِلَى رَبِّهِمْ يَنسِلُونَ ﴾ فوو دەکرێ بەشەیپورا بۆ جاری دووەم، هەر ئەوەندەت زانی لەقەبرەکانیان دەردێن‌و بەپەلە ڕادەکەن بەرەو لای خاوەنەکەیان ﴿ قَالُوا يَاوَيْلَنَا مَنْ بَعَثَنَا مِنْ مَرْقَدِنَا هَذَا مَا وَعَدَ الرَّحْمَانُ وَصَدَقَ الْمُرْسَلُونَ ﴾ ئەڵێن :

ئەی وای! ئەی هاوار! کێ لەجێ خەوەکەمان رای پەراندین و زیندووی کردینەوە؟!

ئەگەر چی ئینسانی ناموسلمان و کافر لەقەبرا لەبەینی مردن تا قیامەتا عەزابی هەیە، بەلام ئاسەو مەترسییە نییە کەوا لەکاتی زیندووبونەوەدا دەکەویتە بەرچاوی و دەزانی کە لەسەر رێیە. ئەوەندە کارەساتەکە گەورەیە کە ئەمەی تر بەخەوی شیرین دەزانی..

بەلێ، هاوار دەکەن : کێ لەو خەوە خۆشە رای پەراندین؟ زۆری پێ ناچێ کە خۆیان بیر دەکەنەوەو لەخەوی غەفلەت بەخەبەر دێن و، دەلێن : ﴿هذا ما وعدَ الرّحمانُ وصدَق الْمُرْسلُون﴾ : ئەمە ئەوەیە کە خوای رەحمان وەعدەی دا، نێرراوەکانی خواو پێغەمبەرەکانی- کەناردنی بۆ گەیاندنی ئەمە- راستیان فەرموو. (ئەوەش شەیپووری دووەم). تۆزێ مۆلەتیان دەدرێ کە ئەم قسانە بکەن.

جادوایی شەیپوری سێیەم دێت: ﴿إنْ كانتْ إلاّ صيْحةً واحدةً فإذا هُمْ جَميعٌ لديْنا مُحْضرُونَ﴾ هەریەك شریخەی تره. دوای ئەوە هەر ئەوەندەت زانی هەمووی کۆکراونەتەوە لەلای ئێمە (خوا دەفەرمووێ)، ئامادە کراون بۆ ئەوەی پرسیاریان لێ بکرێت و موحاکەمە بکرێن. ئەوەش قۆناغی چوارەمە کە دەست پێ دەکا.

جا موحاکەمەکە چۆن دەکرێ ؟ : ﴿فاليوْمَ لا تُظْلمُ نفْسٌ شيْئا ولا تُجْزوْنَ إلاّ ما كُنتُمْ تعْملُون﴾ پێیان ئەوترێ : ئەمرۆ هیچ کەس

کەمترین ستەمی دەرھەق ناکری، یانی ھەرکەس چەندە کردەوەی باشی ھەیە ئەوەندە پاداشتی دەدرێتەوەو یەك زەررە لەپاداشتی کەم ناکریتەوە. ھەروەھا ھیچ کامیشیان بێجگە ئەوەی خۆی ئەنجامی داوە پاداشتی پێ نادریتەوە، خۆی چی کردووە ھەر ئەوەندە پاداشتی ھەیەو ھەرکەس پاداشتی کرداری خۆی وەردەگری.

ئانەوەش بەرنامەی دادگایە.. پاش ئەوە قۆناغی پێنجەم و کۆتاییە، لەسەر ئەو ئەساسە خەلك ئەبن بەدوو بەشەوە ﴿ إِنَّ أَصْحَابَ الْجَنَّةِ الْيَوْمَ فِي شُغُلٍ فَاكِهُونَ ﴾: جا ئەوانەی کە ئەھلی بەھەشتن ئا لەورۆژەدا خەریکی شتێکن، سەرگەرمی کارێکن، بۆ خۆیان خەریکن رائەبوێرن، کەیف خۆشن.

﴿ هُمْ وَأَزْوَاجُهُمْ فِي ظِلَالٍ عَلَى الْأَرَائِكِ مُتَّكِئُونَ ﴾ : خۆیانو ھاوسەرەکانیان لەسێبەرەکانا، لەسێبەری باخەکانی بەھەشتا، لەسەر ئەو سیستەمانە کە کەژاوەیان بەسەرەوەیە- کە بۆ بووکی ئەرازێننەوە- پالیان داوەتەوەو حەریکی ئیسراحەت کردنو رابواردنن.

﴿ لَهُمْ فِيهَا فَاكِهَةٌ وَلَهُمْ مَا يَدَّعُونَ ﴾ : لەویدا میوەی زۆریان بۆ ھەیە.. ھەروەھا ھەرچیەك کە داوای بکەن.

﴿ سَلَامٌ قَوْلًا مِنْ رَبٍّ رَحِيمٍ ﴾ : ھەروەھا سەلامیشان لێ دەکری، سەلامەتیان پێ دەدری، رزگار دەکرێن، ئەوەش بریارێکە لەلایەن خاوەنێکەوە کە بە بەزەییەو رەحمەتی ھەیە. یانی ھەروا کە ھەموو شتە

خۆشەکانیان هەیە، بەهەمان جۆر ساڵم‌و ڕزگارن لەهەر شتێك کە ناخۆش بێ.

جا کاتێ کافرەکان ئەکەونە شوێن موسڵمانان تا بەشوێنیانا بڕۆن، خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَامْتَازُوا الْيَوْمَ أَيُّهَا الْمُجْرِمُونَ ﴾ : ئێوە ئەی موجریمەکان! ئەی ئەوانەی وا لەژیانتانا بەرچاکتان هەڵکردبوو، هەر سەمەری گوناهوگوناهکاریتان دەچنی ئەوە واتای (جُرْم)ە! ئەی ئەوانەی وا کارتان هەر ئەوە بوو نافەرمانی بکەن‌و لەڕێگای بەندەیی خوا دەرچن! جیا بنەوە، دەی! تێکەڵیان مەبن، مەکەونە شوێنیان، ئیمڕۆکاتی جیابوونەوەتانە!!

﴿ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَابَنِي آدَمَ أَنْ لا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ ﴾ : ئەی ئەوەکانی ئادەم! مەگەر پەیمانم لەگەڵ ئەبەستن بەندەیی نەکەن بۆ شەیتان؟ ئیتاعەت‌و فەرمانبەرداری نەکەن‌و بەپێی فەرمانی ئەو نەڕۆن؟! جا دەفەرموێ ﴿ يَابَنِي آدَمَ ﴾ (زۆر سەر زەنشتی تیایە). ئەیخاتەوە بیریان: ناخر مەگەر ئێوە کوڕی ئەونادەمەنین کە شەیتان ئەو بەڵایەی بەسەریا هێنا؟ دەی بۆ پەندتان وەرنەگرت؟! بۆ بیرتان نەکردەوە کە شەیتانێ وای کرد لە باوکتان دیارە بۆ ئێوەش خێر نالێ، بۆکەوتنە شوێنی؟! ﴿ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ ﴾ : بەڕاستی ئەو بۆ ئێوە دوژمنێکی زۆر زۆر ئاشکرایە.

﴿وَأَنْ اعْبُدُونِي﴾ : مەگەر پەیمانم لەگەڵ نەبەستن کە بەندەیی بۆ من بکەن؟! لەژیانا من چ فەرمانێ دەدەم لەوە ئیتاعەت بکەن، من چ ڕێگایەکم بۆ داناون بەو ڕێگایەدا بڕۆن؟! ﴿هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ﴾ : ئائەمە ڕێگایەکە ، هەم بەرەحەت ئینسانی پیا ئەچێ، هەم ڕاست و موستەقیمەو ئەیگەیەنێ بەجێگا ومەقسەدی خۆی.

﴿وَلَقَدْ أَضَلَّ مِنْكُمْ جِبِلًّا كَثِيرًا﴾ : شتێتریش بوو دەبوایە تەجروبەتان لێ وەربگرتایە، پەندتان لێ وەرگرتایە، شەیتان چەند گەلو جەماعەتی زۆری لەنێوە گومرا کردو سەری لێ شێواندن؟! دەی بۆ؟! بۆ بیرتان نەکردەوە ئەو شەیتانەی ئەو هەموو جەماعەت‌و دەستەو تاقمەی گومرا کردووە حەتمەن ئێوەش هەر گومرا دەکا، ئەگەر بەقسەی بکەن! بۆ تەجروبەتان وەرنەگرت کە ئێوەش شوێنی نەکەون؟

﴿أَفَلَمْ تَكُونُوا تَعْقِلُونَ﴾: ئەوە نەتانئەتوانی بیر بکەنەوەو عەقڵ بخەنە کارو تێفکرن کە شەیتانێك ئاوا دوژمنی باوکتان بوو، ئاوای کرد لەگەڵ دەستە پێشووەکان، بۆ ئێوەش خێر ناڵێ‌و بۆ بەختیاریی ڕێنمایی‌تان ناکا! .

﴿هَذِهِ جَهَنَّمُ الَّتِي كُنْتُمْ تُوعَدُونَ﴾ دەی کەواتە : ئائەمە ئەو جەهەننەمەیە وا وەعدەتان پێ دەدرا، پێتان ئەوترا کە دەچن‌و تووشی دەبن.

﴿ إصْلَوْهَا الْيَوْمَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾ : جا ئیمرۆ لەبەرئەوەی حەقتان قبوڵ نەئەکردو نەکەوتنە شوێن بەرنامەی خوا- دوای ئەوە کە بۆتان ڕۆشن کرایەوە- وخستتانە پشتگوێ، دەی تووشی بێن و بکەونە ناوی. (ئایەتەکە هەمووی بەیەکەوە دەنووسرێ، ئینجا تەفسیر بەدوایا دەکرێ ).

﴿ الْيَوْمَ نَخْتِمُ عَلَى أَفْوَاهِهِمْ ﴾ : ئیمرۆ مۆر ئەنێین بەسەر دەمیانا بۆ ئەوەی قسە نەکەن و چەنەبازی نەکەن. بۆ ئەوەی قسەی زیادە نەکەن، چونکە ئەو کاتە جێیە جێی قسەی زیادکردن نیە، مۆر دەنێین بەسەر دەمیانا. ﴿ وَتُكَلِّمُنَا أَيْدِيهِمْ وَتَشْهَدُ أَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ : دەستەکانیان لەگەڵمان قسە دەکەن و خەبەر دەدەن ئەو کەسە چی کردووەو چی نەکردووە. پێیەکانیان شایەتی دەدەن لەسەرخۆیان کە ئەوەیان کردووەو ئەوەیان نەکردووە..

(کەواتە پێنج قۆناغەکەی قیامەت بەم جۆرەن):

یەکەم: شەیپووری یەکەم کە هەموو عالەم تێك دەچی بەسەریەکاوخەڵکی دەمرن.

دووەم: شەیپووری دووەم کە هەموو زیندوو دەبنەوە.

سێیەم: شەیپووری سێیەم کە هەموو کەس ئامادە دەکرێ بۆ دادگای خوا.

چوارەم: قۆناغی موحاکەمەکە کردن بوو.. هەرکەس بەپێی کردەوەو عەمەلی خۆی، موحاکەمەی دەکرێو وجەزاو پاداشتی بۆ دیار دەکرێ.

پێنجەم: کاتێکە دەدرێنە بەرو دەکەونە رێ، دەستەیەك بۆ بەهەشتو، دەستەیەك بۆ جەهەنەم. بەمەش کار دوایی دێتو هەرکەس لەجێگای خۆی جێگیر دەبێ.

جا ئیتر باسی ئەم پێنج قۆناغەو باسی ئەوەی کە بەهەشت چی تیایەو جەهەنەم چی‌تیایە، لەقورئانا زۆرە، هەروەك وتمان رەنگە لاپەرەی نەبێ باسێکی تێدا نەبێ، لەبەرئەوە زۆر لەسەر ئەوە ناچین.

## گۆشەیەك لە بەڵگەكانی زیندووبوونەوە

هەندێكەس ئەوەیان بەلاوە غەریبە ئینسان دوای مردن زیندوو بێتەوە، زۆرێك هەن – تەنانەت هەندێ لەوانەش كە ناویان موسڵمانە– ئەمە لەدڵیانا بەتەواوی دانەمەزراوە كە ئینسان زیندوو دەبێتەوەو، لەدوای مردنی دەكێشرێتە دادگای خواو موحاكەمە دەكرێ. بۆیە قورئان پڕە لەبەیانی بەڵگەو نیشانە بۆ ئەوەی ئینسان هەر تەواو ڕەحەتو ئاسان زیندوو دەكرێتەوە دوای مەرگی، زۆر سادەیە كە خوا بیكێشێتەوە دادگای خۆی و پرسیاری لێ بكا.

ئەو بەڵگەو نیشانانە لەدووبەشدا لە قورئاندا بەیان كراون : بەشێكیان باسی ئەوە دەكەن ئەمە ئیمكانی هەیەو دەكرێ خوای گەورە ئینسان زیندوو بكاتەوە. بەشێكیشی باسی ئەوەیە نە تەنها دەكرێ خوا زیندووی بكاتەوە، بەڵكو هەر دەبێ زیندووشی بكاتەوە. ئاخر هەندێ شت هەن دەكرێ ببن بەڵام نابن، وەك ئەوە كە ئێستا دەكرێ ئەم زەوییە تووشی زەوی لەرزەیەكی زۆر قورس بێ ئالەم دەقیقەیەدا، بەڵام نابێ! وەنەبێ هەر شتێ بكرێ و بگونجێ ببێ، حەتمەن بشبێ.

لەو بەڵگەو نیشانانەی كە باسی ئەوە دەكەن خوای گەورە دەتوانێ ئینسان زیندوو بكاتەوە ئەمانەن :

یەكەم/ ئەوە كە دەفەرموێ : خوایەك كە ئاسمانەكانو زەوی دروست كردووە بەو هەموو گەورەییەوە، دەتوانێ ئینسانیش

جارێکیترکۆ بکاتەوە! مەگەر ئینسـان گرنگترە لە ئاسمانـەکانو زەوی؟ کە ئەوە بکا بۆ ناتوانێ جارێکیتر ئینسـان خەلق بکاتەوە؟!.

دووەم/ خوایەك کە توانیویەتی ژیان بدات بەگیاو بە دارو درەخت، دەتوانێ جارێکیتریش ژیان بداتەوە بە ئینسـان! مەگەر ئەویش هەر ژیان نیـە؟! وەختێ توانیویەتی ئالەو خاکە شتێکی زینـدوو خـەلق بکـا کـە گیایەو دارو درەختە، دەتوانێ ئینسـانیش زیندوو بکاتەوە جارێکیتر.

سێیەم/ ئەوەیە کە دەفەرموێ : ئەو خوایەی توانیویەتی یەکجار ئێـوە دروست بکا، جارێکیتریش دەتوانێ دروستتان بکاتەوە! مەگەر ئەمجارە چی‌کەمە لەو جارەی تر؟

چوارەم/ یەکێکیتریش لەو نیشانەوبەڵگانە ئەوەیـە کـە دەفـەرموێ ئەگەر سەیری ڕابردوو بکەن دەزانن زۆرجـار خـوای گـەورە زۆرێـك قەوم‌و هۆزی لە بەین بردووە، دوای ئەوە کـە گـومڕا بـوونو لـەڕێی بەندەیی لایان داوە، پێغەمبەرێکی ناردووە ڕێگەیان بۆ ڕۆشـن کاتـەوە، بەڵام گوێیان بەقسـەکانی نەداوەو نەهاتونەتەوە سەر ڕێ. دوای ئەوە کە بە ڕەحمەتی خۆی ئەوەی کە پێویست بووە لەهیدایەت بۆی نـاردوون، بـەڵام هـەر نەگەڕاونەتـەوە. بۆیـە تۆڵـەی لێ سـەندونەتەوەو لەبـەینی بردوون. دەی کەسێ کە بتوانێ گەلێك، یا نەتەوەو تایەفەیەك، یا چینو نەوەو نەسلێك، بـەجارێ لەبـەین ببـا؟! بـۆ نـەتوانێ ئینسـان زینـدوو بکاتەوە؟! کەسێ مـردن لـەدەسـتیا بـێ، نەشـتوانێ زینـدوو بکاتـەوە!

هەروەها کەسێ بتوانێ لێرە ـ لە دونیادا ـ تۆڵە بسێنێتەوە، دەتوانێ جارێکیتریش ئینسان زیندوو بکاتەوەو تۆڵەی لێ بسێنێ.

پێنجەم/ بەڵگەو نیشانەیەکیتر ئەوەیە ئەوانەی وا سەحلی بەندایەتی خوا بوون، بەندەی موخلیسی خوا بوون، خوای گەورە ڕزگاری کردوون، وەك : کاتێك توفان هەڵئەسێنێ، پێغەمبەرەکەی نوح (علیه الصلاة والسلام)و بەندە بڕوادارەکان کەلەگەڵیا بوون، نوبان ڕبك ئەخا کەشتییەك دروست کەدو ڕزگاریان دەکا. یاکاتێ دەیەوێ تایەفەی (عاد) لەبەین یبا، خەبەر ئەدا بە پێغەمبەرەکەی خوێ هود (علیه الصلاة والسلام)و بە پەیڕەوەکانی : ئەوێ بەجێ بێڵن، بۆئەوەی تووشی بەڵاکە نەبن.. هەروەها بۆ پێغەمبەرەکانیتریش (علیهم السلام) هەرکات ویستویەتی ئەو خەلکە ستەمکارە لەبەین یبا ، یەکەمجار ئەوانی ڕزگار کردووەو دووری خستوونەتەوە لەبەڵاکە، پاشان ئەوانیتری لەبەین بردووە.

دەی کەسێ بتوانێ جارێك ڕێز بگرێ لەئینسانێکی باش لەبەندەکانی خۆی، جارێك پاداشتی بداتەوە، جارێکی تریش دەتوانێ زیندووی بکاتەوەو هەموو پاداشتەکەی پێ بداتەوە. چونکە ئەو پاداشتەی کە لەوێ ـ لە دونیا ـ پێی داوەتەوە زۆرکەم بووە لەچاو ئەو پاداشتەی بڕیاری داوە بیداتەوە، ئەوەی دونیا هەموو پاداشتەکەی

نەبووە. کەوابوو دەبێ ڕۆژێکیتر بێ لەو ڕۆژەدا هەموو پاداشتە شایستەکەی خۆی پێ بداتەوە.

شەشەم/ بەڵگەیەکیتر ئەوەیە کە دەفەرموێ : بڕوانن، سەیری ئاسمانو زەویو هەرچییەك کە تیایاندایە بکەن، هەر مەخلوقێ ئەیبینین بەجووت جووت دروست کراون. هەردوو شت لە بەرانبەری یەکەوە دانراون، ئاسمانو زەوی، شەوو ڕۆژ، خۆرو مانگ، (خۆر ڕۆشنایی هەیە دەیدا بەمانگو مانگ نیەتیو لەو ئەیگرێ) خۆر بەڕۆژا دێتو ئەو بەشەودا دێت. ئاسمان بەرزەو بینا کراوە، زەوی نزمەو تەخت کراوە، شەو دیارە تاریکە، ڕۆژ ڕوشنە، شەو هەموو شتێ دادەپۆشێ، ڕۆژ شتەکان دەردەخا.. دەفەرموێ :تەماشای نێرو مێ بکەن، لەبەرانبەری یەکەوەن، هەروەها دەفەرمووێ : چ لەوانەی ئێوە پێی دەزانن، چ لەوانەی ئێوە پێی نازانن هەموو جووت جووتن، جا دەفەرموێ : چۆن دەکرێ هەموو شتێ ئاوا دروست کرابێ، بەڵام سەرەنجامی ئینسان یەك جۆر بێ؟ ئاسمانو زەوی لەبەرانبەری یەکەوەن، هەروا نێرو مێ، هەروەها هەر مەخلوقێك بیگری جووتی تیایەو یەك جۆر نین، دوو جۆرن، دەبێ سەرەنجامیش دوو جۆر بێ نەك یەك جۆر نەبێ.نابێ کاتێ خەڵکی مردن ئیتر زیندوو نەکرێنەوە، ناکرێ هەموو سەرەنجامی یەکجۆر بێو لێیان نەپرسرێتەوە، نابێ هەمووی خۆشبەخت بێ یا هەمووی بەدبەخت بێ، دەبێ دووجۆر بێ. هەروا کە هەموو شتێ

دوو جۆرە، دەبێ سەرەنجامی ئینسانەکانیش دووجۆر بێت.ئەبێ هەندێ خۆشبەخت بن، هەندێکیتر بەدبەخت، بەپێی ئەو ژیانەی بوویانە لەدنیادا..

بەڵگەو نیشانەی زۆری تریش هەن ،بەلام ئەمانە بەسن بۆ ئەوەی ئینسان بزانێ زیندووبونەوەی دوای مردن‌و، موحاکەمەو لێپرسینەوە هەیە، ئەکرێ بێت‌و خوای گەورە قودرەتی لەسەریەتی. جا چۆن توانیویەتی ئەمانە دروست بکا،ئەو شتە جۆراو جۆرانە : نێرو مێ، شەوو ڕۆژ، ئاسمان‌و زەوی، مانگ‌و ڕۆژ، غەیری ئەوانە.. هەرواش دەتوانێ کارێ بکا کە دووجۆر سەرەنجام بێ. سەرەنجامی خۆشبەختی‌و سەرەنجامی بەدبەختی..

## هەندێ لە بەڵگەو نیشانەکانی ڕۆژی دوایی

لە بەشەکەی تردا، (ئەوەی حەقەن دەبێ ڕۆژێ بێتە پێشەوەکە ئینسان پاداشتی کردەوەکانی خۆی ببینێتەوە.) بۆ ئەوەیش بەڵگەو نیشانەی زۆر هەن، هەروەکو لەسورەی فاتیحەدا باسمان کرد. ئەگەر بێت‌و ڕۆژێك نەبێ خوای گەورە لەئینسان بپرسێتەوە، مانای ئەوەیە کارەکانی ـ پەنا بەخوا ـ نابەجێ بووە، ئەو هەموو ئیمکانات‌و نیعمەتەی لە ئیختیاری ئینساندا قەرار داوە. خودی ئینسانیشی بۆ ئەوە

دروست کردووە زیاد بکاو بەرەو کەماڵو تەواو بوون بچێ، بەڵام ئینسان ئیستفادەی نەکردووە لە ئیمکاناتو نیعمەتەکان..

ئەگەر بهاتایەوناوا ڕۆژێك نەبوایە ، مانای وایە خوا- پەنا بە خوا- کاری بێهودە دەکا، دەی خۆ خوای گەورە دوورە لەوە، دوورە لەوەی یەك کاری نابەجێش بکا چ جای بگا بەم کارە گەورەیە، کەوابورحەتمەن دەبێ ڕۆژێك بێ ئینسان پرسیاری لێبکرێ کە چی کردووەو چی نەکردووە؟ بۆیە لەسورەی فاتیحەدا دوای ﴿الرَّحْمن الرَّحِيمِ﴾ دەفەرموێ ﴿مالكِ يوْمِ الدِّينِ﴾.

جا ئەم مەسەلەیە لە زۆرێك لەئایەتەکانی قورئاندا ڕوون کراوەتە. بەڵێ، ناکرێ ڕۆژێك نەبێ ئینسان تیایدا پرسیاری لێ بکرێت و موحاکەمەی بکرێت لەسەر ئەوەی کردویەتی و ئەوەی نەیکردووە.

جا هەندێ لەو دەلیلو نیشانانە ئانەمەن، دەفەرموێ : سەیرکەن بزانن خوا چ بەرنامەیەکی ڕێك خستووە بۆ (با)، بۆ ئەو (با)یانە هەڵم هەڵدەگرن لەدەریاکان و بوخار هەڵدەستێنن، دەیەن بەملاوئەولادا تا سارد دەبێتەوەو دەبێتەوە بە ئاوو بارانو دەڕژێتەوە سەر زەویو دەبێ بەهۆی ئەوەی زەوی زیندوو ببێتەوەو گیاو دارو درەختی تیا بڕوێنو سەوز بێ.. بۆ ئەوەی ببێتە ڕزقو ڕۆزیو لەدەستی ئێوەدا بێ بۆ ئەوەی بتوانن پێی بژینو، بە ئەرکی خۆتان هەستن.

ئەوکەسەی ئەوهەموو بەرنامەیەی ڕێك خستووە، حەتمەن دەبێ زیندوورتان بکاتەوەو لێتان بپرسێ : چۆن سوودتان بینیوە لەو مایەی ژیانە..

جا ئیتر ئەمە بەشێوەی جۆرجۆر بەیان کراوە. لەهەر جێیەکا بەشێك لەوحالەتانەی بەسەر (با)دا دێن باس کردووە، ڕۆشنی کردۆتەوە ئەوکەسەی ئەو نەزمەو بەرنامەیەی ڕێکخستووە بۆ ئەوەی ئەو بایانە ئەو هەڵمانە ببەنو، ئەو هەورانە بەملاوئەولادا بگێڕن، تا باران بباریو، ئاو بڕژێتە سەر زەویو، زەوی زیندوو بێتەوەو، ئینسان بتوانێ زیندەگی بکا لەسەر زەویدا، ئەو کەسە ئەو کارانەی کردووە، بۆئەوەی کردووە ئینسان ئیمکانات و نیعمەتەکان لەدەستیا بن، حەتمەن دەبێ ڕۆژێ ئینسان زیندوو بکاتەوەو لێی بپرسێتەوە..

هەروەها وەك لەوەو پێش باسمان کرد باسی کردووە هەروەك چۆن هەرشتێك جووت جووت درووست بووە، هەر دووشت لەبەرابەری یەکەوە قەرار دراون، هەروا دەبێ سەرەنجامیش دووجۆر بێ، نابێ هەمووی یەك جۆر بێ، نابێ هەموو خەڵکی بەدبەخت بێ، یا هەمووی خۆشبەخت بێ. دەبێ زیندوو بکرێنەوەو پرسیارومحاکمە بێ، سەرەنجامەکانیش دووجۆر دەبن ، هەروەك هەرشتێك دووجۆرە.

دەلیل‌و نیشانەی زۆری تریش هەن لەقورئانا، ئەگەر یەکە یەکە بەیان بکرێن درێژە دەکێشێ، ئەم ئەندازەیە بەسە ئەگەر ئینسان خێری بوێ‌و، بیەوێ لە رێی ئیحساسی مەسئولیەتدا هەنگاو هەلگرێ.

## پوختەیەك لە تەفسیری سورەتی (قاف)

ئێستا بۆ روون بوونەوەی زیاتری ئەمانەو هەندێ شتی‌تر، با سورەیەکی تر لە قورئان بخوێنینەوەو ماناکەی بەیان کەین، بەو هیوایەی خوا بیکاتە سەبەبی ئەوەی کەسانێ وا خێریان ئەوێ زیاتر ئیمان لەدلیانا جێگیر بێ..

بسم الله الرحمن الرحیم

﴿ ق والْقُرْآنِ الْمَجِيدِ ﴾ ق : سوێند بەو قورئانەی‌کە چەند کەلام‌و چەند قسەیەکە لەگەڵ یەکدا یەکیان گرتووەو پێکەوە موناسیبن‌و بەیەکەوە پەیوەندی‌یان هەیە، پڕ لەخێرو بەرەکەتن، ئەوە بۆ ئینسان روون دەکەنەوە کە خوای گەورە دەتوانێ زیندووی بکاتەوەو بیکێشێتە دادگا. حەتمەنیش زیندووی دەکاتەوەو دەیکێشێتە دادگا.

هەروەها رۆشنی دەکەنەوە بۆ ئینسان کە لە دونیادا وا لەبەر تاقیکردنەوەی خوادا، تەکلیف‌و بەرنامەی بۆ نێرراوە، هەروا بێ تەکلیف‌و بێ بەرنامە نەهێلراوەتەوە. بەپێی چۆنیەتی ژیانی لەدونیادا پاداشت‌و سزاو سەرەنجامی دەست دەکەوێ..

بەڵێ، ئەم قورئانە ـ کە ئەم سورەتە بەشێکیەتی ـ ئەوانەی هەموو تێدایە، کە ئەگەر کەسێك ئەهلی حەق بێت‌و خێری بوێ دەبێ ئیمان بەوە بێنێ، دەبێ ئەوەی بەس بێ، بەڵام ئایا خەڵکی وان؟ ئایا ئەمەیان بەسە؟ ئایا ئەگەر ئەم قورئانەو ئەم سورەتەیان بیست ئیمان دەهێنن‌و تەسلیم دەبن‌و رێی بەندەیی دەگرن؟ نەخێر..

﴿ بَلْ عَجِبُوا أَنْ جَاءَهُمْ مُنْذِرٌ مِنْهُمْ ﴾ : بەڵکو سەریان سورما کە یەك نەفەر لەخۆیان بێت‌و ئیعلاتی مەترسی بکا، دایانچڵەکێنێ‌و پێیان بڵێ: مەسئولیەتێك هەیە، قیامەتێك هەیە، رۆژێك دەبێ پرسیارتان لێبکرێ‌و، بکێشرێنە دادگای خوا.. سەریان سورما کە یەکێك بێت بیان ترسێنێ لە سەرەنجامێك کە لەسەر رێیاندایە.

سەریان سورما کە یەکێ لەخۆیان لەگەڵ خوا پەیوەندی ببێت‌و، ئاوەها خەبەرێکیان بۆ بێنێ، چونکە خۆیان ئەوەیان نەبووەو وا دادەنێن کە کەسی تریش نەتوانێ، کەسی تریش شایستەیی ئەوەی نیە کە لەگەڵ خوا پەیوەندی هەبێ، هەموو کەس وەك خۆیان دەزانن. ئەوەیە کاتێ ئەو شەخسە دێت‌و خەبەریان پێ دەدات کە ئاوا خەتەرێك لەسەر رێیانا هەیە ، باوەری پێ ناکەن‌و دەڵێن تۆ بەشەرێکی وەك ئێمە، ئێمە شتی وامان دەست نەکەوتووە ، بۆیە باوەر ناکەین تۆش دەستت کەوتبێ‌و لێتی وەرناگرین‌و قبوڵی ناکەین..

﴿ فَقَالَ الْكَافِرُونَ هَذَا شَيْءٌ عَجِيبٌ ﴾ : (کافرەکان)- ئەوانەی وا حەقیان بۆ ڕۆشن بووەوە، بەڵام خستیانە پشت گوێ، نەیانویست، قبوڵیان نەکرد، نەیانهێشت لەژیانیاندا ئەو حەقە دەرکەوێ و دایان پۆشی، ئەوانە- وتیان : ئائەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە.

﴿ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا ﴾ : ئایا کاتێ مردین و بووین بەخاك، زیندوو دەبینەوە؟ چۆن دەکرێ شتی وا؟ ئایا جارێکیتر ژیان دەست پێ دەکاتەوە؟ ئاخر کە مردین چۆن زیندوو دەبینەوە؟ کە بووین بەخاك و تێکەڵ بووین لەگەڵ خۆڵ و خاکیتر، چۆن جیا نەکرێینەوە، پارچەکانی لاشەی ئێمە چۆن دووبارە دروست دەکرێنەوە؟

﴿ ذَلِكَ رَجْعٌ بَعِيدٌ ﴾ دەڵێن : ئائەوە دوورە، هەرشتێك کە ناکرێ بێ ، دوورە لەوەی کە ڕووبدا. دوورە دووبارە بمانگێڕنەوە و زیندوو بکرێینەوە و ببرێین بۆ موحاکەمەو دادگا.

جا خوای گەورە ڕەدیان دەداتەوەو بەیان دەکا کە ئائەوە عەقیدەیەکی نادروستە، ئەو باوەڕو عەقیدەیە کە هەیانە -گوایە زیندوو ناکرێنەوەو نابرێنەوە بۆ دادگای خواو موحاکەمەو موحاسەبەیان ناکرێ- شتێکی نابەجێ و باتڵە.

بە نیسبەت ئەوەوەکە دەڵێن : کاتێ بووین بەخاك و خۆڵ چۆن جیا دەبینەوە؟ دەفەرموێ :

﴿ قَد عَلِمْنا ماتَنْقصُ الأرضُ مِنْهُمْ ﴾ : بە دڵنیایی زانیومانە زەوی چەندێکیان لێ کەم دەکاتەوە. وەختێ لاشەکانیان لەقەبردا دادەنرێ، کەم کەم دەرزێ‌و دەبێ بەخۆڵو خاك. هەربەشێك لە لاشەیان کە جیا دەبێتەوە، دەزانین چی جیا دەبێتەوەودەبێ بەخاك، دەیناسین‌و دەزانین کامەیە لەبەشەکانی لاشەی‌و لێمان تێك ناچێت و لێمان ون نابێت.

﴿ وَعِنْدنا كِتابٌ حَفيظ ﴾ : کتێبێکیشمان لایە ئەو شتانە دەپارێزێ، هەرچی‌یەك دەیزانین لەوێش دەپارێزرێ، بۆ ئەوەی گومان نەکەن شتێك لەبیر دەچێتەوەو ڕەنگە هەڵەیەك لەوکارەدا ڕوو بدا.

بەڵام ئەوەی بووە بە ئیشکال بۆیان ئەوەیە کە دەڵێن : چۆن دوای مردن زیندوو دەبینەوە؟ دەفەرموێ :

﴿ بَل كَذّبوا بالحَقّ لَما جاءَهُم فَهم في أمرٍ مَريج ﴾ : ئەمانە ڕاست ناکەن کە ئەمە شتێکی مەحاڵەو بە زەحمەت دەکرێ ئینسان قبوڵی بکا. نەخێر شتەکە وانیە کە نەکرێ، ئینسان زۆر سادەوناسان دەرکی نەکاو نەیزانێ.. نەخێر، ئەوان هەر لەوکاتەدا ئەوەی وا ڕاست‌و دروستە هاتە لایان، پێیان گەیشت، بەلام بێ ئەوەی تۆزێك لێی ورد ببنەوەو سەرنجی بدەن، ڕەدیان کردەوەو خستیانە پشت گوێ، کافر بوون پێی‌و وەریان نەگرت. یانی شتەکە زۆر ڕوونە، بەڵام ئەوان نایانەوێ بڕوای پێ بهێنن. لەبەرئەوەیە، نەك لەبەرئەوەی باتڵەو، لەوشتانەیە کە دەبێ قبوڵ نەکرێ و بڕوای پێ نەهێنرێ.

جا ئیتر دوای ئەوە ناتوانن دروست حوکم بدەن لەبارەی شتێکەوەو لێیان تێك چووەو، وا دەزانن ئەگەر لاشەیان بوو بەخاكو تێکەڵی خاكو خۆڵ بوو، ئیتر ناکرێ زیندوو بکرێنەوەو، لەبیریان چۆتەوە کە زیندوکردنەوەی مردوو شتێکی زۆر سادەیەو بۆ خوا ئاسانەو جێی گومان ودوودڵی نیە.

﴿أَفَلَمْ يَنظُرُوا إِلَى السَّمَاء فَوْقَهُمْ كَيْفَ بَنَيْنَاهَا وَزَيَّنَّاهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٍ﴾ : مەگەر نەیان ڕوانی بۆ ئاسمان؟ ئەو ئاسمانەی کەوا بەراسەریانەوەیە؟ خۆ ئەیبینن. خۆ دەتوانن سەیری بکەن. ئایا سەیر ناکەن چۆن بینامان کردووە، چۆن درووستمان کردووە، چۆن زینەتو جوانیمان پێداوەو، ڕازاندومانەتەوەو، هیچ نارێکیو هیچ لارو گێڕیەکی تیا نیە؟ با بڕوانن بۆی بزانن چۆن ئەو ئاسمانەمان بینا کردووەو چۆنمان ڕازاندۆتەوە بەو ئەستێرانەو چۆن مەحکەم دروستمان کردووە؟ دەی کەسێ بتوانێ ئاوەها شتێ بکا چۆن ناتوانێ ئینسان زیندوو بکاتەوە؟

﴿وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾ : زەوی بەو هەموو گەورەییەوە، کێشمان پێ داوە، سافو سارا دروستمان کردووە، بۆ ئەوەی جێی دامەزرانو ئیسراحەتو ژیان بێ. هەندێ کەژوکێوی جێگیرو مەحکەمان خستۆتە سەری تا ڕای بگرن. هەروەها لە هەر دارودرەختو گیاو دروستکراوێك

(جووت)مان دروست کردووە کە زۆر شادو بەزەوقە.. دەی کەسێك بتوانێ ئەوانە بکا، بۆ ناتوانێ ئینسان زیندوو بکاتەوە؟! چۆن ناتوانێ؟!

﴿تَبْصِرَةً وَذِكْرَى لِكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ﴾ : ئەوانەمان کردووە بۆ ئەوەی بەرچاو ڕۆشنکەرەوە بن بۆ هەر بەندەیەك کە هەر جارە دەگەڕێتەوە بۆلای خاوەنەکەی خۆی. هەروەها بۆ کەسێکیش کە زانیویەتی ، بەلام غەفلەت هاتووە بەسەریاو لەبیری چۆتەوە، تا بیخەنەوە بیری کە خوا دەتوانێ جارێکیتر ئینسان دروست بکاتەوە.

﴿وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً مُّبَارَكًا فَأَنبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ. وَالنَّخْلَ بَاسِقَاتٍ لَّهَا طَلْعٌ نَّضِيدٌ. رِّزْقًا لِّلْعِبَادِ﴾ : بەلگەیەکی تر ئەوەیە کە لە ئاسمانەوە ئاوێکی پڕ خێرو بەرەکەتمان باراند، جا بەهۆی ئەو ئاوەوە چەند باخێکمان ڕواندو سەوزمان کردن. هەروەها دانەو تۆوی ئەو گیاو زەرعانەی درەویان دەکرێ، دوای ئەوە کە دەگەنو ئامادەی ئەوە دەبن سوودیان لێ ببینرێ. هەروەها درەختانی خورمای بەرز بەرز، کە شکۆفەکانیان وەختێ دەردێن چین لەسەر چینن.. ئەو هەموو شتەمان بەو ئاوە ڕواند بۆ ئەوەی ڕۆزییەك بن بۆ بەندەکانو سوودیان لێ ببینن.

﴿وَأَحْيَيْنَا بِهِ بَلْدَةً مَّيْتًا﴾ : هەر بەو ئاوە ولاتێکی مردوومان زیندوو کردەوە. زەوییەك کە مردوو بوو، زیندوومان کردەوە. ئەوەتا ئێستا گیاو دارودرەختی زۆری تیایە. ﴿كَذَلِكَ الْخُرُوجُ﴾: دەرهاتنی

لەقەبرەکانیش هەروایە. کەسێ توانی ئاو بیارێنێ، باران بیارێنێ، ئەو هەموو شتەی پێ بڕوێنێو ژیانیان پێ بدا.. کەسێك توانی بەناو وڵاتێکی مردوو زیندوو بکاتەوە، هەروایش دەتوانێ ئینسان زیندوو بکاتەوەو لەقەبرەکەی دەری بێنێتەوە..

لەسەریکیترەوە کەسێك ئەو هەموو ئیمکانات‌و نیعمەتانەی خەلق کردووە بۆ ئینسان، چۆن دەکرێ لە دوایدا نەیکێشێتە دادگای خۆی‌و پرسیاری لێ‌نەکاو موحاکەمەی نەکا لەسەر ئەو نیعمەتانە ؟

﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَأَصْحَابُ الرَّسِّ وَثَمُودُ. وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ وَإِخْوَانُ لُوطٍ. وَأَصْحَابُ الْأَيْكَةِ وَقَوْمُ تُبَّعٍ كُلٌّ كَذَّبَ الرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ﴾ : قەومی نوح‌و ئەوانەی ناونران (اصحاب الرس)، هەروەها تایەفەی سەمود و، تایەفەی عادو فیرعەون‌و براکانی لووط ( واتە تایەفەکەی)، ئەوانەی لە جەنگەڵەکەدا بوون (اصحاب الأيكة)، هەروەها قەومی (تُبّع). هەموو‌ئەوانە پێغەمبەرانیان بە درۆزن زانی ، وتیان : زیندوو بوونەوەی دوای مەرگ‌و، موحاکەمەو، حیساب‌و کیتاب، درۆیە. جا ئەو هەڕەشەیەی کردبوومان ڕووی دا.. ئەوەی وتبومان : ئەگەر پێغەمبەرمان ناردو، بۆی ڕۆشن کردنەوەو قبوڵتان نەکرد، ئەهاتە سەر ڕێ، ئەوە لەبەینتان دەبەین.. ئەو هەڕەشەیەمان هاتە دی‌و دامەنگیریان بوو..

﴿أَفَعَيِينَا بِالْخَلْقِ الْأَوَّلِ﴾ : دەی ئەوە بۆ هەر باوەڕ ناکەن؟ بۆ باوەڕ ناکەن کە دەتوانین جارێکیتر زیندووتان بکەینەوە؟ مەگەر دامایین و دەستەوسان بووین بە دەست دروست کردنی یەکەم جارتانەوە؟! مەگەر نەمانتوانی یەکەم جار دروستتان بکەین؟ ئەوە نەبوو جاری یەکەم بە تەواوی دروستمان کردن؟! بۆ توانیمان جارێك خەلقتان کەین؟ بۆچی ناتوانین جارێکیتر خەلقتان کەینەوە؟!

﴿بَلْ هُمْ فِي لَبْسٍ مِّنْ خَلْقٍ جَدِيدٍ﴾ : بەلام ئەوانە لەوەدا کەوتوونەتە گومان کە جارێکیتر سەر لەنوێ دروست بکرێنەوەو زیندوو بکرێنەوە. سەریان لەوە سوڕ دەمێنێ کە دوای مردن دوبارە خەلق بکرێنەوە، لەبەرئەوە نەیان دیوە و بەلایانەوە شتێکە نابێ ببێ، نە لەبەرئەوەی خوا ناتوانێ، لەبەرئەوەیە شتێکی تازەیەو ئەمان خوویان گرتووە بەو شتانەوە کە هەن. ئەوەش حالەتی ئینسانێکە کە تەنها چاوی لەدەوروبەری خۆی بێ، هەر خەریکی ئەو شتانە بێت وان بەدەورو بەریا. خوویان پێوە دەگرێ و وا دەزانێ غەیری ئەوانە شتیتر نیە. بۆیە هەر شتێ تازەیە یەکەمجار بەئینکاریەوە مامەڵەی دەکات و، لەگەڵی ڕووبەڕوو دەبێ. شتێك کە حەقیقەتەو هەیە بەلام وەری ناگرێ.

جا دوای ڕۆشن بونەوەی ئەوە، ئێستا بـزانین وەزعـی ئینسـان لـەو ژیانەیدا چۆنە ؟ بزانین چۆن تاقی دەکرێتەوەو چۆن ئازمایش دەکـرێ ، چۆن مەسئولە لە بەردەم خوادا، چۆن دەبێ ئەدای وەزیفە بکا؟

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾ : بەڕاستی ئینسانمان دروست کرد، دەزانین نەفسـی چی پێدا دەگوزەرێ، چ خەیاڵێ، چ فکرێ بەدەرونیا دەڕوا ؟ئاخر ئێمە نزیکترین لێیەوە لە ڕەگی بنا ملی. ئەوەش بۆ ئەوەیە ئینسان مەسەلەکە دەرك بکا، مەبەست ئەوەیە تێ بگا هیچ شتێك لە ئەحواڵی ئینسان نیـە لە خوا شاراوە بێ‌و پێی نەزانێ. لەهەر نزیکێك نزیکترە بە ئینسان.

﴿إِذْ يَتَلَقَّى الْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ قَعِيدٌ﴾ : کاتێـك دوو نەفەر وا شت وەردەگرن، یەکێ لـەلای ڕاسـتەوە دانیشـتووە، یـەکێ لەلای چەپەوە دانیشتووە، دوو هاونشین کـە لـەلای ڕاسـتو چـەپی ئەسانەوە دانیشتوون، وەردەگـرن. هەرچـیەك لەوکەسـە دەردەچـێ، هەرچـیەك ئـەو ئـەنجامی دەدا، وەری دەگـرن، تۆمـاری دەکـەنو دەینوسن. یانی زیـاد لـەوەی خـوای گـەورە خـۆی بـە هـەموو شـت دەزانێ، بۆ ئەوەی مەلەفەکە تەواو بێ، بۆ ئەوەی ئینسان دوایی قسـەی نەبێ، بۆ هەر نەفەرێك دوو مەئمووری داناوە لـەلای ڕاسـتو لـەلای چەپیەوە، هەمیشە هاونشینن بۆی، دوایی بەپێی ئەوەی وا نووسراوەو ئامادەکراوە، موحاکەمەی دەکرێ.

﴿مَا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ﴾: یەك وتە لەدەمی دەرنایە. مەگەر چاودێرێك، کەسێك کە خەریکی چاودێری کردنە، ئامادەیە و لەپاڵیایەتی، بۆ ئەوەی بینووسێ. جا ئیتر هەر ئائەمە بەسە بۆ ئەوەی ئینسان لەخەوی غەفڵەت دەربێ، داچڵەکێ، هۆشی بەخۆیەوە بێ.

﴿وَجَاءتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ بِالْحَقِّ ذَلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ﴾ : ئەوە ژیانی بوو، کە ئاوا لەژێر چاودێری خوای گەورەداو لەنێوان دوو دانە مەلائیکەدایە – کە مەسئولن و هاونشینن بۆی و هەمیشە وان لە گەڵیا– دوای ئەوەش ئەوا سەختیی مەرگ هات بەسەر وەختیەوە! ئەو سەختیەو ئەو رەنجەی لەهۆشی دەبا، لەسەرخۆی نایهێڵێتەوە، ئەوا هات.. هات تا ئەو ڕاستیە بێنێ لەگەڵ خۆی، ئەوەی وا لە پێشدا باس کرا. ئەوە کە ئەم مردنە بۆ ئەوەیە بڕوا بۆ قیامەتێك، تا لەوێ موحاسەبەو موحاکەمەی بکرێ. ئەمە شتێك نیە هەرەمە بێ.

﴿ذَلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ﴾ پێی ئەوترێ : ئەمە ئەو شتەیە خۆتت لێ لا ئەدا. پێت خۆش نەبوو بێتە پێشەوەو بێتە سەرڕێت. خۆتت بۆ ئامادە نەکرد. ئیحساسی مەسئولیەتت نەدەکرد، لەبیری ئەوەدا نەبووی ئەمە دێتە پێشەوەو سەرەتا دەبێ بۆئەوەی سوئالت لێ بکرێ و بکێشرێتە دادگا.

﴿وَنُفِخَ فِي الصُّورِ، وَنُفِخَ فِي الصُّورِ ذَلِكَ يَوْمُ الْوَعِيدِ﴾ : ئەوا فوو کرا بە شەیپووردا بۆ جاری دووەم( جاری یەکەم لێرە باس نەکراوە،

پێشتر باسمان لێکرد) ئەوا جاری دووەم فووکرا بەشەیپورا بۆ ئەوەی زیندووبینەوە. یانی دوای ئەوە ئینسان دەمرێ ، لەو بەینە دا ئیتر چی دەبێ ؟ ئەوەی باس نەکردووە. باسی ئەوە دەکا کە جاری دووەم شەیپور لێ دەدرێ بۆ ئەوەی هەموو زیندوو بینەوەولە قەبرەکان دەربێن، ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەڕەشەکەیە، ڕۆژی ئەو هەڕەشەیەیە وا کردمان کە : هەرکەس دەبێ بگا بە سزای خۆی.

جا با بزانین دوای ئەوە کە زیندووبونەوە چی دەکەن؟!

﴿وَجَاءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَائِقٌ وَشَهِيدٌ. لَّقَدْ كُنتَ فِي غَفْلَةٍ مِّنْ هَذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَاءَكَ فَبَصَرُكَ الْيَوْمَ حَدِيدٌ﴾ : هەر کەسێك هات، لەگەڵیا دوومەئمور هەن، یەکێکیان لێی دەخوڕێ و داویەتە بەر، ئەوی تریشیان شاهیدێکە لەگەڵی هاتووە تا شەهادەتی لەسەر بدا کەچی کردووەو چی نەکردووە. وەك چۆن لە دونیادا کاتێ تۆمەتبارێك لە زیندانەوە دەبرێ بۆ دادگا، پاسەوانێك مەلەفو ئەوراقەکەی هەڵدەگرێ لەگەڵ خۆی، یەکێکیش دەستی دەبەستێ بەدەستی خۆیەوەو دەیبات لەگەڵ خۆی، لەوێش ئاوایە. دوو نەفەر لە مەلائیکە، یەکێکیان دەچێ بۆ شایەتی دان، یەکێکیشیان دەیداتە بەرو مەئمورە کە بیگەیەنێتە دادگا.. کاتێ دەگاتە ئەوێ پێی ئەوترێ : هـا! بەڕاستی بیرت نەبوو بەلای ئائەمەوە؟ لەبیری ئەوەدا نەبووی ئاوەها ڕۆژێك دێتە پێشەوە؟ لەغەفڵەتا بووی، پەردە بەسەر بینایتەوە بوو، نەتئەدی؟ جا

ئەوا پەردەکەمان لابرد بەسەر چاوتەوە، جا بڕوانە ، ئیمڕۆ چاوت تیژە، ئیمڕۆ دیدەت وردبینەو باش دەبینێ. بڕوانە بزانە چی لەسەر ڕێتایە، چی چاوەڕوانت دەکات؟!

جا ئێستا دەردەکەوێ ئەم تاوانبارە خۆی تەنها نیە، یەکێکی‌تریشی لەگەڵدایە. ئاخرکاتێ ئینسان لەڕێگەی بەندەیی لایدا، خوای گەورە بڕیاری داوە یەکێك لە شەیتانەکان، لە سوپای ئیبلیس (شەیتانی گەورە) لە ڕێدا بکات بەڕەفیقی و هەمیشە لەگەڵی بێت بۆ ئەوەی زیاتر گومڕای بکات. هەروا ئەگەرکەسێك کەوتە سەر ڕێگەی بەندەیی‌و ئیمان، مەلائیکەی داناوە بۆ ئەوەی پشتگیری بکەن، تەئیدی بکەن، بەهێزی بکەن. جا کە دەگەنە ئەوێ، ڕەفیقەکەی، هاوملەکەی، ئەو شەیتانە بێ حەیاو بێ شەرمە ، دەست دەکات بەقسەکردن :

﴿وَقَالَ قَرِينُهُ هَذَا مَا لَدَيَّ عَتِيدٌ﴾ : ئەو هاوەڵە شەیتانەی دەڵێ : من ئەم کەسەم ئامادەکردووە، بۆ ئەوەی بیخەیتە جەهەننەم. لەبیری نیە خۆشی دەبێ تێی چێ. بەڕووداری‌و بێ حەیایەوە دەڵێ: من هەوڵم زۆر داوە تا ئەم کەسەم ئامادەکردووە بۆ جەهەنەم، فەرموو بیخەنە ناوی. نازانێ ئێستا فەرمان دەردەچێ بۆ خۆیشی، خوا دەفەرموێ :

﴿أَلْقِيَا فِي جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ. مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ. الَّذِي جَعَلَ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِي الْعَذَابِ الشَّدِيدِ﴾: ڕوو دەکاتە دوومەلائیکەکەو دەفەرموێ : ئادەی بیخەنە ناو جەهەننەمەوە،

هەرکەسێ کەوا زۆر حەقی دەخستە پشتگوێو، نەی دەڕوانی بۆ ئەو هەموو دەلیلو نیشانانەی لەئاسمانو زەوی و لەبەینی ئەوانەدا هەن، ئەو هەموو بەلگەو نیشانانەی هەبورن ئەومیان ئەسەلماند ئینسان پاش مردن زیندوو ئەبێتەوە ، دادگایی ئەکرێ ، پرسیاری لێ ئەکرێ.. ئەوانەی وا ئەو نیشانەو بەلگانەیان ئەخستە پشتگوێ، حەقیان قبوڵ نەئەکرد، ئەیان ئەویست حەق لە ژیانیانا دەرکەوێ، عادەتیان گرتبوو بە شتێکەوە و هەر ئەوەیان قبوڵ بوو، ئامادە نەبوون شتی‌تر- کە پێیان ئەگەیەنرێ- وەرگرن ، ئەوانەی وا خێرو بەرەکەتی زۆریان لەلابوو، رزقو رۆزی‌و نیعمەت‌و ئیمکانیاتی زۆریان لەدەستدابوو، بەلام ئەیان ئەهێشت بگاتە دەستی موستەحەقەکان و لای خۆیان گیریان ئەدا ـ ئەگەر چی زیاتر بوو لەوەش کە خۆیان ئیستیفادەی لێ بکەن ـ ئەوانەی لە سنوری بەندەیی و مەسئولیەت تێپەڕی بوون، ئەوانەی دڵیان دائەمەزرابوو، لە دوو دڵیا بوون، ئەگەر جارجارێك بۆ چەند لەحزەیەك باوەڕیان ئەکرد قیامەتێك هەیەو زیندووبوونەوە و موحاسەبە و موحاکەمەیەك هەیە، ئەو حالەتەیان زوو لەدەست ئەداو تووشی دوو دڵی ئەبوون.. ئەوانەی وا لەگەڵ ئەوەی خوایان هەبوو، فەرمانڕەوای تریان بۆخۆیان بڕیار ئەدا، فریادرەسی تریان بۆخۆیان دائەنا.. ئائەو جەریمە گەورەیە، ئەو گوناهە گەورەیە کە ئینسان خوای بێ، (اللّٰه)ی بێ، بەلام فەرمانڕەوای تروکۆمەککاری تریش قبوڵ بکا، لەبەرئەوەی ئیمانیان بە قیامەت

نـەبوو، لـە قیامـەت نـە نەترسـان، ئیحساسـی مەسئولیەتیان نـەبوو، شەریکیان بۆ خوا قـەرارداـ، فـەرمانی فـەرمانڕەواکانی تریشـیان قبـوڵ کرد، فەریادڕەسەکانی تریان کردە پشتو پەنای خۆیـان، فەریادڕەسـە درۆیینەکانو فەرمانڕەوا ناڕەواکان.. ئادەی لەبەر ئەوشتانە ئەوانە بخەنـە جەهەننەمەوە.. ﴿فَأَلْقِيَاهُ فِي الْعَذَابِ الشَّدِيدِ﴾ : بیاخەنە نـاو جەهەنـەم کە سزای سەختی تیایە ، هەم ئینسانەکەو هەم شەیتانەکەی هاوەڵی

لەوێدا هاوەڵە شەیتانەکە تەکان ئـەخواو بێرنەکاتـەوە کـە خۆیشـی موجریمەو، دەست دەکات بە عوزر خواستنو پاڕانەوە :

﴿ قَالَ قَرِينُهُ : رَبَّنَا مَا أَطْغَيْتُهُ وَلَكِنْ كَانَ فِي ضَلَالٍ بَعِيدٍ ﴾ ئـەڵێ : خاوەنەکەم! ـ خوایە! ـ من نەبووم کە وا لەم ئینسـانە بکـەم، کـە لـە ڕێگەی بەندەیی دەرچێ، من نەبوومە هۆی ئەوەی ئەو ئاوا بکا، خەتای خۆی بوو، من چی بکەم؟ خۆی بوو گومڕا بوو بوو، دوور کـەوتبووەوە لەڕێگەی هیدایەتو بەندەیی.. ئەگەر ئـەو خـۆی دوور نەکەوتایەتـەوە من ئەمتوانی چی بکەم؟ چۆن ئـەمتوانی لـەڕێ دەری بکـەم؟ دەی بـۆ فەرمان ئەدەی منیش بکەومە ناو جەهەنـەم؟ کـەی خـەتای مـن بـوو؟ بەڵکو خەتای خۆی بوو..

دیارە درۆ ئەکا، ئەویش خەتای بووە، ئەوەتا خوا ئەفەرمووێ :

﴿ قَالَ: لَا تَخْتَصِمُوا لَدَيَّ وَقَدْ قَـدَّمْتُ إِلَـيْكُم بِالْوَعِيـدِ ﴾ خـوا ئەفەرموێ : لای من کێشمەکێش مەکەن. لای من وت وویژ مەکـەن.

شەڕ مەکەن ، لەسەر ئەوە ئەم بلێێ خەتای تۆ بوو، ئەو بلێ خەتای تۆ بوو.. ئێستا جێی ئەوە نیەو کاتی ئەوە نەماوە، لە حاڵێکا پێشتر هەڕەشەم کرد، وتم : خەتەرێك لەرێدایە، ئەگەر لە دونیادا کاری خۆتان دروست نەکەن، لەدوایەدا گرفتاری عەزاب دەبن! ئیتر مەعزەرەت و بەهانەیەك نەماوە و تەواو بوو.. فەرمانەو دەرچووەو ئەبێ ئیجرا بکرێ..

﴿مَا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ وَمَا أَنَا بِظَلَّامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ : بڕیارێکەو لای من ناگۆڕێ. من وانیم زوڵم و زۆر بکەم لە بەندەکان. ئەگەر کەسێ نەکەوێتە دۆزەخ خۆی ستەمی لەخۆی کردووە، ئەگەربەناهەق و بێ گوناه کەسێ بخەمە دۆزەخ ئەوە زوڵمەو زۆرێکی تەواو زۆر ئەبوو.. ئەوکاتە ئەو وەصفە بۆ من پەیدا ئەبوو کە (ظَلاَّم) بم، واتە زۆر ستەمکار.. بەڵام من ئاوا نیم..

﴿ يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ امْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِنْ مَزِيدٍ ﴾ : ئەوەش لە رۆژێکا ئەبێ ئێمە بە جەهەننەم دەڵێین : ئەرێ پڕ بووی؟ یانی بڕیارمان لەسەر ئەوەیە پڕی کەین. ئەویش ئەڵێ : ئەرێ هی تر ماوە؟ ئەگەر هیتر ماوە بابێ. ئەویش تورە بووە و قەراری لەسەر ئەوەیە تا جێی دانەیەکی تریشی تیا بێتەوە هەر داوا بکا، ئەوەندەی تێبکەن تا پڕ ئەبێ.

ئەوە سەرەنجامی ئەوانەیە کە ئیمانیان بە رۆژی قیامەت نیەو لەریی بەندەیی خوا لایان داوە..

بەڵام لەولاوە ئەوانەی باوەڕیان بە رۆژی قیامەت هەیە، ئەزانن خوای گەورە ئەتوانێ ئینسان زیندوو بکاتەوە، حەتمەنیش زیندووی دەکاتەوەو، دەیکێشێتە دادگا، موحاکەمەی دەکا، بە پێی کردەوەی دونیای پاداشتو سزای دەداتەوە.. بزانین ئەوان حاڵیان چۆنە؟!

﴿ وَأُزْلِفَتْ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴾ : ئەوا بەهەشت ئیفتیخاری پێ دراوە، بەوەی نزیك کراوەتەوە لە (موتتەقییەکان)، لە پارێزکارەکان، ئەوانەی کارو پیشەیان هەمیشە ئەوە بوو خۆیان بپارێزن لەوەی خوا پێی ناخۆشە.. بەجۆرێك نزیك کراوەتەوە کە هیچ دوور نییە، بەتەواوی نزیکە. ئەوە فەخرو شانازییە بۆ بەهەشت کە نزیك کراوەتەوە لە تەقوادارەکان.

﴿ هَذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ ﴾ پێیان ئەوترێ : ئەمە ئائەوەیە وا وەعدتان پێ‌ئەدرێ، برپارە تاوێکیتر بڕۆنە ناوی. بۆ کێ؟ بۆ (أواب) بۆ هەرکەسێ هەمیشە کاری ئەوە بێ بگەڕێتەوە بۆلای خاوەنەکەی. ئەگەر غەفڵەتێ، گوناهێ، خەتایەکی لێ ڕوو ئەدا، زوو بگەڕێتەوە بۆلای خاوەنەکەیو ئەمێنێتەوە لەسەر غەفڵەتو گوناه. (حفیظ) کەسێك وا هەمیشە خۆی ئەپارێزێ لەوەی بەرێگای ترا بڕواو گومڕا بێتو هاوڕێی شەیتانو شەیتانەکان بێ..

﴿ مَنْ خَشِيَ الرَّحْمَانَ بِالْغَيْبِ وَجَاءَ بِقَلْبٍ مُنِيبٍ ﴾ : کەسێ وا پێش لەوەی عەزاب ببینێ لەخوای بەرەحم ترساو ئیحساسی مەسئولیەتی کرد. ﴿وَجَاءَ بِقَلْبٍ مُنِيبٍ ﴾ : بەدڵێکەوە هات بۆلای خوا کە هەمیشە گەڕاوەیە بۆلای ئەو، دڵێك وا هەر جار تووشی غەفڵەتو ئینحرافو لەرێ لادانێ بوو بێ، کاری ئەوە بووە زوو بگەڕێتەوە بۆ لای خوا..

﴿ ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ ﴾ پێیان دەوترێ : ئادەی بڕۆنە ناوی، بڕۆنە ناو بەهەشت بە سەلامەتیەوە. دڵنیا بن رزگارن لەهەر شتێ ناخۆش بێ، لەهەر بەلاو ئافەتو موصیبەتێ.

﴿ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُلُودِ ﴾ : ئائەوە رۆژی هەمیشە مانەوەیە، رۆژێکە کە چوونە ناو بەهەشت ئیتر لێی نایەنە دەرەوە.

﴿ لَهُمْ مَا يَشَاءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ ﴾ : هەرچییەك بیانەوێ لەناو بەهەشتا هەیە. چی داوا بکەن لەبەهەشتا بۆیان ئامادە دەکرێ. لای خۆمانەوە زیادەیەکیشیان بۆ هەیە، شتێك زیاد لەوەی خۆیان داوای نەکەن، یانی هەندێ لە پاداشتەکەیان ئەوەندە گرنگو گەورەیە کە خۆیان رێیان لێی ناکەوێ و بیریان نیە داوای بکەن.. ئەوەش وەك لێخۆش بوونو رێزێکی تایبەتی خوای گەورە کە لە هەموو نیعمەتەکانی بەهەشت گەورەترە.. ﴿ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ﴾.

کەواتە روون بووەوە ئینسان دوای مردنی زیندوو دەبێتە، روون بووەوە ئینسان لە ژیانی دونیادا وا لە حاڵەتی تاقیکردنەوەداو پاشان

تووشی دادگایەك ئەبێ و سەرەنجامی یا جەهەننەم دەبێت یا بەهەشت..
پاشان دەفەرموێ : تەنها ئەمە نیە بۆ ئەوانەی کە لە ڕێی بەندەیی لایان دا، یا ڕێی بەندەیی‌یان گرت، تەنها پاداشت‌و جەزای قیامەت نیە، لەدونیاشدا شتانێك هەن! ئەفەرموێ :
﴿ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُمْ مِنْ قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُمْ بَطْشًا فَنَقَّبُوا فِي الْبِلَادِ هَلْ مِنْ مَحِيصٍ ﴾ : پێش لەوان چەندین گەلو نەتەوەی هاوزەمانمان لەناوبرد، خەڵکانێك کە لەزەمەنێکا بەیەکەوە ئەژیان، ئەوانە لەدەسەڵاتیانا بەهێزتر بوون، بۆیە بە بەڵاو موصیبەت لەبەینمان بردن.. نەخێر، لەمان بەدەسەڵات تر بوون، ئەوانە ڕوویان کردە ئەملاوئەولاو ئەم کونو ئەو کون، بە نیازی دەرباز بوون، وتیان : خۆزگە جێگایەك هەبێ لێیەوە فیرار کەین‌و دەرچین لەدەست ئەم عەزابە.. کەوتنە هەوڵ‌و تەقەلای ئەوە لەدەست عەزابەکە و لەدەست نابودی‌یەکە دەرچن.. بەڵام پێیان نەکراو گرفتار بوونو لە بەین چوون، کەوابوو لەدونیاشدا تۆڵەسەندنەوەیەك هەیە لەو کەسانەی لەڕێی بەندەیی لادەدەن..
﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَنْ كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴾ : بەراستی ئالەوەدا کە تا ئێستا باس کرا ـ هەرلەسەرەتای سوورەتەکەوە تا ئێستا ـ بیرخستنەوەیەك هەیە بۆ کەسێك کە دڵێکی

بووبن، یا کەسێك گوێی دابێ بەم باسە، لەحاڵێکا کە حەواسی بووبێ، هۆشی بەلای قسەکانەوە بووبێ.

ئەو بەشەی سوورەتەکە -کە دەلیلو نیشانە بوو- ئەوە کاری بە دڵەوە هەیە، تا ئەوێ کە فەرمووی: ﴿ بَلْ هُمْ فِي لَبْسٍ مِنْ خَلْقٍ جديد ﴾ چەند نیشانەو بەڵگەیەك باس کران بۆ ئەوە کە خوا ئەتوانێ ئینسان زیندوو بکاتەوە. ئائەوە شتێکە دڵی ئینسان وەری دەگرێو ئیمانی پێ‌ئەهێنێ. لەوەولای سورەتەکە باسی ئەوەی کرد ئینسانی خەلق کرد، جا ئیتر ئەزانێ چی بە دڵیا گوزەر ئەکا، ئینسان چاودێری ئەکرێ لەلایەن خوای گەورەوە، لەلایەن دوو مەئمورلەمەلائیکەوە، کەسێك کە گوێ بدات بەو قسانەو هۆشی بەلایانەوە بێت، هۆشی لەلای تر نەبێ، حەواسی جەم بێ، ئائەوانە بەسەن بۆی، بیخەنەوە بیری کە مەسئولەو، قیامەتێك هەیەو، ئەبێ خۆی ئامادە بکا بۆ ئەو ڕۆژە..

بەو جۆرە روون بووەوە زیندووبوونەوەی دوای مردن ڕاستو دروستە، ئەوانەی ئیمانیان پێی بێ سەرەنجامیان خۆشبەختی‌یە، ئەوانەش باوەڕیان پێی نەبێ سەرەنجامیان بەدبەختی‌یە..

﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾ جا ئێستا وەڵامی ئەوانە ئەداتەوە دوای ئەوهەموو روونکردنەوەیە هەر باوەڕیان نیەو ئینکاری ئەکەن. ئەفەرموێ : ئێمە ئاسمانەکانو زەویو هەرچی‌یەك لەبەینیاندایە، لەشەش ڕۆژگارا

دروستمان کردن، لە شەش زەمانا، کە زۆر تولانی بوون، جا هەرکامیان خوای گەورە ناوی ئەنێ رۆژێك (رۆژی حوا وەك رۆژی ئێمە نیە)، ئەفەرموێ : ئەمانەمان دروست کردن لەشەش رۆژگارا، هیچ ماندووبوونێك تووشمان نەهات.. دەی کەسێ ناوەها دەسەلاتیکی بێ، ئاسمانەکانو زەویو نێوانیان دروست بکاو تووشی کەمترین ماندووبوتیش نەبێ، دیارە زۆرسادە ئەتوانێ ئینسان جاریکیتر زیندوو بکاتەوە. کەوابوو بڕوبیانوەکانیان بێ جێیە، دەی کەواتە ﴿فَاصْبِرْ عَلَى مَا يَقُولُونَ﴾ : صەبر بکە - ئەی محمد- لەسەر ئەو قسانەی کە دەیکەن. صەبر بکەو نارەحەت مەبە. خۆت خەریك مەکە بە بیرکردنەوە لەو مەسەلەیە. خەریکی شتی تر بە. خەریکی جێبەجێکردنی ئەرکی خۆت بە.. دوای ئەوە ئەمەت بەیان کرد، حەقت رۆشن کردەوە، ئیتر مەسئولیەت لەسەر شانی تو نەماوە، تو ئیتر لێپرسراو نیت.دوای ئەوە خەریکی کاری خۆت بە.

﴿وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ وَقَبْلَ الْغُرُوبِ. وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَارَ السُّجُودِ﴾ : لەوکاتانە ئێستا بەیان ئەکرێن تۆ (تەسبیح)و (حەمد) بکە، تەسبیح بکە یانی : ئەو شتانەی نابەجێو نادروستو خراپن لەوانە دەرچو (لە بیری خراپ، لە قسەی خراپ، لە کردەوەی خراپ). (حەمد)یش بکە یانی : ئەو شتانەی باشن (لە بیری چاك، لە قسەی چاك، لە کردەوەی چاك) ئەنجام بدە.. بەمە بە زەمانی

حاڵ بەیانت کردووە کە خاوەنەکەت پاکو بێعەیبە. بۆیە تۆ لەبەرانبەر ئەوەوە ئاوەها حاڵەتێکت نیە کە قسەی خراپ یا بیری خراپ یا کردەوەی خراپت بێ.. تۆیەك کە مەخلوقی ئەوی نەتوانی باش بی، بەجۆرێ دروستی کردووی ئەتوانی باش بی، بۆیە بەرەو باشە ئەڕۆی..کاتێ کردەوەی باش، یا قسەی باش، یا فیکرێکی باش ئەنجام ئەدەی، ئەوە قەدرزانی لەخاوەنەکەی خۆت ئەکەیت، چونکە خاوەنەکەت باشە کە تۆی موەفەق کردووە بۆ ئەوەی بەو جۆرە بی.

تەسبیحو حەمدی خاوەنەکەت بکە لەم کاتانەدا : پێش لەوە خۆر هەڵبێ، لەنوێژی بەیانیدا. هەروەها پێش لە ڕۆژئاوا بوون ، لەنوێژی نیوەڕۆو عەسردا. هەروەها بەشێك یا چەند کاتێك لەشەویش، تەسبیحی بکە، لەو شتە ناڵەبارانە دوور بکەوەرەوە، لە نوێژی مەغریب، لە نوێژی عیشادا، لەغەیری ئەو کاتەشا. (کەسانێ بیانەوێ جگە لەو نوێژانە بکەن ، ئەتوانن نوێژی تر بکەن کە پێی ئەوترێ شەو نوێژ، یا نوێژی وەتر، یا تەهەجوود، ناوی زۆری هەن بەڵام یەك شتن کەلەیەك ڕکات تا یازدە ڕکات ئەبێ، ئەکرێ پێش خەوتن بکرێ، ئەکرێ لەنیوەشەوا بێ، ئەکرێ لەئاخری شەوەوە بێ، لەوەختی سەحەرو پارشێو کردن)دا. ﴿وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَارَ السُّجُودِ﴾ هەروەها دوای سەجدە بردن بۆ خوای گەورە، ئاخر نوێژو سەجدە بردن لە نیوەڕۆوە دەست پێ دەکات.. نوێژی نیوەڕۆ، نوێژی عەسر،

نوێژی مەغریب، نوێژی عیشا، نوێژی وەتر، ئەوە پێنج دانەیە.. نوێژی بەیانی ئەوە شەش، کە خۆر هەڵات ئیتر وەختی سجود نەماوە، وەختی کەسب‌وکارە.. ﴿أَدْبَارَ السُّجُودِ﴾ بە دوای نوێژەکاندا کە وەختی کەسبو کارە، وەختێ خۆر هەڵدێ، لەوێش هەر تەسبیح بکە، بە فیکرێك، بە قسەیەك، بە کردەوەیەك، بکەوە بیری ئەوەی ئەبێ تۆ لەوەی وا نادروستەو ناڵەبارە هەڵبێی‌و رابکەی، بچی بەرەو ئەوەی چاکەو، وەزعی خۆت بگۆڕی، ئەگەر وای لەوەزعێکا کە پەسەند نیە.. خۆ ئەگەر بە زمانیش تەعبیری لێ بکەیتەوەو بڵێی (سبحان الله) باشترە.

﴿ وَاسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ الْمُنَادِي مِنْ مَكَانٍ قَرِيبٍ. يَوْمَ يَسْمَعُونَ الصَّيْحَةَ بِالْحَقِّ ذَلِكَ يَوْمُ الْخُرُوجِ. إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا الْمَصِيرُ. يَوْمَ تَشَقَّقُ الأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا ذَلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ. نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِجَبَّارٍ. فَذَكِّرْ بِالْقُرْآنِ مَنْ يَخَافُ وَعِيدِ ﴾[١].

---

[١] - واتە: چاك گوێ بگرە لەو ڕۆژەدا جاڕدەر لە شوێنێکی نزیکەوە هاوار دەکا. ئەو ڕۆژەی ناڵە گەورەکە بەڕاستی دەبیستن ئەوە ڕۆژی هاتنە دەرەوەیە. بەڕاستی ئێمە زیندوو دەکەینەوە و دەمرێنین و چارەنوس بولای ئێمەیە. ڕۆژی زەوی بەپەلە بۆیان شەق و پەق دەبێ. ئەو گردکردنەوەیە بۆ ئێمە ئاسانە. ئێمە بەئاگاترین دەرهەق بەوەی کە دەیڵێن. تو بەسەریاندا زوّر زال نیت تو بە قورئان یادی ئەوانە بخەرەوە کە لە هەڕەشەی من دەترسن

(واتای ئەم چەند ئایەتەی پەرەگرافی لەلایەن ئامادەکارەوە کراوەو لەشریتەکانی مامۆستادا واتا نەکرابوون) (دەرگای بەرهەم)

## بەشێك لە تەفسیری سورەتی (الحاقة)

شتێکی‌تریش ماوە باسی بکرێ لەوانەی کە لە قیامەتا ڕوو دەدەن، هەندێکی لەکاتی بانگ کردنی خەڵك بۆ دادگا ئەبێ، هەندێکیشی ئەو شتانەن کە لە بەهەشت‌و جەهەنەما ڕوو ئەدەن.

لە سورەتی (الحاقە)دا دوای باسی ئەوە کە فوو دەکرێ بە شەیپوڕا ئەفەرموێ : کەژو کێوەکان لەگەڵ زەویدا هەڵئەگیرێن‌و، بەتوندی ئەکوترێن بەسەر یەکدا، بەجۆرێك لەت‌وپەت ئەبن زەوی ساف‌و سارا ئەبێتەوە، ئاسمان لەت‌وپەت ئەبێ‌و، لەو مەحکەمیە کە هەیەتی دەرئەچێ‌و شل‌و سست ئەبێ، بەجۆرێك فریشتەکان ئیتر وەك لەوەو پێش نین کەلەو جێگایەی خۆیانا هەیان بوو بوەستن، لەو کاتەوە مەجبورن لە گۆشەوکەناری ئاسماندا ڕاوەستن.. دوایی باسی ئەوە ئەکا کە لە دادگای خوادا- لە دوارۆژدا- نمایش (ئیستیعراز)ی عەسکەری ئەنجام ئەدرێ لە حزوری خوای گەورەدا، بەندەکانی ڕیزە ئەدەن ونمیان بینێ، چاك‌و خراپ ئەکەوێتە بەرچاوی، هیچ شتێك لێی شاراوە نابێت. هەروەك چۆن باوە لە سەربازگەکاندا فەرماندەی گەورە ئەچێتە سەر جێگایەکی بەرز(لە ئێراندا پێی دەڵێن (جایگاە)، سەربازەکان دەستە دەستە بە بەردەمیا ئەڕۆن، سەیری جموجوڵیان ئەکا، ئەگەر دەستەیەکیش باش تێ پەڕی ئافەرینیان ئەکات، دەستەیەك خراپ ڕۆیشت سەرزەنشتیان ئەکا، لە قیامەتیشدا (جێگایەکی بەرز) بۆ خوای

گەورە هەیە کە عەرش وتەختی فەرمانڕەوایی خۆیەتی، لەو ڕۆژەدا جەلالو گەورەیی خوای (متعال) دەرئەکەوێ. ئەو تەخت وعەرشە وەك تەختی تر نیە.. ئاخر تەختی عادی چوار پێ هەڵی ئەگرێ، چوار پێ بەسە بۆ ئەوەی تەختی فەرمانڕەوایی هەڵگرێو، فەرمانڕەوا بەسەریەوە دانیشێ.. بەڵام وەختێ فەرمانڕەوا کە زۆر بەهەیبەت و سەنگین بوو ئیتر چوار پێچکە بەس نیە، ئەبێ دوو بەرانبەر بێتەوە، ئەبێ هەشت پایە هەڵیگرێ. جا خوای گەورە زۆرێك لە دەسەلاتو (عەزەمەتو قودرەت)ی خۆی تا ئێستا نیشان نەداوەو نەی نواندووە، ئەو ڕۆژە نیشانی ئەدا. ﴿وَالْمَلَكُ عَلَى أَرْجَائِهَا وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾ : عەرشی خاوەنەکەت بەسەریانەوە هەشت هەڵی ئەگرن. جا ئیتر خۆی ئەزانێ هەشت چی هەڵی ئەگرن، ئەو بەشەی کارمان پێوەی نیە، ئەوەندە بزانین کە لەو ڕۆژەدا جۆرێکیتر خوای موتەعال خۆی دەرئەخا، عەزەمەتو گەورەیی خوا جۆرێکی تر دەرئەکەوێ.

دیارە مەبەست ئەوە نیە کە خوا وەك فەرمانڕەوایەکی بەشەری، یا وەك هەر مەخلوقێك لاشەی ئاوای هەبێت. مەبەست ئەوە نیە سەنگینیەکەی سەنگینیەکی مادی بێت، وەك سەنگینی لاشەی بەشەرێك بێت.. مەبەست ئەوەیە گەورەییەکەی وا دەرئەکەوێ، لەو ڕۆژەدا وا ئەنوێنێ وەك ئەوەی کە شتێکی گەورە بنرێ بەسەر تەختێکەوە و، چوار پێ ئەتوانێ هەڵی بگرێ، ئەبێ دوو بەرابەر

بێتـــەوە، جـــەلالو گـــەورەیی ئـــەویش لـــەو ڕۆژەدا دوو بەرانبـــەر دەرئەکەوێ، تا فەرمانڕەوایی‌و خاوەن بوونەکەی زۆرتر دەرکەوێ..

﴿يَوْمَئِذٍ تُعْرَضُونَ لَا تَخْفَى مِنكُمْ خَافِيَةٌ﴾ : ئـەو ڕۆژە لـە حـزوری خوای گەورەدا ئیستیعرازتان پێ‌دەکرێ‌و نمایش ئەکرێن. جا ئیتر هەموو شتێك لەوانەی شاراوەن لەو ڕۆژەدا لاتان ئاشکرا ئەبن.. بەپێچەوانەی ئەو نمایشانەی کە لە دونیادا بۆ فەرمانڕەوایانی بەشەری ئەنجام ئـەدرێن، کـە هـەر دیمـەنی دەرەوە و ڕواڵەتـەکان ئـەبینن. خـاوەنی عەرشـی فەرمانڕەوایی جیهان (خوای گەورە) هەموو شاراوەکان ئەبینێ، هیچێك لێی ون نابێ. جا کە خەڵکەکە لە خۆنواندنەکە بوونەوە بـە پێـی ئـەو سەیرکردنەی کە کردوویەتی ئەیانکات بە دوو دەستەوە :

﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِيَمِينِهِ فَيَقُولُ هَاؤُمُ اقْرَؤُوا كِتَابِيَهْ. إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَاقٍ حِسَابِيَهْ﴾ : ئەو کەسـەی کتێبەکەی، (نامـەی کردەوەکـانی)، مەلەفەکەی، بەدەسـتی ڕاسـتی‌یەوە بـدرێ، ئـەوە لەوپـەڕی خۆشـیدا بەدەنگی بەرز بانگ ئەکاتە ئەملاونـەولای‌و ڕوو ئەکاتـە هاوڕێکـانی و موسوڵمانەکانی‌ترو ئەڵێ : ها! بگرن، نامەکەم (مەلەفەکەم) بخوێننەوە. ئەمە ئەڵێ، لەبەرئەوە کە شتێکی تیا نیە پێی خـۆش نـەبێ خـەڵك پێـی بزانێ.. چونکە یا لە موسـوڵمانانی دەستە یەکەمە ـ لە (سـابقین)ە کـە گوناهی گەورەو کرداری ناپەسـەندو خراپـی ئـەنجام نـەداوە.. یـا لـە موسوڵمانانی دەستەی دووەمـە ـ لـە (أصـحاب الـیمین)ە ـ لەوانـەی

ئەگەر جارجار شتێك لەو گوناهانەی ئەنجام داوە، زوو تەوبەی کردووەو گەڕاوەتەوە، چونکە ئیمانی دامەزراولە دڵیدا بووە، هەروەك لە پێشەوە بەیانمان کرد. جا لەبەرئەوە بەو پەڕی شانازیو سەربەرزییەوە، بێئەوەی تۆزێك ترس لە دڵیا بێ کە شتێکی نەشیاو لەناو کارنامەکەیدا ببێتو خەڵك پێی بزانن‌و ئابڕوی بچێ، دەنگ بەرز ئەکاتەوەو بانگ ئەکاتە هاوڕێکانی‌و دەوروبەرەکەی : وەرن، نامەی کردەوەکانم بخوێننەوە، ئاخر من حاڵی بوو بووم، ئەو نەتیجەیەم گرتبوو کە بەم جۆرە ئەگەم بە حسابو کتابی خۆم.. ئەوەم زانی بوو ڕۆژێ دێتە پێشەوە کە حسابم لەگەڵ ئەکرێت، موحاکەمە ئەکریم، هەر لەسەر ئەساسی کردەوەی خۆم پاداشتم پێئەدرێتەوە، بۆیە خۆمم ئامادە کردبوو بۆ ئەم ڕۆژە، بۆیە ئێستا ڕووم هەیە کە پەروەندەکەم (مەلەفەکەم) پیشانی ئەم‌وئەو بدەم.

﴿فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ. فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٍ. قُطُوفُهَا دَانِيَةٌ﴾ : جا ئیتر ئەوەی کە ئاوایە لە ژیانێکدایە ئەوەندە لە ژیانەکەی ڕازییە کە ژیانەکەیش لە خۆی ڕازییە!! ژیانەکەش لەخۆی ڕازییە چونکە ساحێبەکەی زۆر لێی ڕازییە. لەباخێکی پڕگەڵاو لق‌و پەلدا، لە جێیەکی بڵندا، لە باخێکی بەرزا، کە لە عەینی ئەوەدا درەختەکانی بەرزن‌و جێگاکەی بەرزە، میوەو بەرهەمەکانی -کە وەختی چنینیان

گەیشتووە- زۆر نەرمن و لەبەردەستدان، بە جۆرێك ئیسان هیچ تووشی ماندوێتی نابێت بۆ لێکردنەوەی بەرهەمەو میوەکان..

﴿كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئاً بِمَا أَسْلَفْتُمْ فِي الْأَيَّامِ الْخَالِيَةِ﴾ : جا پێیان ئەوترێ : بخۆن و بخۆنەوە، لەبەری ئەو کردارە باشانەی‌لەوەو پێش، لە رۆژانی رابردوودا ئەنجامتان داوە.

﴿وَأَمَّا مَنْ أُوتِيَ كِتَابَهُ بِشِمَالِهِ فَيَقُولُ يَا لَيْتَنِي لَمْ أُوتَ كِتَابِيَهْ. وَلَمْ أَدْرِ مَا حِسَابِيَهْ. يَا لَيْتَهَا كَانَتِ الْقَاضِيَةَ. مَا أَغْنَى عَنِّي مَالِيَهْ. هَلَكَ عَنِّي سُلْطَانِيَهْ﴾ : بەڵام ئەوەی ملەفەکەی ئەدرێ بەدەستی چەپیەوە ئەڵێ : ئای! خۆزگە کتابەکەم (کارنامەکەم) نەئەدرا پێم.. بەدەنگێکی پڕ لە حەسرەت و ماندوویەتی، بەهەناسە هەڵکێشانەوە، ئەڵێ: ئاخ! خۆزگە هەر ئەم ئەزانی حیسابم چیەو موحاکەمەم چیەو چۆن حسابم لەگەڵ ئەکرێ وکردارەکانم چۆن هەڵئەژمێررێن. ئاخ خۆزگە ئەو مردنەی وا تووشم هات کاری منی یەك سەرە بکردایەتەوە، ئیتر هەر زیندوو نەئەبومەوە، یا ئائەم رۆژەم نەدیایە. خۆ سامانو ماڵەکەم هیچ کەڵکێکی پێ‌نەدام، لەکەمترین سزاو دەردی سەری رزگاری نەکردم. خۆ دەسەڵاتەکەم هەر لێم ون بووەو لەناوچووە، هیچی نەگەیشتوەتە فریام.

جا لەلایەن خوای گەورەوە فەرمان دەرئەچێ و ئەفەرموێ :

﴿خُذُوهُ فَغُلُّوهُ. ثُمَّ الْجَحِيمَ صَلُّوهُ. ثُمَّ فِي سِلْسِلَةٍ ذَرْعُهَا سَبْعُونَ ذِرَاعاً فَاسْلُكُوهُ﴾ : بە فەرمانێکی پڕ لە هەیبەتو توڕەیی، فەرمان ئەدا کە : (بیگرن، پاشان کۆتو زنجیر بکەنە ملی، دەستی لەگەڵ ملی بەیەکەوە ببەستن. جا بەو ئاگرە تیژو زۆر سەختە کە هەڵگیرساوە بیسوتێنن، بیخەنە ناوی با گرفتاری بێ. جا لە نێو زنجیرێکا -کە حەفتا زیراع درێژە - بیبەستنەوە، بالەکاتی سزاداندا نەتوانێ بجولێتەوە). بۆ؟! چی کردووە؟! ئاخر لەبەرئەوەی کە :

﴿إِنَّهُ كَانَ لَا يُؤْمِنُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ. وَلَا يَحُضُّ عَلَى طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾ : لەبەرئەوە ئیمانی بەخوای گەورەو بە عەزەمەت نەبووە، تەسلیمی ئەوە نەبووبوو کە خوا فەرمانڕەوایەتیو تاکە فەریادڕەسیەتی و ئەبێ لە ژیانا هەرئەو پشتو پەنای بێ. گوناهی دووەمی ئەوەبوو ئەك خوی خواردەمەنیەکی ئەئەدا بەگەدایەك، بە فەقیرێك، تەشویقی خەڵکیشی ئەئەکرد، خەڵکیشی هان ئەئەدا لەسەر ئەوکارە، تەنانەت پێی خۆش نەبووخەڵکیش ئەو کارە بکەن، ئەوە ڕەفتی بوو لەگەڵ خوا، ئەوەش کاری بوو لەگەڵ بەندەکانی خوا، کەوابوونەیێلە سزای ئەوانەدا هەروەك ئاتەوانە بچەژێتەوە، سزاکە چی‌یە؟!

﴿فَلَيْسَ لَهُ الْيَوْمَ هَاهُنَا حَمِيمٌ﴾ : ئیتر ئیمڕۆ لێرە دۆست ومودافیعێکی نیە، کە بۆی گەرم بێتو دیفاعی لێ بکا.

﴿وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ. لَا يَأْكُلُهُ إِلَّا الْخَاطِؤُونَ﴾ : ئیمرۆ هیچ خۆراکێکی نیە مەگەر شتێك لە (غسلین)، ئەو خۆراکەی کە لەو درەختەیە وا لە جێی ترا قورئان ناوی ئەنێ (ضریع) یان (زقوم)، چونکە لە جێیانیتر فەرمویەتی غەیری (زقوم)و (ضریع) خۆراکی تری نیە.. لێرەش ئەفەرموێ : غەیری (غسلین)ی نیە. ئەوە دەری ئەخا هەموویان یەك شتن، درەختەکە ناوی (زقوم)ە، (ضریع)یشە چونکە درکی تیژی پێوەیە، کاتێ بدات لە گوانی وشترو شتیوا لە کاتی لەوەڕیانا لەتو پەتی ئەکا بەیەکا، خۆراکەکەش کە لێی ئەکرێتەوەو ئەخورێ (غسلین)ە ، ڕەنگە لەبەرئەوە ئەو ناوەی لێ نرابێ کە کاتێ ئەیخۆن هەموو دەروونیان دائەشۆرێو دایئەماڵێ بەیەکا!! تەنها ئەو کەسانە ئەیخۆن کە بە عەمدی لە ڕێگەی بەندایەتی خوای گەورە لایان داوەو ئیمانیان پێ نەبووەو، بیریان بەلای فەقیرو هەژارەوە نەبووە.

بە کورتی ئەهلی بەهەشت لە دوو عەیب کە لە ژیانی دونیایەدا هەن دوورن، یەکەم : ئەوەی کە هیچ خەفەتیان نیە.. دووەم : ئەوەی کە هیچ ترسیان نیە. خەفەتیان نیە چونکە هەر ئاواتێ بخوازن دێتە دی ، خەفەتیش لەبەرئەوە ئەخورێت کە ئینسان ئاواتێکی بێ نەهاتبێتە دی.

﴿لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَاؤُونَ﴾ :هەرچییان دەوێ لەو جێیەدا هەیە، هەرچیەکیشیان پێئەدرێ بۆ هەمیشە لە دەستیانا ئەمێنێتەوەو لێیان ناسەندرێتەوە، کەوابوو (ترس)یشیان نیە چونکە ترس لەبەرئەوەیە کە

ئینسان ئەو خوورپەیە بکەوێتە دەروونیەوە، کە شتێك لەوانەی هەیەتی لــە دەستی بچێ. ﴿ خالـدین ﴾ : ئـەوان بـۆ هەمیشـە لـەوێ ئەمێننــەوە، ئەترس و ئەخەفەت ـ ئەو دوو عمیەی کـە ژیـانی دونیـایی کەســێ تـاڵ ئەکەن کە (مؤمن) نەبێ ـ لەوێ باسی نیە.

بەلاَم جەهەننەمی مسکەن دیارە کە جەهەننەمەو، هـەر ئەفـەرێکیش زۆرێکی بۆ دروسـت ئـەکرێ لـە ئـاگر، وەك ئـەو جێگـە تەلەفونانـە کەلەسەر جادە هەن. ﴿إِنَّهَا عَلَـيْهِم مُّؤْصَـدَةٌ﴾ : دۆزەخ لەسـەریان داخراوەو دەرگایشی نیە. لەهەمولاوە مەحکەم کراوە تا ڕێی دەرچوون نەبێت. بۆ ئەوەش کە ڕێی دەرچوون بە هیچ جۆر نەبێ، لە سوچەکانیا بە ستونوکۆڵەکەی مەحکەم توندوتۆڵ کراوە، تا هـەرگیز کـەلێنێکی تـێ نەکـەوێو جێگـای دەرچـوونو هـەلاَتن نـەبێ. ئـەوە مەســکەنو جێ‌نیشتەنی.

بۆ پۆشاکیش ئەفەرموێ ﴿سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٍ﴾ : کراسی ئەیکەنە بەریان لە (قطران)ە، کە مادەیەکی ڕەشە بۆنەزیەت کردنیـان، ڕەنگـی ڕەش ئەعصابی ئینسان تێك ئەدات، ئەگەر زۆر چاوی لێ بێـت. ئـەو کراسـە، بۆگەنە. چەورە. ئاگرئەکێشـێ. دیـارە وەك قیریـش ئەتوێتـەوە بەدەنیاندا. ئەوەش پۆشـاك!! خـۆراکیش ئـەوە بووکـە باسمـان کـرد: (غسلین ، ضریع ، زقوم).

بۆ ئاوو هەر جۆرە خواردنەوەیەکی تریش ئەفەرموێ : ئاوێکی زۆر داخی گەرم کە کاتێ ئەیخۆنەوە ڕیخۆڵەو هەموو ناوسکیان لەتو پەت ئەبێ ﴿فَقَطَّعَ أَمْعَاءَهُمْ﴾ : ناوسکیان هەموو پارچە پارچە ئەکات. دوای ئەوەش ئەفەرموێ : بەتەمای ئەوە مەبن ڕۆژێ ئازارتان سوك كرێ، ڕۆژێ لەسەرتان هەڵگیرێ، ئەگەر قەرار بێ شتێکتان بۆ زیاد کەین عەزابەو هیچیتر: ﴿فَذُوقُوا فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا﴾.

## بەشێك لە تەفسیری سورەی (الواقعة)

لە سورەی (واقعە)دا باسی ئەو کەسانە دەکات کە دەعوەتی دینیان پێگەیشتووەو، دینیان بۆ ڕۆشن بۆتەوە، ئەیان کات بە سێ بەشەوە، هەر بەشێکیان باسی جەزایەکی تایبەتیان بۆ ئەکات.. لەسەرەتاوە باسیئەوە ئەکا : ڕووداوی قیامەت ئەوەندە سەنگینو قورسە کە زەوی و کەژوکێوەکانی پێ تێك ئەچێو وردوخاش ئەبن بەیەکا.. وەك لە جێگای تردا ئەفەرموێ : ﴿ثَقُلَتْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ : ئەوەندە سەنگینە، ئاسمانەکانو زەوی هەمووی تێك ئەدا بەسەریەکدا..

لە سەرەتای سورەی واقیعەدا ئەفەرموێ:

﴿إِذَا وَقَعَتِ الْوَاقِعَةُ. لَيْسَ لِوَقْعَتِهَا كَاذِبَةٌ. خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ. إِذَا رُجَّتِ الْأَرْضُ رَجًّا. وَبُسَّتِ الْجِبَالُ بَسًّا. فَكَانَتْ هَبَاءً مُّنبَثًّا﴾ : ئێستا تەنها ئەوەی ئەکەوێتە بیر، چ ڕوداوێ لەوە گەورەترە کە هەموو جیهانی پێ

تێك ئەچێ‌و ئەشێوێ بەسەریەكا؟ كاتێ كە ڕووداوەكە ڕووی دا، ئیتر كەس ناتوانێ بڵێ ڕووی نەداوە. ئەو ڕۆژە وەك ئەمڕۆ نیە كە خەڵكی دەمیان هەراش بێت‌و بتوانن بڵێن : نا، ڕووی نەداوە. وا ڕوو ئەدا كە جێگەی ئینكار نیە. ڕووداوێك كە سەری هەندێ ئەوی ئەكاو هەندێكی‌تر بڵند، ئەوانەی وا ملكەچییان هەبوو بۆ خاوەنەكەی خۆیان‌و، سەری بەندەیی‌یان بۆی دانەواندبوو، ئەو ڕووداوە بەرزیان ئەكاتەوە، ئەوانەش وا سەركەشی‌و نافەرمانیان ئەكرد، سەریان هەڵدابوو، خۆیان بانتر گرتبوو لەوەی كە فەرمانبەرداریی بكەن، ئەو ڕووداوە نزمیان ئەكاتەوە.

كاتێ ئەو ڕووداوە ڕووی داو، زەوی تەكانی پێدرا، كاتێ كەژوكێوەكان وردوخاش كران بەیەكاو وەك تۆزی پڕاویان لێ هات، وەك ئەوەی ئەسڵەن كەژوكێوێك وجودی نەبووە، ئاڵەو ڕۆژەدا ـ ئێوە ئەی ئەوانەی كە حەقتان بۆ ڕوون كراوەتەوەو ڕێگای بەندەییتان بۆ ڕوون كراوەتەوە! ـ بەش بەش ئەبن‌و دەستە دەستە ئەكرێنەوە.. چۆن؟

﴿وَكُنتُمْ أَزْوَاجاً ثَلَاثَةً﴾ ئەو ڕۆژە ئەبن بە سێ دەستەوە :

﴿وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ. مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ﴾ : ئەوانەی ئەهلی یومن‌و خۆشبەختی‌و سەعادەت‌و بەختیارین، چین ئەوانە؟ وەسفیان ناكرێ! مەگەر هەر لەو كاتەداو مەگەر خوا بزانێ كە چین‌و چۆنن؟!

﴿وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ. مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ﴾ : ئەوانەش وا ئەهلی شوم‌و بەدبەختی‌و دوور لە بەختیارین، ئەوانەی کە بەدبەختی داگیری کردوون، ئەوانەش چین؟ وەسفیان ناکرێ؟ مەگەر لەو کاتەدا ئینسان بزانێ کە چۆنن و چ وەزعیەت وحاڵێکیان هەیە. ئەوە دوو دەستە. دەستەی سێیەمیش ئەمانەن:

﴿وَالسَّابِقُونَ السَّابِقُونَ﴾ : ئەوانەش کە پێشکەوتوون لەوێ، پێش کەسانی‌ترکەوتوون بۆ جەزاو پاداشت، ئەوانەن وا لە دونیادا پێش ئەوانی‌ترکەوتبوون، لەهەستان بە مەسئولیەت‌و ئەرکی بەندەییدا. هەرکەس لە دونیادا پێش کەسانی‌ترکەوتبوو، لەوێش هەروایە، پێش ئەکەوێ و ئەڕوا بۆ ئاستە بەرزەکان، بۆ جەزای باشترو گەورەتر.

﴿أُوْلَئِكَ الْمُقَرَّبُونَ﴾ : ئائەوانە ـ دەستەی سێیەم ـ نزیک کراوەکانن، ئەوانەن لەبارەگای خاوەنەکەیان نزیک خراونەتەوە.

﴿فِي جَنَّاتِ النَّعِيمِ﴾ : لەو باخە پڕ دڕەخت‌و پڕ گەڵاو پەلانەدان کە پڕن لە نیعمەت‌و خۆشی‌و خۆش بەختی.

﴿ثُلَّةٌ مِّنَ الْأَوَّلِينَ. وَقَلِيلٌ مِّنَ الْآخِرِينَ﴾ : ئەوانە زۆریان لە ئوممەتە پێشووەکانن ـ پێش لەوکاتەی کە قورئان دەستی کردووە بە هاتنە خوارەوە ـ کەمێکیشیان لەو نەتەوە وگەلانەن کە لە دوای ئەو ئوممەتە پێشینانە هاتوون. ئەوانەی لەکاتی هاتنە خواری قورئانەوە تا قیامەت ئەبن. (سابق): کەسێکە ئیمان لە دڵیا وا دامەزراێ کە جارجاریش

ستی ڕووی تێنەکاو تووشی گوناهێکی گەورەو کردارێکی زشت و ناپەسەند نەبێ. ئەوانەی وا ئەوەندە چونەتە پێشەوە لەبەندەیدا، ئەوەندە ئیمان دامەزراون، ئیتر جێی ئەوە نیە کە جارێکیش هەوەس وئارەزووویان زاڵبێ و شەیتان زاڵ بێ بەسەریاندا و، وایان لێ بکا تووشی گوناهێکی گەورە وکردارێکی ناپەسەند بێن، ئەوانە پێشکەوتوونو ڕۆیشتوون.. ئەوانە کەسانێکن کاتێ کە دەعوەت کردن بۆ دین دەس پێنەکا، یەکەم کەسێکن دێنە پێشەوە، پێش لە خەڵکی تر دەس پێنەکەنو، ڕێ ڕۆشن نەکەنەوە بۆ خەڵکی ترو، ڕچە شکێنن.

ئەوانەش لەوەودوا دێن، بەڵام ئیمانیان نەگاتە ئەو پلەیەو، بەجۆری دائەمەزرێ کە تووشی ئەو گوناهـ وکردارە ناپەسەندانە نابن ، وەك ئەوان وان. بەڵام ئەو دەستەکەی تر لە (مؤمنین)، دەستەی (وأصْحابُ الْيمِين)، یا بە تەعبیرێکی تری قورئان (مقتصدین) میانەڕەوەکان : ئەوانە کەسانێکن ئیمانەکەیان تا ڕادەیەك سستیو لاوازی تێدایە، کە جارجارێ هەوەس زاڵ ئەبێ بەسەریاناو شەیتان توشی ئەنجامدانی گوناهێك لەو گوناهە گەورانەوکردارێك لەو کردارە ناپەسەندانەیان ئەکا، بەڵام بەدوایدا زوو تەوبە ئەکەنو ئەگەڕێنەوە.

(سابقین) ئەوانەن دەروونیان دڵنیایە، دامەزراون، ئارامیان گرتووە، لە ڕێگای بەندایەتیدا مەحکەم و جێگیرن. بەڵام (أصحابیەمینا ) -

دەستەی دووەمی موسوڵمانەکان ـ کەسانێکن نەفسیان لە جۆری (لوامة)یە. نەفسێ کە زۆر سەرزەنشتی خۆی ئەکا. چونکە جارجار تووشی گوناه ئەبێ. جا زوو ئەگەڕێتەوەو لۆمەی خۆی ئەکاو، لە ئاکامدا تەوبە ئەکاو ئەچێتەوە بۆ جێبەجێکردنی ئەرکی بەندایەتی خۆی.

جا ئەوەی کە ئەفەرموێ :(سابقین)، زۆرێکیان لە ئوممەتە پێشوەکانو کەمێکیان لە دواییەکانیانن، لەبەرئەوەیە کە ئوممەتە پێشووەکان جەمعیەتیان کەم بووە . بۆ نموونە ئوممەتی قەومی نوح (ﷺ) ئەگەر ـ فەرز کەین ـ دوو هەزار نەفەر بووبن، دە نەفەر براداریان تیابووبێ، دیارە دە نەفەر لەناو دوو هەزاردا زۆرن.. بەڵام لەم سەردەمەدا کە ئێمە هەین بۆ نموونە ئەگەر خەڵکی چوار هەزار ملیۆن نەفەر بن و، لەم ژمارەیە ئەگەر دە هەزاریش (سابق) بن هەر کەمن بە نیسبەت ئەو ژمارەیەوە، بۆیە (سابق)لە ئوممەتە دوایی یەکان کەمن.

جا بچینەوە سەرباسی پاداشتی ئەم دەستەیە ، دەستەی یەکەم لە بۆاداران :

﴿عَلَى سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ﴾ : ئیمانداران لەبەهەشتا – لەگەڵ ئەوە کە هەرکەس بۆ خۆی ماڵو جێگاو باخی تایبەتی هەیە- پارکی گشتیشیان هەیە بۆ ڕابواردن کە تیایدا کۆ ئەبنەوە. لێرەدا باسی ئەو حاڵەتە ئەکا کە بەیەکەوە کۆ ئەبنەوە. ﴿عَلَى سُرُرٍ مَّوْضُونَةٍ﴾ : دانیشتوون بەسەر

هەندێ سیستەمەوە کە بە جۆرێك چنراون لەهەر بەشێکیا برێك دوڕو مرواری دانراوە، لەزێو و شتانیتر تەل دروستکراوە. جارجاریش یاقوتومرواریوئەو شتانەی تێخراوە کە جوانی کردووە، جا بەسەر ئەو تەختانەوە دانیشتوون و پاڵیان داوەتەوە.

﴿مُتَّكِئِينَ عَلَيْهَا مُتَقَابِلِينَ﴾ : پاڵیان داوەتەوە بەسەریانەوە و ڕوویان کردۆتە یەکتر. نەك وەك ئەهلی ڕابواردنی دونیا کە لە بەرئەوەی دڵیان پڕە لە کینە نیسبەت بە یەکتر، کاتێ لە مەجلیسی ڕابواردنا دائەنیشن بەتەواوی پێیان خۆش نیە ڕوویان لەیەکتر بێو خۆشیان لەیەکتر نایە ت. لەوێ کینەو ڕقو دوژمنایەتیەك لەبەینا نیەو هەموو یەکتریان خۆش ئەوێ. لەبەرئەوە کاتێ لەو مەجلیسانە دائەنیشن ڕوویان لەیەکترە. جا ئەوان دانیشتوون، خۆیان زەحمەت نادەن، خزمەتکار هەیە لەبەردەستیانا ئەگەڕێ :

﴿يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ. بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِنْ مَعِينٍ﴾ : منالانێ کە هەمیشە هەر منالن، خوای (متعال) وای بڕیار داوە هەمیشە منالّ بنو هەروا بمێننەوە، بۆ ئەوەی ئەو برادارانە کەیف خۆش بن لە بینینیان. جا ئەگەڕێن بەسەریانداو خواردنەوەیان بۆ ئەهێنن بە پەرداخو کوپو سوراحیو پیاڵەی پڕ ، لەشەرابێك کە هەمیشە هەر ڕەوانەو هەرگیز دوایی نایەت.

﴿لَا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ﴾ : ئەوانە نە بلاوەیان پێ نەکرێ – کە پێیان بڵێن : دەی بەسە هەڵسن، بڕۆن، ئیتر ئەمما– ئەخواردنەوەو شەرابەکەشیان تەواو نەبێ، تا کاتێ خۆیان دڵیان پێوەی بێ لەوێ دائەنیشن.

﴿وَفَاكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ﴾ : لەگەڵ ئەوەش میوەیان بۆ هەیە، میوەیەك لەکاتی خۆشیو ڕابواردنا ئەخورێ ، لەو جۆرانەی خۆیان هەڵیبژێرنو پێیان خۆش بێ، ئەیهێنن ئەیگێڕن بەسەریانا. جا هەرکەس هەرچی پێ خۆش بوو هەڵی ئەبژێرێو هەڵی ئەگرێ بۆ خۆی.

﴿وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ﴾ : گۆشتی پەلەوەرانیش ئامادەیە بۆیان، لەهەر کامەی خۆیان حەزیان لێ بێ، هەرچی حەزی لێ بکەن داوای ئەکەنو بۆیان حازر ئەکرێ.

﴿وَحُورٌ عِينٌ. كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ﴾ : هاوسەرانی چاوخڕی چاوجوان، کە هەروەك مرواریو دوڕێك لە جێگایەکا پارێزراو بێت بۆ ئەوەی تۆزو گەردو چڵکی پێوە نەنیشێ، ئاوەها پڕ لە صەفاوپاکین و، ئەوپەڕی خاوێنیو جوانییان هەیە.

﴿جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ﴾ : ئەوانە پاداشتی ئەوکردەوانەن لە دونیادا ئەنجامیان ئەدا. جا لەبەرئەوەی لەو جۆرە مەجلیسانەدا کەلە دونیادا ڕێك ئەخرێن ـ مەجلیسەکانی سەفاو ڕابواردن ـ، قسەو کردەوەی بێ هودەی زۆر ڕوو ئەدا، قسەوتن بەیەکو، لەیەك

هەڵچوون زۆر نەبێ، ڕەنگە لێرەدا گومانی ئەوە بکرێ، کەلەوێش هەروا نەبێ، هەر قسەی بێهودە نەکرێو، کرداری ناپەسەند ئەنجام نەدرێو، لەگەڵ یەکتر شەڕو داوایان نەبێ! بۆیە ئەفەرموێ :

﴿لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْواً وَلَا تَأْثِيماً. إِلَّا قِيلاً سَلَاماً سَلَاماً﴾ : لەوێ ـ نە وتەیەکی بێهودەو بێ سەمەر، نە قسەی خراپ بەیەکتر وتنو یەکتر بە گوناهکار ژماردن ـ هیچێك لەوانە نابیسن، کەس قسەیەکی ناخۆش لەوێتر نابیسێ. جا ئەگەر سەرت سوڕماوە لەمە، ئەگەر ناتوانی قبوڵی بکەی لەناوا دانیشتنێکا کە پڕە لەو ڕابواردنانە، قسەیەك لەو قسانە ڕوونەدا هەر زۆر زۆر بەلاتەوە جێی سەرسوڕمانە ونەتەوێ حەتمەن بڵێین کە شتێك لەوێ ڕوو ئەدا، ئەوە تەنها یەك شت هەیە ناوی بنێین (لغو وجهێلـة)، ناوی بنێین قسەی بێهودە، ناوی بنێین جوێن بەیەکتردان، تەنها ئەوە هەیە ئەگەر حازری قبوڵی بکەی ئەوە ناو بنێین قسە بەیەك وتنو جوێن بەیەکدانو قسەی بێهودە کردن، بەڵێ ئەوەش سەلام لەیەکترکردنە! دوعای سەلامەت بۆ یەکتر کردن. تەنها ئا ئەوەیە کە لەیەکتری ئەبیسن. ئەوە حاڵی (سابقین). با بچینە باسی دەستەی دووەم :

﴿وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ﴾ : ئەوانەی ئەهلی (یومن )و بەختیاری و سەعادەتو خۆش بەختین. چین ئەوانە؟ چوزانی چ سەرئەنجامو جەزایەکیان هەیە! جا ئێستا کە باسی سەرئەنجامەکەیان ئەکا،

دەرنەکەوێ پاداشتی ئەمان جۆرە ژیانێکە لــە چەشــنی ژیــانی ئــەهلی دەشتو (بادیە)یە. ئەوەکەی تر ژیانی شارستانی بوو. بەوجۆرەی بــاس کرا. بەڵام ئەمان :

﴿فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ. وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ. وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ. وَفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ. لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ. وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ﴾ : ئەوان (اصحاب اليمين) لەناو ئەم شتانەدان : درەختی (سدر) ـ ئەو دڕکەی کە لای خۆمان پــەرژینی لێ دروست دەکرێ ـ ئەگەر بهێڵدرێتەوە تا گەورە ئەبێت، بەرهەمێکی هەیە وەك گوێز، ئەوە (سدر)ە. جــا ئەگــەر هــەروابێ ـ وەك درەختــی دونیا ـ ئینسان ناتوانێ بڕوا بەقەدیاو بەرهەمەکەی لێ کاتەوەو بیخــوات ، چونکە پڕە لە دڕك، مەگەر لە خوارەوە بەدارێ، بەبــەردێ، بەشــتێ، بەرهەمەکــەی دابخــا. بــەڵام ئــەو( ســدر) انــەی لــە بەهەشــتا هــەن دڕکەکانیان لابراوە، بۆ ئەوەی بتوانن بە ڕەحەتی بڕۆنە قەدیانو لێــیان بخۆن. هەروەها درەختێکی تریش هەیە نــاوی (طَلْــح)ە، ئــەویش چــین لەسەر چــین میوەکــەی دانــراوە، بــۆ ئــەوەی بیخــۆن. درەختێکــە لــە عەرەبستانا ئەڕوێو سەمەرێکی تایبەتی هەیە. جگە لەوە ئەوان وان لە سێبەرێکا کە کێشی پێ دراوەو درێژکراوەتــەوە، بەمــەعنای ئــەوە وەك سێبەری درەختی دنیا نیە کە لە دەشتێکا بێ، خــۆی تــەنها جێگایــەکی کەم داگیرکاو، ئەگەر ئینســان لــەژێریا چووە ئــەولاوە ئــیتر ســێبەری نــەمێنێ.. لــەوێ ـ لەبەهەشــتا ـ هــەتا بــڕۆنو بیانــەوێ بگــەڕێن

بەناوباخەکەیانا هەر سێبەرە، چونکە خۆری تیا نیە کە تەزیەتیان بکات. وان لە جێگایەکداکە ئاو لە بەرزی یەوە تەرژێتەری،و، بەتاف دێتە خوارەوە، جا ئیتر یا هەر وەك ئەو تاف و تافگانەی‌کە لە کەژوکێوانی دونیادا هەن، یا بەجۆرێکی‌تر کە خوا خۆی ئەزانێ چۆنە. جا میوەی زۆری وایان هەیە کە لێی بخۆن،و، ئیستیفادەی لێبکەن. هەروەها وان لەسەر دۆشەکەی بەرز کە لە جێگای بەرزدا دانراون، بۆخۆیان ئیسراحەت ئەکەن‌و رائەبوێرن. جا کەناوی سیستەم‌و دۆشەك برا، هاوسەر ئەکەوێتە بیر، باسی حاڵی ئەوانیش ئەکاو رۆشنی ئەکاتەوە کە هاوسەران لەوێ ئەو حاڵەیان نیە کە ئێستا لە دونیادا هەیانە، ئاڵوگۆڕێك بەسەریانا هاتووە:

﴿إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاء. فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَاراً. عُرُباً أَتْرَاباً﴾ : ئەفەرموێ : بەراستی سەرلەنوێ جارێکی‌تر دروستمان کردونەتەوە، غەیری ئەو دروست بوونە کە یەکەم جار بوویانە. هەمیشە زیندوونەوکردومانەتەوە بە کچو، حاڵەتێکمان پێداون کە کەمتر ژنی دونیایی هەیانە.. ئاخر ژنی دونیا ئەگەر زۆریش مێردەکەی خۆش بوێ، هەوڵ ئەدا ئەم خۆشویستنەی دەرنەخا، وا ئەزانێ ئەگەر دەری بخا قەدرو قیمەتی لای شووەکەی نامێنێ، بەڵام ئەوان ـ هاوسەرانی بەهەشت ـ (عرب)ن، ئەو شتانە لەلایان نامێنێ، هەرکام چەنێ هاوسەرەکەی خۆی خۆش ئەوێ، بەو جۆرە بۆی دەرئەبڕێ،

خۆشەویستی خۆی بۆی ڕۆشن نەكاتەوە. هەمووشیان هاوساڵن، لەیەك عومردان، بۆ ئەوەی كە كەس دڵی لە خۆی دانەمێنێ، كە هاوسەری ئەو عومری زیاترەو پیرترە لەهی كەسێكیتر!.

﴿لِّأَصْحَابِ الْيَمِينِ﴾ : ئەوانەش بۆ (أصحاب اليمين)ن. بۆ موسوڵمانانی پلە دووەمی بەهەشت.

﴿ثُلَّةٌ مِّنَ الْأَوَّلِينَ وَثُلَّةٌ مِّنَ الْآخِرِينَ﴾ : ئەوانەش زۆرێكن لە ئوممەتە پێشووەكانو، زۆرێكیش لە ئوممەتە دوایەكان. چونكە موسوڵمانی پلە دووەم بوون ئاسانترە، لەبەرئەوە زۆرتر ئەبن لە موسوڵمانانی دەرەجە یەك، دەرەجە یەكەكان ئەوانە بوون كە ژمارەیان كەمتر بوو.سەبارەت بە دەستەی سێیەمیش دەفەرموێ:

﴿وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ﴾ : ئەوانەی كە تاقمی دەسە چەپن.. ئەوانەی كە ئەهلی شوومیو دووری لەبەرەكەت و بەختیاریو خۆش بەختین! (هەروا كەلای خەڵك باوە دەستی ڕاست بە نیشانەی بەرەكەتو خۆش بەختی ئەزانن، دەستی چەپ بە پێچەوانەوە، بە نیشانەی شوومیو دووری لە بەرەكەت ئەزانن) چین ئەوانە؟ وەزعیان چۆنە؟ ئەبێ تووشی چی بن؟ چ سەرەنجامێكیان ئەبێ؟!ئەفەرموێ:

﴿فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ. وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ. لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ﴾ : ئەوانە وان لەناو بایەكدا هێجگار گەرمەو لێیان ئەداتو، بەو كونە وردانەی

پێستی بەدەنیانا نەچێتە ناوەوەو ئەیان سوتێنێ. هەروەها لەناو ئاوێکی زۆر داغو کوڵاودان. لە سێبەرێکدان، چ سێبەرێك؟ سێبەرێك کە دوکەڵێکی زۆر داغو زۆر رەشی هەیە، رەنگێکی جوانی نیە کە لە پەنایا پشوویەك بدرێ.. بۆ؟ بۆچی ئەوە پاداشتیانە؟! ئاخرلەبەر ئەوەی :

﴿إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَلِكَ مُتْرَفِينَ﴾ : چونکە ئەوان لەوەو پێش خۆشگوزەران بوون. (خۆشگوزەرانی غەفلەت ئەوەیە کە ئینسان لە نیعمەتو ئیمکاناتێ خوا داویەتی، وا ئیستیفادەی لێ نەکات کە خوی پێ ئیصلاح بکا، خۆی پێ بیبا بەرەو کەماڵو تەواوبوون. بۆ ئەوە ئیستیفادە نەکات کە مەسئولیەتو ئەرکی بەندایەتی خۆی ئەنجام بدا، بەڵکو ئەو نیعمەتو ئیماکاناتە خۆی بووبنە هەدەف لەلایو، هەمیشە خەریکی لەزەت بردنو رابواردن بێ..). بەڵێ لەوەو پێش لە دونیادا خۆشگوزەران بوون. جا کەسێك کە خۆشگوزەرانوغافڵ بوو ئیتر تووشی هەرچی گومڕاییو لەڕێ لادانە ئەبێ.. بۆیە :

﴿وَكَانُوا يُصِرُّونَ عَلَى الْحِنثِ الْعَظِيمِ﴾ : هەمیشە سووربوون لەسەر ئەنجامدانی گوناهە گەورەکە، کام گوناهی گەورە؟ ئەوەی وا ئیتر لەوە گوناهی گەورەتر نیە. بەجۆرێ هەر کە وتت گوناهە گەورەکە، دیارە کە چیە. گوناهی (شەریك بۆ خوا قەراردان). ئەوە کە ئینسان فەرمانڕەوایەکیترو فەریادڕەسێکیتر لەژیانیا قبوڵ بکا.

ئەوەی ئینسان وابزانێ کەمێ تریش ئەتوانێ سوودێکی پێبگەیەنێ، یاکۆسپێ لەسەر رێی لابیا، یا دەسەڵاتی بێ بەسەریا، یا ئەتوانێ لەسەرەنجامیا دەستی هەبێ. ئائەوەیە گوناهە گەورەکە. ئەوانە تووشی ئەو گوناهە بوون، هەر لەسەری ئەچوون، وازیان لێ ئەئەهێنا، دوای ئەوەش کە بۆیان روون کرایەوە هەر لەسەری ئەچوون. جگە لەوەش :

﴿وَكَانُوا يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَاباً وَعِظَاماً أَئِنَّا لَمَبْعُوثُونَ. أَوَ آبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ﴾ :

جگە لەوە باوەڕیشیان بە قیامەت نەبوو، ئەیان وت : چۆن؟ ئایا کاتێ مردین و بووین بە خاک و بووین بە ئێسقان، بەراستی زیندوو ئەکرێینەوەو لەقەبرەکانمان رائەپەڕێنرێین؟ چۆن ئەکرێ شتی وا؟ چۆن ئەکرێ ئینسان بمرێ و ببێ بە خاک و ببێ بە ئێسقان، دوایی زیندوو بکرێتەوە؟! هەروەها ئەیان ووت : لەوەش دوورتر ئایا باوباپیرە پێشووەکانمان ، ئەوانەی هەر ناسارو نیشانەشیان نەماوە، ئایا ئەوانیش هەر زیندوو ئەبنەوە؟!

﴿قُلْ إِنَّ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ. لَمَجْمُوعُونَ إِلَى مِيقَاتِ يَوْمٍ مَعْلُومٍ. ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا الضَّالُّونَ الْمُكَذِّبُونَ. لَآكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ. فَمَالِؤُونَ مِنْهَا الْبُطُونَ. فَشَارِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ الْحَمِيمِ. فَشَارِبُونَ شُرْبَ الْهِيمِ. هَذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ الدِّينِ﴾ :

بلّێ پێیان : بەڵێ بێ گومـان پێشـووان ـ ئەوانەی کـە لـەوەوپێش بوون‌و ئەوانەش بـە دوایانـدا دێـن ـ هـەموویان کـۆکراوەن، حەتمـەن کۆئەکرێنەوە بۆ رۆژێکی تایبەت کە دیاری کراوە، رۆژێکـە زانـراوە، هـەموو لـەو رۆژەدا جـەم ئەکرێنـەوە. جـا دوای ئـەوە، ئێـوە– ئـەی ئەوانەی کە گومڕا بوون‌و لاتان داوە لەڕێگای بەندەیی خـواو تووشـی هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوا بوون!، ئەی ئەوانەی کە زیندووبونەوەی دوای مردن‌و موحاکەمەو موحاسەبە بەدرۆ ئەخەنـەوە!– ئالـەو کاتـەدا ئێـوە ئیشتان هەر ئەوەیە لە درەختێك بخۆن کە ناوی (زقوم)ە. ئەوەنـدەی لێ بخۆن تا سکتان پڕ کەن. جا دوای ئەوە لەبەر گەرمای ئەو خۆراکـەتان دەس بکەن بەئاو خواردنەوە، بەڵام چ ئاوێ؟ ئاوی کوڵاوی زۆر داخ، کە هەر ئەخۆنەوەو ئەخۆنەوە بەسەریا. هـەروەك وشـترێك کـە دەردی تینوێتی گرتبێ، ئاواتـان لێ بـێ کـە هـەر بخـۆن و بخۆنـەوەو تێـری لێ نـەخۆن، ئائـەوە سـەرەنجامی گومڕاییەکەتانـەو بـاوەڕ نەکردنتانـە بـە زیندووبونەوەی دوای مردن. ئەوە شتێکە ئامادەکراوە بۆیـان، کـە لـە رۆژی جەزادان‌و سزادانەوە، بەوە میوانداریان لێ ئەکرێ‌و پێشـوازی ئەکرێن.

جا دوای ئـەوە چـەند بەڵگـەو نیشـانەیەك – لەوانەی‌لـەوەوپێش ئیشارەیەکمان بۆ کردن – بـەیان ئـەکرێ، بـۆ ئـەوەی باشـتر رۆشـن

بکرێتەوە کە ئەم شتەی وا باس کرا حەقی‌یەو، حەقمن ئەو رۆژە دێتە پێشەوەو، هەرکەس ـ بەو جۆرە کە باس کرا ـ ئەگا بە جەزای خۆی.

لە ئاخری سورەتەکەوە شتێکی تریش بەیان ئەکا، دوای ئەوە ئەو نیشانانە ئەهێنێتەوەو رۆشنی ئەکاتەوەکە حەقەن ئەو رۆژە دێت، ئەفەرموێ :

﴿أَفَبِهَذَا الْحَدِيثِ أَنتُم مُّدْهِنُونَ. وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ أَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ﴾؟، ئایا ئەو باسە، ئەو قسەیە کە کرا بۆتان ((رۆژێك دێتە پێشەوەو رووداوێکی ئاوا روو ئەداو هەرکەس ئاوا ئەگا بە جەزای خۆی))، ئێوە ئەو رووداوە هەروا شل ئەگرنو بێ‌موبالات لەگەڵی رووبەروو ئەبن؟ هەموو رزقو رۆزیتان لێرەدا بووە بەوەی کە بڵێن ئەوە درۆیەو شتی ئاوا نابێ، رۆژی ئاوا نایەتە پێشەوە؟! هەرئەوەتان بووە بە نسیب؟ هەر ئەوە بەشتان بووە؟ هیچ شتی تر نیە؟ هەرماوەتەوە ئەوەی کە بە درۆ بخەنەوەو (تكذيب) بکەنو بڕوا نەکەن بەو شتە کە باس ئەکرێ؟

جا ئەگەر وایە ـ رۆژێکی وا نیەو ئێنسان مەسئول نیە ـ فەرموون مەهێڵن مردن ـ بەپێی بەرنامەیەك کە ئێمە دامان ناوە ـ بێ.. ئاخر ئەگەر قیامەت نەبوایە؟ خوای گەورە بۆ مردنی خەڵکی بەرنامەی دانەئەنا. ئەو کاتە کارەکان هەرەمە ئەبوون، ئیتر رێکوپێکی‌یەك لەکارا نەئەبوو. مردن بێ‌بەرنامە ئەبوو. جا کە بێ‌بەرنامە ئەبوو، ئیتر ئەکرا خەڵك نەهێڵن لەوکاتەدا مردن دێت بەسەر وەختیانەوە، بگرنو

ئەیانتوانی بیخەنە دواوە. بەڵام لەبەرئـەوەی ئینسـان مەسـئولەو، ئـەبێ بانگ بکرێتە دادگای خواو، پرسیاری لێ بکرێ، کە چی کردوەو چی نـەکردووە؟ لەبەرئـەوە ئـەم ژیـانی دونیایـە بـۆ تاقیکردنەوەیـە، تاقیکردنـەوەش دیـاری ئـەکرێ لـە کـەی تـا کـەی بێـت، دیـاری ئەکرێ‌کەی ژیانی ئەم ئینسانە ئەبێ دوایی پێ بـێ و ئـیتر بەسـی بـێ. ئەوەتا کاتی پێدراوە کام لەم دوو رێیە ئەیەوێ، هـەڵی بـژێرێو پیایـا بڕوا، ئازادبێ. دوای ئەوە کە تاقیکردنەوەی تەواو بـوو، ئەوەنـدە کـە پێویستە ، کاتی پێدرا، ئیتر لەکاتێکی دیاری کراودا ئەبێ برواو گیانی بکێشرێ تا بگا بە پاداشـتو سزای خۆی.

دەی ئەگەر قیامەت نەبوایەو مەسـئولیەت نەبوایـە ، دیـاربوو ئێـوە ئەتانتوانی دەخاڵەت بکەن لە مەرگداو، نەیەڵن لەو کاتەدا کە مـەرگ دێت بەسەر وەختـەوە، بمـرن. بـەڵام لەبەرئـەوەی مەسـئولیەت هەیـە، مردنیش بە بەرنامەیە، بۆیە هەرچەند پێتان ناخۆش بێ، هەرچەنە هەوڵو تەقەلا بدەن، ناتوانن مردن لەوکاتەی وادێت بەسەر وەختـەوە، بخەنـە دواوە.

﴿فَلَوْلَا إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ. وَأَنتُمْ حِينَئِذٍ تَنظُرُونَ. وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْـهِ مِنكُمْ وَلَكِن لَّا تُبْصِرُونَ . فَلَوْلَا إِن كُنتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ. تَرْجِعُونَهَا إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴾ :

دەی ئەگەر مسئولیەت‌و قیامەت‌و لێپرسینەوە نیە، بۆچی کاتێک گیان ئەگاتە (گەروو)، هەر لەوکاتەدا ـ ئێوە خەریکن ئەروانن بۆ کابرا کە لە سەرەمەرگایە، ئێمەش نزیکترین لە ئێوە بەو، بەڵام ئێوە نابینن – بۆچی‌کە ئەبینن خۆشەویستەکەتان خەریکە ئەمرێ، گیانی ناگێڕنەوە؟! بۆ رێ ناگرن لە دەرچوونی گیانی؟! ئەگەر راست ئەکەن مردن نیەو، لێپرسینەوەو قیامەت نیەو، مردن بە بەرنامە نیەو، هەڕەمەیە.. بەڵێ ئەوەی کە ناتوانن رێگر بن لە مردن، لەبەرئەوەیە کاتی دیاری کراو هەیە بۆ مردن! هەرکەس لەکاتی دیاری کراوی خۆیدا ئەبێ بمرێ‌و، بڕواو بگاتەوە بەجەزای خۆی .

﴿فَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ. فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّةُ نَعِيمٍ﴾ : جا ئەوەی ئەمرێ ئەگەر لە (مقربین)و نزیکخراوەکانە – ئەوانەی ناوێکی‌تریان (سابقین) بوو، ئەوانەی نزیکخراوەی بارەگای خوان، لە موسوڵمانانی دەرەجە یەك – ئەوە ئائەمەیە جەزاکەی : هەر لە قیامەتاو دوای زیندووبوونەوە، بەڵکو هەرلەوکاتەوە کە ئەمرێ (روح) ی بۆ هەیە، واتە : لە ئیسراحەتێکایە کە هیچ ناخۆشی‌و ماندووبوون‌و نارەحەتیەك تووشی نابێ، ئەوە یەك، دووەم (رێحان)ی بۆ هەیە، واتە: لە حاڵەتێکی خۆشایە، لە وەزعێکدا کە رەیحان چۆن بۆنی خۆشە ئاوەها ئەویش بۆنی خۆشە. (وجَنَّةُ نَعِيم):هەروەها باخێك کە پڕە لە نیعمەتی خۆش خۆش.. ئەوشتانەی بۆ هەیە ، هەر لەکاتی مردنەوە تا

رۆژی قیامەت. ئەمە غەیری ئەوبەهەشتە ئەسلیيەیە کە لە دوایدا هەموو بڕواداران ئەچنە ناوی. ئەم باخچەیە هەر بە مردن ئەو بڕوادارانە ـ لە پێشەنگە نزیکخراوەکان ـ ئەچنە ناوی‌و تیایدا ئەبن تا رۆژی دوایی. هەروەك لەوەوپێش وتمان لەسەرەمەرگا ـ پێش مردن ـ ئیحترام گرتن‌و رێز لێنان بۆ بڕوادارە و، ئیهانەت کردن‌و ئەزیەتیش بۆ بێ‌باوەڕان.

﴿وَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ أَصْحَابِ الْيَمِينِ. فَسَلَامٌ لَّكَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ﴾:

ئەگەر ئەو کەسەی‌گیانی دەرئەچێ لە (أصحاب اليمين)ە، واتە لە موسوڵمانانی پلە دووەمە، ئەوە ئەوەمئمورانەی‌گیانی ئەکێشن سەلامی پێ‌ئەگەیەنن لە براکانیەوە، ئەوانەی کە لە ئاستی (ـصحاب اليمين)دان‌و لەوەوپێش چوون ، چونکە ئەوان ئەزانن لەوێ خەبەرو دەنگو باس چیە. هەر سەلامەت‌و رزگاریەو، دەردی سەرو ئەشکەنجەو ئازار نیە. ئەڵێن : بەو برایەمان کە قەرارە بێت بۆلامان، سەلام و دوعای خێری ئێمەی پێ‌بگەیەنن، خوا سەلامەتی کا .

﴿وَأَمَّا إِن كَانَ مِنَ الْمُكَذِّبِينَ الضَّالِّينَ. فَنُزُلٌ مِّنْ حَمِيمٍ. وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ﴾ : ئەگەر لەوانەش بوو کە بڕوایان نیە بەوەی زیندوو ئەبنەوە، ئەوە دوای مردن موحاسەبەو موحاکەمەیان ئەکرێ. ئەوانەی وا گومڕا بوون‌و لە رێگای بەندەیی خوا لایانداوەو تووشی شەرێك

قەراردان بوون بۆ خوا، ئەگەر لەو کەسانەیە ئەوا شتێك کە بۆی ئامادە کراوەو میواندارى پێ‌بکرێ، ئاوێکی کوڵاوی زۆرداغە، دوایش بیخەنە ناو ئاگرێکی زۆر سەختو هەڵگیرساو تا بیسووتێنێ، نەك لە قیامەتا هەر لەو کاتەوە کە گیانی دەرئەچێ. هەرلەوڵەحزەیەوە ئینسانی کافر سزاوئەشکەنجەی دەست پێ‌ئەکا تا رۆژی قیامەت. لە رۆژی قیامەتیشا خوا ئەفەرموێ : عەزاب‌وسزای‌ئەوکەسە تا ئێستا هیچ نەبووە! ئادەی ئێستا بیخەنە ناو سەخترین عەزاب‌وئەشکەنجەوە!

وتمان ئەگەر ئینسان ئیمان‌و باوەڕی بە قیامەت نەبوو، ناتوانێت بەندەی خوا بێت، ناتوانێ ئەوەی خوا فەرمویەتی ئەنجامی بدات. هەروەها ئەگەر ئیمان بە قیامەت لەدڵیدا دامەزرا بوو ئەوە حەتمەن ئەتوانێ رێگای بەندەیی خوا بگرێ.

وتیشمان ئیمان ئەوەیە لە دڵیا بەجۆرێك دامەزرا بێ نەکرێ لێی جیابێتەوە، نەکرێ لە دڵی دەربچێ، ئیمان بە قیامەت ئەوەیە : ئینسان بەجۆرێ هەست بە مەسئولیەت بکا کە ئەگەر هاتو گوناهی کرد زۆری پێ‌ئەچێ خۆی بۆ خۆی مەحکەمەو دادگایەك دروست بکا، هەروەکو دادگای قیامەت مەحکەمەی خۆی بکا ، پێش ئەوەی لەوێ موحاکەمەی بکرێ، چونکە لەوێ جێگای پەشیمان بونەوەو تەوبە نیە.

لەمەش زیاتر ئیمان بە ئاخیرەت دەرەجەی تریشی هەیە: ئەویش ئەوەیە ئینسان لەو کاتەدا کە خەریکە گوناه ئەنجام بدا، بیری قیامەت

ئەکاتەوەو، دەستی لێ ئەکێشێ و تەواوی ناکا. لەوەش زیاتر دەرەجەی تریش هەیە کە هەر ناهێڵێ توشی گوناهەکە بێت. ئەمە زۆر گرنگەو ئەبێ گرنگی پێبدرێ. ئیمان بە قیامەت ئەوەیە ئینسان لە گوناهو کردەوەی ناپەسەند بگێڕێتەوە، یا ئەهێڵێ ئەنجامی بدا. یا ئەگەر ئەنجامی دا زۆرو هەڵی نێ بۆ ئەوەی تەوبە بکاو پەشیمان بێتەوە.

## تەفسیری سورەی (الماعون)

ئەگەرکەسێ کردبووی بەکارو پیشەو بەرنامەی خۆی، کە گوناهی گەورەو کرداری ناپەسەند ئەنجام بدا، ئەوە ئەگەرچی نوێژیش بکا، ئیمانی بە قیامەت نیە، ئەوەتا خوا ئەفەرموێ :

﴿أَرَأَيْتَ الَّذِي يُكَذِّبُ بِالدِّينِ﴾ : ئەرێ بینیت ئەوەی کە باوەڕی بە رۆژی جەزا نیەو ئەڵێ درۆیەو نیە؟ ئەگەر دیوتە پێم بڵێ کە بیروڕات لەبارەیەوە چیە؟ چۆن باسی ئەکەی بۆم؟ چۆن وەصفی ئەکەی بۆم؟ کێیە ئەوکەسەی باوەڕی بە رۆژی (دین) ــ رۆژی جەزا ـ نیە؟ ئەگەریش ئەت دیوەو ئەت زانیوە، گوێ ڕاگرە با من باسی بکەم بۆت : تەنها ئەوکەسە نیە کە بڵێ : قیامەت نیەو زیندوبونەوەی دوای مردن نیە، ئەگەر تەنها ئەوە بوایە زۆرکەم بوون ئەوانەی کە ئیمانیان بە قیامەت نیە.

بەڵێ کافر بوون بە قیامەتو باوەڕپێنەکردنی تەنها ئەوە نیە ئینسان بڵێ قیامەت نیەو ئینسان زیندوو نابێتەوە! نەخێر. هەیە ئەڵێ قیامەت هەیەو ئینسان زیندوو ئەبێتەوە، موحاکەمەو موحاسەبەیەکیش هەیە، بەهەشتو جەهەنەمیش هەیە، نوێژیش ئەکا، لەگەڵ ئەوەشدا ئیمانی نیەو، خوا لێی قبوڵ ناکا.چۆن؟

﴿فَذَٰلِكَ الَّذِي يَدُعُّ الْيَتِيمَ﴾ : ئەگەر ئەتەوێ بزانی کێیە کە باوەڕی بە ڕۆژی جەزا نیە، ئەوە ئەوکەسەیە کە زۆر بە توندوتیژی لەگەڵ هەتیو ڕووبەڕوو ئەبێتەوەو بە زبری موعامەلەی لەگەڵ ئەکا. ئەو هەتیوەی وا بێدەسەڵاتەو نیازی بەوە هەیە پشتیوانی لێ بکرێ، کۆمەکی بکرێ، دیفاع لە حەقی بکرێ، ئەو زۆر بە توندوتیژیو بەدرەفتاریەوە موعامەلەی ئەکا.

﴿وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ الْمِسْكِينِ﴾ : هەروەها کەسیش هان نادا بۆ ئەوەی خۆراکێ بدا بەهەژارێکو تەشویقی کەس ناکا بۆ ئەو کارە. جا هەرکەس ئەو دووشتەی هەبوو: ئەهلی بەزەیی‌و میهرەبانی نەبوو لەگەڵ هەتیو، دڵی بۆ هەژارومسکینیش نەسوتا، ئەوە ئیتر درۆ ئەکا کە ئەڵێ موسوڵمانم. بۆیە ئەگەر نوێژیش بکات درۆ ئەکا..

﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ﴾ : دەی وای بۆ ئەو نوێژکەرانە، ئەو نوێژکەرانەی کە ئائەو کارانە ئەکەن.

﴿الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ﴾ : ئەوانەی نوێژ ئەکەن، بەڵام لە نوێژەکەیانو حەقیقەتو ڕۆحی نوێژەکەیان غافڵن. لەبیریان نیە ئینسان کاتێ نوێژ ئەکاو ئەپاڕێتەوە لە خوا کە کۆمەکی بکا، بۆ ئەوەیە بەندەیی بۆ خوا بکا، دەی بەندەییش بەشێکی ئەوەیە ئینسان دیفاع لە حەقی هەتیو بکا، بەشێکی ئەوەیە بیری بە هەژارانەوە بێ، بەزەیی بێتەوە بە خەڵکا، لایەك لە بەندەیی ئەوەیە ئینسان لەگەڵ خوای خۆی بەو جۆرە بێ کە لێی داواکردووە. ئەولاکەی تریشی ئەوەیە لەگەڵ مەخلوقەکانی خوا بە بەزەییو بەرەحمو میهرەبانییەوە بجوڵێتەوە ـ دەی ئەو کەسە کە نوێژ ئەکا بەڵام ئاوا لەگەڵ هەتیوو هەژار مامەڵە ئەکا، ئەوە لە حەقیقەتی ئەو نوێژەی کە ئەیکا غافڵە، ئیتر نوێژەکەی دەرد ناخوا، نوێژەکەی حەقیقەتی نیەو ڕوحی نیە، ئەمێنێتەوە ڕواڵەتی زاهیری.

﴿الَّذِينَ هُمْ يُرَاؤُونَ﴾ : ئەوانەی وا ڕیا ئەکەن، خۆ ئەنوێنن، هەر هەدەفیان ئەوەیە لە نوێژەکەیاندا خۆیان بە نوێژکەر بناسێنن بە خەڵك، خەڵك بڵێن نوێژ ئەکەن، هەر ئەوەندەیان بەسە ، نوێژەکەیان بۆ ئەوە نیە کە بەڕاستی لە خوا بپاڕێنەوە کۆمەکیان بکات، بۆ ئەوەی بەندەی خوابن، عیبادەتی خوا بکەن. چونکە ئەگەر وابوایە لەگەڵ هەتیوو هەژار ئاوا ڕەفتاریان نەئەکرد. دیارە هەدەفیان هەر ئەوەیە خەڵك بە نوێژکەریان بناسنو بەس. هەر لەبەر ئەوەشە :

﴿وَيَمْنَعُونَ الْمَاعُونَ﴾ : ڕێ لە خێر دەگرن. ئاخر بڕیار وایە کە ئەو نیعمەت وئیمکاناتەی خوا قەراری داوە هەمیشە لە جولـە دابـن‌و، لەملا بۆ ئەولا بڕۆن‌و، لەدەستی ئەم بڕۆن بۆ دەستی ئـەوو، لەدەستی ئەو بڕۆن بۆ دەستی ئەوو، کەسانی‌تر ئیستیفادەیان لێ بکەن‌و کـەلکیان لێ وەرگرن، ئەو نیعمەتانە قەرارە لـە هـیچ کوێیـەك حـەپس نـەکرێن‌و کەس مەنعی خەلکیان لێ نەکا.. ئەو مەنعیان ئەکات‌و ناهێلێ کەلکیان لێ وەربگیرێ‌و ئیستیفادەیان لێ بکرێ. ئاوا کەسێك ئیمـانی بـە ڕۆژی جەزا نیە؟ ئەگەر ئیمانی بە ڕۆژی جەزا بوایە، ئیحساسی مەسـئولیـەت نەی‌ئەهێشت وا بکات و بەوجۆرە بێت.

هـەروەك لـەوەوپێش بـە کـورتی باسمـان کـرد، هـەر ئینحـراف‌و گومڕاییەك لە ڕێگەی بەندەیی ڕوو ئەدا، لەبەرئەوەیە ئینسـان ئیمـانی بە ئاخیرەت و ڕۆژی جەزا نیە، چونکە ئەگەر ئینسان هەمیشە لە بـیری بێ کە دادگایەك هەیەو موحاسەبەیەك هەیـەو بەهەشـت‌و جەهەنـەمێك هەن‌و، دلّی دامەزراو بێ لەسەر ئەمـەو تەسـلیمی ئـەوە بووبـێ، ئیتر دوای ئەوە چۆن گوناهکاری‌و نافـەرمانی خـوا ئەکاتـە کـارو پیشـەی خۆی‌و، غافل‌ ئەبێ‌و دوور ئەبێ لە ئیحساسی مەسـئولیەت‌و وەزیفـەی ژیانی خۆی؟! هەر ئینسانێکتان دی گومڕا بوو و لە ڕێی بەنـدەیی لای دابوو و تووشی گونـاهو نافـەرمانی بـوو بـوو و، کردبـووی بـەکارو پیشەی خۆی بزانن ئەوە ئیمانی بە دوارِۆژ نیە.

هەر ئینسانێکیش تووشی گوناهو نافەرمانی ئەبوو، بۆ ماوەیەك دوای ئەوە دەستی لێ ئەکێشا، لەوکاتەدا کە خەریکە تووشی نافەرمانیەکە ئەبێ لەقیامەت غافڵەو ئیمانەکەی ئەو ئیمانە نیە کە بە دەردی ئەوکاتە بخوا. تەنها لەکاتێکا ئیمانەکەی ڕێکوپێك ئەبێتەوە کە بیری قیامەت ئەکاتەوەو تەوبە ئەکاو دەست ئەکێشێ لەو گوناهانە کە کردوونی.

زۆر ڕۆشنە بەو جۆرە کە باس کرا، کاتێك ئاوەها سەرەنجامێك چاوەڕوانی ئینسانە ، بەهەشتێکی ئاواو جەهەنەمێکی ئاواو، دادگاو موحاسەبەو موحاکەمەیەکی ئاوا لەسەر ڕێەتی، ناکرێ ئینسان بڕوای ئابەوە بێت و، دوور لە ئیحساسی مەسئولیەت بێ وبێ موبالات و سست بێ و باش ئەنجامی وەزیفەی بەندایەتی نەدا، پێویستە لەسەری هەوڵ بدات بۆ ئەوەی ئیمان بە دوارۆژ بەهێز بکاو، لەخۆی وردبێتەوە کە حەتمەن ئیمانی بە دوارۆژی لاوازە، بۆیە هەست بە مەسئولیەتی باش نیە. بۆیە ئەرکی سەرشانیەتی لەوتەمەڵیە دەربچێ تا ئیمان بە ئاخیرەتەکەی ڕێکوپێك بێ و، ئەو کەموکورتیەی لێ دەربکا.

# بەشی سێیەم

## تیشکێك لەسەر چەمکە ئیمانییەکان

- مانای ڕاستەقینەی (عبادة) و (استعانة)
- مانای (رب) و پەروەرشیاریی خوا
- مانای (إله) و فریادڕەسیو فەرمانڕەوایی خوا .
- چۆنیەتی جێبەجێکردنی بەرنامەی خوا
- مانای تەواوی (إستعانە) و داوای یارمەتی لە خوا
- حەقیقەت و مانای (توکل) و پشت بە خوا بەستن
- پلەی پیاوچاکان و حەقیقەتی ڕێزلێ گرتنیان
- دەربارەی(وەسیلە) لە نێوان عەبدەکان و خوای گەورەدا
- دەربارەی غەیب زانین
- پوختەیەك دەربارەی شەفاعەت
- چۆنیەتی دوعاکردن و لەخوا پاڕانەوە

## مانای راستەقینەی (عبادە)و (إستعانە):

ئەگەر ئینسان ئیمانی بە قیامەت وا جێگیر بوو، کە ئیحساس بە مەسئولیەت هەموو گیانی داگیرکرد، ئەو کاتە زۆر ئاسان لەگەڵ خوای خۆی پەیمانی بەندایەتی ئەبەستێ و، قەولی پێئەدا کە لە هەموو ژیانیدا فەرمانبەرداری ئەوبێت. بۆیە لە سورەی فاتیحەدا لەدوای ﴿مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴾ ئەفەرموێ : ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ رێنماییمان ئەکا بۆ ئەوەی ئائەوە بڵێین، لەکاتێکا ئینسان گەیشت بە ئیمان بە ئاخیرەت ـ بەو جۆرەی رۆشن کرایەوە ـ ئامادەیە بۆ ئەوەی ببێتە بەندەی راستەقینەی خوا، ئالەو کاتەدا پەیمانی بەندەیی لەگەڵ خوای موتەعال ئەبەستێ.

عیبادەت یانی ئەوە ئینسان لە ژیانیا بۆ ئەوەی بچێ بەرەو کەماڵ، بۆ ئەوەی خۆی ئیصلاح بکا، لە ئیمەتەکان و ئیمکاناتێ کە خوا داویەتی، بەجۆرێ کەڵك وەرگرێ کە خوا خۆی فەرمویەتی. عیبادەت یانی ئەوە، کە لە پێشا بەدرێژی باسمان کرد.

بەڵام هەرجۆرە ئیستیفادە کردنێك لەو ئیعمەت و ئیمکاناتە نابگەیەنێ بەوە، ئەبێ بەپێی فەرمانی خوا ئیستیفادە بکا لێیان ، بۆ ئەوەی بەرەو کەماڵ بچێت و ئیصلاح ببێت، ئائەوە ئەبێتە عیبادەت. لێرەشدا رۆشن ئەبێتەوە کە خوا ئەفەرموێ : (جن و إنس)م هەر بۆئەوە خەلق کردووە کە عیبادەتم بکەن، عیبادەت شتێك نیە سوود بە

خوا بگەیەنێ، یا ئەگەر نەکرا زیان بەو بگاو کاری ئەو پەکی بکەوێ.
ئەوە کە ئەفەرموێ ئینسانم هەربۆئەوە خەلق کردووە کە عیبادەتم بکەن، مانای ئەوەیە ئینسان بۆ ئەوەی بەرەو کەماڵ بڕوا، بۆ ئەوەی ئیصلاح بێ. بۆ ئەوەی ببێ بە ئینسان.. پێویستی هەیەکە بەرنامەیەکی ببێ‌و بەپێی ئەو بەرنامەیە بەهرە ببا لە نیعمەتەکانی خواو لەو ئیمکاناتەی لە دەسڕەسیدا قەرار دراون. جا ئەفەرموێ : ئەو بەرنامەیە هەر لای خۆمە، کەسی تر ناتوانێ بەرنامەی ئاوا دابنێ.

کەوابو عیبادەت هەر بۆ ئینسان خۆیەتی، سوودی هەر بۆ خۆیەتی، ئەگەر بیکا خۆی بەهرە ئەبا، ئەگەر نەیکا خۆی تووشی زیان ئەبێ.

جا کاتێ ئینسان بڕیاریدا لەسەر ئەوە کە لە ژیانیدا لە کەڵك وەرگرتن لەهەر نیعمەتێك لە نیعمەتەکان، تەنها بەفەرمانی خوا بجوڵێتەوەو، لە هیچ گۆشەیەکی ژیانیدا ئامادە نەبێ کە فەرمانبەرداری لەغەیری خوا بکا، قانون و بەرنامەی غەیری خوا بەکاربێنێ بۆ کەڵك وەرگرتن لەو ئیمکاناتو نیعمەتانە، نەبێ روو بکاتە خاوەنەکەی خۆی و داوای کۆمەکی لێ بکا، چونکە ئەزانێ کە ناتوانێ یەك هەنگاویش هەڵگرێ بەبێ ئەوەی ئەو کۆمەکی بکا. ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ ئەمەیە.

جا کە گەشتینە سەرئەم باسە، با کەمێ زیاتر مانای ئەم دوو وشەیە رۆشن بکەینەوە.

(عبادە و إستعانە):

﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ﴾ باسی فەرمانبەرداری وئیتاعەتی ئینسانە لە خوای گەورە لە هەموو ژیانیدا.

﴿وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ باسی (توکل) لەسەر خوایە، بەپشتو پەنا زانینیەتی، داوای کۆمەك لێکردنی لەژیاندا، بۆ ئەوەی فەرمانبەرداری وعیبادەت وا بێ کە خۆی لە ئینسانی داوا کردووە.

جا بۆ ئەوە ئەم باسە رۆشن بێ، ئەبێ ئەم چەند شتە لەپێش چاو بنو سەرنج بدرێن :

یەکەم : خوای گەورە دروستکاری ئاسمانەکانو زەویو هەموو شتێکە کە تیایاندایەو، شتێك نیە ئەو دروستی نەکردبێ. لەبارەی خواوە، ئینسان لەسەرەتاوە ئەبێ ئەوەی لارۆشن بێ کە هەرئەو بەدیهێنەری هەموو دروستکراوەکانە. تا ئێرە هەموو خەلکی وەك یەکن، تەنانەت ئەوانەش کە شەریکیان بۆ خوا قەرارداوە، دوای ئەوەی حەقیان بۆ رۆشن بۆتەوە و هەرماونەتەوە لەسەر شەریك بۆ خوا قەراردانوکافر بوون ، ئەوانیش باوەڕیان بووە کە غەیری خوا کەسی تر بەدیهێنەر نیە.

لە قورئاندا زۆر ئایەت هەن باسی ئەوە ئەکەن ئەوخەلکەی پێش هاتنە خوارەوەی قورئان بوون و، لە زەمانی پێغەمبەرەکانی تردا (علیهم صلوات الله وبرکاته) ژیاون، پێغەمبەران بۆ رێنمایی و هیدایەتی ئەوان

هاتوون، لەدوای ئەوە کە دەعوەتەکەیان قبوڵ نەکردوە و، هەر لەسەر گومڕایی خۆیان ماونەتەوە، خوای گەورە لەناوی بردوون. ئەوانیش زانیویانە هەر خوا بەدیهێنەرەوکەسی تر نیە. تا دەگاتە فیرعەون ـ کەمەشهورە لافی خوایەتی لێداوە ـ خوای گەورە باس ئەکا کە ئەویش عەقیدەی وابووە کە هەر خوا خالقە.

بە کورتی هیچ میللەتێك ـ لەوانەی قورئان باسیان دەکات ـ تیایاندا نەبووە ئەوە نەزانێ کە هەر خوا بەدیهێنەرو خالقە. وەك ئەفەرموێ : ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾ ، ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ﴾. ئەگەر لێیان بپرسی : کێ ئێوەی خەلق کردووە؟ کێ دروستی کردوون؟ ئەڵێن (الله). ئەگەر لێیان بپرسی : کێ ئاسمانەکانو زەوی خەلق کردووە و، خۆر و مانگی کردۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و بە فرمانی خۆی ئەیانگەڕێنێت؟ ئەڵێن: (الله).. غەیری ئەوانەش ئایەتی تر زۆر هەن لە قورئاندا کە ئەو باسە ئەکەن ئەگەر کەسێ یان کەسانێ بووبن لە ڕابردوودا عەقیدەیان وا نەبووبێ کە خوا خالقە، ئەوە ئەوەندەکەم بوون کە قورئان باسیان ناکاو، هیچ ناوێکیان لێ نابات.

لەبەرئەوە لە قورئاندا ـ غەیری باسی ئەوانەی زانیویانە خوا خالقەو دروستکەری ئاسمانەکانو زەوی‌و ئەوشتانەیە کە تیایاندایە ـ هیچێکی تر نابینی. ئەمەیەك.

دووەم : دوای ئەوە ئەبێ ئینسانی موسوڵمان باوەڕی بێ بەوەی کە هەر خوایە ئەتوانێ هەر شتێ بکاو، غەیری ئەو هیچ شتی ترو هیچ کەسی تر ناتوانێ یەك کاریش ئەنجام بدا. بەمانای ئەوەی کە مەخلوقەکان هەرکام سەبەب و وەسیلەیەکن، خوای گەورە خەلقی کردوون بۆ ئەوە ی بەهەرکامیان ئیش وکارێ بکرێ. بۆغونە : ئەگەر ئاگر ئەسوتێنێ، ئەوە لە حەقیقەتا خوایە کە ئەسوتێنێ، ئاگر تەنها سەبەبێکە خوا دایناوە بۆ سووتاندنی ئەو شتانەی کە ئەسوتێن. ئەگەر ئاگر بوو بەڵام ئەو ئەیویست کە شتێ بسوتێنێ، ئاگر ناتوانێ لەخۆیەوە شت بسوتێنێ، هەروەك لە قورئانا باسی ئەکا لەکاتێکدا پێغەمبەری خوا ئیبراهیم (علیه الصلاة والسلام) کافرەکان خستیانە ناو ئاگر، لەجیاتی ئەوەی بسوتێ یان تەنانەت گەرمای بێ، فێنکی بوەوە و ئاگرەکە سارد بووەوە، هیچ تەئسیرێکی تێنەکرد، لەبەرئەوە لەڕاستیدا ئاگر نیە کە ئەسوتێنێ ، خوایە ئەسوتێنێ، دەی هەر کاتێك ویستی ئەسوتێنێ، ئاگر لەگەڵ ئاو هیچ فەرقی نابێ.

خوای گەورە بەرنامەی وا داناوە بۆ ئەوەی شتێك بکا، سەبەبێك دێنێ، خۆیشی بەهۆیَ ئەو شتە بێ، ئەبێ. ئەگەر سەبەبەکە ئەبوو، یان سەبەبەکەی بوو، بەڵام ئەو ئەیویست، ئەوە ئەو شتە ڕوونادا.

ئەوەش ئەبێ بزانین ئەگەر هاتوو سەبەبی شتێك هەبوو وەك ئاگر، خواش ویستی ئەو شتە بێ، ئەوە حەقەن سووتاندن ئەبێتو هیچێکی تر

پێویست نیە. هەر سەبەبە کە پێویستەو ئیرادەو ویستی خوا، ئەگەر هاتو سەبەب بوو، ئەویش ویستی ، حەقەن ئەوە ئەو شتە روو ئەداو نیاز بەشتێکی سێیەم نیە. جا لە دوایدا ـ لەباسی داوای کۆمەك کردن لە خوا ـ دووبارە ئەچینەوە سەر ئەم باسە.

سێیەم : شتێکیترکە ئەبێ موسوڵمان بڕوای پێی بێ، ئەوەیە کە هەر خوا خاوەنی ئاسمانەکانو زەویو ئینسانو غەیری ئینسانە. مانای ئەمە ئەوەیە بۆ ئەوەی دروستکراوێك بڕوا بەرەو کەماڵ و بەرەو تەواوبوون، هەر خوایە ئیمکاناتی بۆ رێك ئەخا ، هەر ئەوە ئەتوانێ کۆسپوگرفت لە رێگایدا لابەرێ. هەروەك چۆن جوتیارێك ـ بە زاهیر ـ کە زەراعەتێ ئەکا، هەموو ئیمکاناتێ کە لازمە بۆ ئەو زەراعەتە سازو ئامادەی ئەکا- لە زەوی وئاوو لەمەوادی غەزایی و غەیری ئەمانە - ئەگەر هاتو ئافەتێك یا بەڵایەکیش هاتە سەر رێی زەراعەتەکەی هەوڵ ئەدا بۆ ئەوەی لای ببا.

جا کە وتمان ـ بە زاهیر ـ لەبەرئەوەی ئەو جوتیارەش هەر سەبەبێکە، لەحەقیقەتا ئەوە خوای گەورەیە کە ئەو ئیمکاناتە ئامادەو ساز ئەکا، ئەوکۆسپەو گرفتانەش لەسەر رێگەی لا ئەبا. جا هەروەك چۆن ئەو جوتیارە ئاوا ئەکا، خوای گەورە ـ وللهِ المَثَلُ الأعْلى ـ بۆ هەر مەخلوقێك، بۆ ئەوەی بڕوا بەرەو کەماڵ و بگاتە ئەو سنورەی خوا بۆی داناوە، چی پێویستە لە ئیمکاناتو نیعمەتەکان، ئامادەی

کردووەو ئامادەی ئەکاو، چ کۆسپێك دێتە سەر ڕێی لای ئەبار نایهێڵێ.

## مانای (رب) و پەروەرشیاریی خوا

هەروەها مانای خاوەن بوونی خوا ئەوەیە کە دەسەڵاتی هەیە بەسەر ئینسانو غەیری ئینسانداو، چارەنووس تەنها لە دەستی ئەودایە، هەم ئێستای مەخلوقات لەدەست خوادایە، هەم عاقیبەتیشیان.

جا کاتێ ئینسان ئیمانی بەوە هێنا تەنها خوای گەورە ئیمکاناتو پێویستیەکانی بۆ ئامادە ئەکا، تەنها ئەویشە کۆسپەکان لەسەر ڕێی لائەباو، دەسەڵاتی هەیە بەسەریەوەو، سەرەنجامی دیاری ئەکا، ئەوە ئیمانی هێناوە بەوەی خوا خاوەنیەتی. بەعەرەبی خوای گەورە بووەتە (ربّ) بۆی، ئەمەش لەزۆرێك لە ئایەتەکاندا باس کراوە، زۆرێك لە ئایەتو سورەتەکانی قورئان باسی ئەوە ئەکەن ئەم شتانە هەر لە دەست خوادان، هەر ئەوە (ربّ)و، غەیری ئەو ئینسان خاوەنێکیتری نیە. هەروەك بەیانی ئەوە ئەکەن کە هەم (ربّ)ی ئینسانە، خاوەنی ئینسانە، هەم خاوەنی ئاسمانەکانو زەویو هەموو ئەو شتانەیە لە بەینیاندایە.

## مانای (إله) و فریادرەس و فەرمانڕەوایی خوا

دوای ئەوە ئینسان گەیشتە ئێرە، جا کاتی ئەوەیە بڕیار بدا لە ژیانیدا تەنها هەر خوا فەرمانڕەوای بێ، هەر لەو ئیتاعەت و فەرمانبەرداری بکا، تەنها داوای کۆمەك لەو بکا.

ئەگەر وای لێ هات ئەوە مەعنای (لا إله إلا الله)ی بۆ خۆی بەدی هێناوە. (لا إله إلا الله) مانای ئەوەیە : بێجگە خوا فەرمانڕەوای تر نیە، بێجگە لەو فەریادڕەسی تر نیە. قورئان باسی ئەوەش ئەکا ئەوانەی شەریکیان بۆ خوا قەرارداوەوکافر بوونو دوژمنی خوا بوون، لەو دوو شەی پێشوودا، (دووەمو سێیەم) هەروەك موسولمان بوون، باوەڕیان بووە هەر خوایە ئەتوانێ هەر شتێ بکا، باوەڕیشیان بەوە بووە هەر ئەوە خاوەن ، بەمانای ئەوە هەر ئەوە ئیمکاناتو نیعمەت ئەدا بە مەخلوقەکانی، هەر ئەویشە هەر کۆسپێك لەسەر ڕێ لائەباو، لای بردووە، هەر ئەوە دەسەڵاتی هەیە بەسەر مەخلوقەکانیەوەو، سەرەنجامیان لەدەستیایەتی. هیچ کام لەو کافرانەی قورئان سەرگوزەشتیان باس ئەکا، وانەبوون وا بزانن غەیری خوا کەسێکی تریش ئەتوانێ ئەوانە بکا. تەنانەت فیرعەونو نەمرودیش کە قورئان باسی حاڵیان ئەکا ئەوەیان لێ ڕۆشن بووە کە هەر خوایە ئەتوانێ ئا ئەو شتانە بکا.

ئەوەش كە مەشهورە ئەڵێن فیرعەون ئیددیعای خوایی كردووە، ئەوە بەمەعنای ئەوەیە ئیددیعای كردووەكە ئەو فەرمانڕەوایە، وڵاتی میسر هەر بەدەست ئەوەوەیە، ئەبێ هەر قانونو بەرنامەی ئەوی تێدا ئیجرا بێ.. نەك ئەوە كە وای زانیبێ دروستكەرو خالقی خەڵكە، یا ئەتوانێ ئیمكاناتو نیعمەت بۆ خەڵكی دروست بكا، یاكۆسپەكان لەسەر ڕێیان لاببا، یا سەرەنجامیان بەدەست ئەو بێت و ئەو دیاری بكا.

جا لێرەدا بەجێیە پرسیارێك بكرێ وبوترێ : ئەگەر ئەو كافرانە لێیان ڕۆشن بووەو باوەڕیان بووە بەوەی هەر خوا خالقە، هەر خوایە هەرشتێ ئەتوانێ بكا، هەر خوایە كە خاوەنە ، ئیتر گومڕاییان لە چیا بوو؟ ئیتر بۆ لایان داوە؟ خوای گەورە بۆچی پێغەمبەری ناردووە بۆیان كە دەعوەتیان بكا بۆ ڕێگای خۆی؟ مەگەر ڕێگای ئەو چیە؟

لە قورئاندا ئەوەش باس كراوە كە ئەو كافرانە زیاتر لەوەش شتی تریان بووە، باس ئەكا كە كافرەكانی زەمانی هاتنە خوارەوەی قورئان نوێژیان كردووە، حەجیان كردووە، لە فەرموودەی صەحیحا هەیە كە ڕۆژوویان گرتووە. هەروەها لە ئوممەتە پێشووەكانیش زۆرێك بوون عیبادەتیان بۆ خوای گەورە ئەنجام داوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەدا ئەفەرموێ : ئەوانەی گومڕا بوون، ئێمە پێغەمبەرانمان ناردووە بۆ ئەوەی دەعوەتیان بكەن تا بێنەوە سەر ڕێگای بەندایەتی و عیبادەتی خوا .

جا بەجێیە ئەم پرسیارە بکرێ : ئەگەر ئەو شتانەیان بووە، ئاوا عەقیدەو باوەڕیان بە خوا بووە، ئیتر بۆ گومڕا بوون؟! کەسێ بزانێ هەر خوا خالقە، هەر خوایە هەرشتێ ئەتوانێ بکا، هەرخوایە خاوەنەو ئەتوانێ ئیمکانات ئامادە بکاو کۆسپەو مانع لەسەر رێ لا ببا، دەسەڵاتی بەسەر مەخلوقەکانیەوە بێت، سەرەنجامیان لەدەست ئەوایێ، کەسێ نوێژ بکا، رۆژوو بگرێ، حەج بکا، نەزر بکاو، شتانی تریش غەیری ئەمانە، ئیتر بۆ گومڕایە؟ بۆ لەڕێ لای داوەو ناموسوڵمانە ؟ بۆ پێویستی هەیە بەوە کە پێغەمبەری بۆ بنێردرێو دەعوەتی بکا بۆ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای خوا؟ مەگەر ئەو پێغەمبەرانە چییان فەرمووە وا خەڵکەکە بوون بە دوژمنیان و لەگەڵیان بەشەڕ هاتون و، حازر نەبوون بکەونە شوێنیان و، ئاوا کە ئەوان بۆیان باس ئەکەن عیبادەتو بەندەیی خوا بکەن؟مەگەر عیبادەت غەیری ئەو شتانەیە؟ بەڵێ ئەو پرسیارانە بەجێن و ئەگەر کەسێك جوابی ئەو پرسیارانە نەزانێو، باش لای روون نەبن، ناتوانێ بەندەی خوابێ، ناتوانێ بەو جۆرەی کە لێی داوا کراوە عیبادەت و بەندەیی خوا بکا. وەلامی ئەو پرسیارانەش ئەوەیە : هەروەك وتمان قورئان لە زۆرێك لە ئایەت و سورەتەکانیا باسی کردووەکە ئەو خەڵکە ئاوا بوون، ئەوە جێی گومان نیە، ئینسانێك جارێك بەدەوركو فەهمەوە قورئان بخوێنێتەوە ئەوەی لێ رۆشنە کە ئەو عەقیدە و بیروبڕوایە هەبووە.

بەڵام گومراییان لەوەدا بووە کە لە ژیانیاندا ـ دوای ئەوە هەر خوایان بە خالق و خاوەنی خۆیان زانیوەو، هەندێ عیبادەتو بەندەییان بۆ کردووە ـ فەرمانڕەوای تر غەیری خوایشیان بووە، لە ژیانی خێزانیدا، لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا، لە ئابووریاندا، لە سیاسەتیاندا، لە هەندێ شتی تری ژیانیاندا، ئیتاعەت و فەرمانبەرداری‌یان لە قانونی غەیری خوا کردووە،( فەرمانڕەوا) ی تریان هەبووە کە بە فەرمانی خوا حکومەتیان نەکردووە بەسەریانەوە. ئەوانیش قبوڵیان کردووە غەیری خوا و، غەیری قانون و بەرنامەی خوا، حاکم بێ بەسەریاندا. خوا ئەفەرموێ : ئەوانە ـ بەو کارانە ـ ئیددیعای خواییان کردووە، ئەوە یەکێکە لە گومراییەکانیان..

ئەوی تریشیان ئەوە بووە کە لە ژیانیاندا جگە لە خوا (فەریادڕەس) ی تریان بووە، ئەگەر چی هەر خوایان بە خاوەنی خۆیان زانیوە، بەڵام وتویانە ئێمە راستەوخۆ دەستمان بەخوای گەورە ناگا، روو ڕەشین، گوناهکارین، ناتوانین لەرێی خۆمانەوە لەگەڵ خوا پەیوەندی بکەین ، جا با تکاکارو واسیتەو وەسیلە بێ لەبەینی ئێمەو خوادا تا ئێمە لەو بپارێنەوەو، ئەویش لە خوا بپارێتەوە بۆمانو داوای کۆمەکمان بۆ بکا.

ئائەم دوو شتە بوون کە خەڵك تووشی بوون و، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بۆ راستکردنەوەی هاتوون.

## چۆنیەتی جێبەجێکردنی بەرنامەی خوا

ئەگەر بمانەوێ بە کورتی سەرگوزەشتی تەواوی پێغەمبەرانی خواو تەواوی موسوڵمانەکانی تەئریخ‌و تەواوی کافرو نا موسوڵمانەکان بەیان بکەین، ئەڵێین :

دوای ئەوە کە خەڵکی تووشی ئەو جۆرە بیروبڕوایانە بوون، تووشی ئەو دوو گومڕاییە بوون: (غەیری خوا فەرمانڕەوای تریان قبوڵ کرد.هەروەها غەیری خوا فریادڕەسی تریان بڕیار دا)، خوای گەورە بەمە رازی نەبوو، پێغەمبەرەکانی یەك لەدوای یەك نارد بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی رۆشن کەنەوە کە ئەبێ لە ژیاندا فەرمانبەرداریی هەر لە خوا بکەن. هەر ئەو فەرمانڕەواو حاکمیان بێ. تەنها داوای کۆمەکیش لەو بکەن و هەر ئەو فریادڕەسیان بێ. ناردنی بۆئەمە،خەڵکەکەش ئەمە بەلایانەوە زۆرگران بوو. هەروەها حاکم و دەسەڵاتدارەکان ـ ئەوانەی خۆیان کردبوو بە فریادڕەس‌و خۆیان وا ناساند بوو بە خەڵك کە ئەتوانن لای خوا شتێکیان بۆ بکەن، ئەوانەیان کە خۆیان خۆیانیان ناو نابوو فریادڕەسی خەڵك‌و، بە درۆ و بەناحەق خۆیانیان کردبوو بە واسیتەو وەسیلە لەبەینی خەڵك‌و خوادا ـ ئەوانە ئەوەیان بەلاوە گران بوو، حازر نەبوون ئەو هەموو دەسەڵات‌و مەقام‌و سەروەت‌ومالەی کە لەو رێگەیەوە دەستیان کەوتبوو دەستی لێ بەردەن، بۆیە دوژمنایەتییان کرد لەگەڵ پێغەمبەرەکانی خواو لەگەڵ

بانگکردن بۆ ڕێگەی خوا، لەسەر بەرنامەی کوفرو دووریی لەبەندەیی خوا هەرمانەوە، خواش لەبەینی بردن، چونکە ئەگەر ئینسـان فـەرمانی غەیری خوا قبوڵ بکاو تووشی شەریك قەراردان بۆ خوا بێ، ئیتر خوا هیچی لێ قبوڵ ناکا. ئایەتی زۆر لەم بارەیەوە لـە قورئانـدا هـەن. بـۆ نموونە ئەفەرموێ : ﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَاء شَرَعُوا لَهُم مِّنَ الدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَن بِهِ اللَّهُ﴾، ئەم شەریکانە چی‌یان کردووە؟ خۆ ئەیان وتووە ئەمانە خـالقن، یا ئەمانە خاوەنیانن، یا رازقن و، یا سەرەنجامیان لەدەستیاندایە.. نەخێر، وایـان نـەزانیوە، بـەڵام ئەوانـە هــاتوون بەرنامــەو قانونێکیــان بــۆ دامەزراندوون، کە خوا ئیزنی پێنەداوەو پێـی رازی نـەبووە کـە ئـاوا کردویانن بە شەریك. ئەوە کە قبوڵیان کردووە کەسێك لە مەخلوقاتی خوا، یا بەندەکانی خوا، بێـت بەرنامـەو قانونیـان بـۆ دابنـێ ، قـانونی غەیری خوا حوکم بکا بەسەریاندا.. تا ئەوە شەریك قەراردانە بۆ خوا، کەسانێك کە لەبەینی ئەبردوون، وبەستوویەتی بەهاتنیان بۆ ئەهێڵێ، لـە پێشا کەسێکیان بۆ بنێرێ تا هیدایەتیان بداو، ڕێیان بۆ ڕۆشن بکاتـەوە، ئەگەر نەهاتنەوە سەر ڕێی بەندەیی خـوا، جـا ئەوکاتـە ئـیتر بەتـەواوی لەبەینیان ئەبات.

لەئایەتێکی تردا ئەفـەرموێ : ﴿إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلَّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ﴾ : حوکمو فەرمانڕەوایی، قانون دانـان، بـەقانون حـوکم کـردن، هەر شایەنی خوایە، هەر ئەوە حاکم و فەرمانڕەوایە، ئەوە فەرمانی داوە

بێجگە خۆی بەندەیی و فەرمانبەرداریی بۆ کەسیتر نەکرێ، ئیتاعەت لە قانونو فەرمانی کەسی تر نەکرێ.

﴿ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَـكِنَّ أَكْثَرَ النَّـاسِ لاَ يَعْلَمُـونَ﴾ : ئائـەوە ڕێوڕەوشتی ملکەچ کردنو ئیتاعەت و فەرمانبەرداریەیە، کـە ڕێـكو پێکەو هیچ کەموکوڕی تیا نیە، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن، زۆرتری خەڵکی وا ئەزانن ئەگەر هەر ئەوەندەی خوایان بە خالقی خۆیان زانیو بەخاوەنی خۆیان زانیو نوێژیان کردو ڕۆژوویەکیان گرت ، ئیتر قـەی ناکا ئەگەر ئیتاعەت و فەرمانبەرداری لەغەیری خوا بکەن.

بەڵێ، خوای گەورە تەنها یەك شێوە بەندایـەتی قبـوڵ ئـەکا ، کـە بەپێی قورئان و ژیاننامـەی پێغەمبـەر بـێ (ﷺ). چـۆن یـارانی دەسـت پەروەردەی پێغەمبەری خوا (خوا لێیان ڕازی بـێ) ژیانیـان بەسـەربرد، ئەبێ ئاوابێ. ئەوان چۆن بەرنامەی خوایان جێبەجێ و پیـادەکرد، ئـەبێ ئاوەها بێت.

دوای ئـەوەش لــە هــەر زەمانێکــدا ئەوانـەی وا زانــاو پســپۆڕو (مجتهد)ن، بەیەکەوە هەر شـتێك بـاس ئەکـەن وەمەشـوەرەت و ڕاوێـژ ئەکەن، بەچی ئەگەن، چ نەتیجەیەك ئەگرن، لەسەر چی ڕێك ئەکەون، ئەبێ موسڵمان لەوەیش ئیتاعەت بکا. موسوڵمان لەو سێ شتە ئەگـەر ئیتاعــەتی کــرد، یسانی فەرمانبــەرداریی کــردووە، ئیتاعــەتی لــەخوا

کردووەو، خوای گەورە بەوە رازییە. ئەگەر شوێنی ئەوانە نەکەوت، ئەوا لە رێگەی بەندەیی لای داوە.

خۆ ئەگەر زەمانێك وابوو ـ وەك ئێستا ـ کە رێك نەکەوت زانا موسوڵمانەکان یەك بگرن و بەیەکەوە دینی خوا بۆ خەڵك رۆشن بکەنەوە، ئەوە لەبەر ناچاری قەی ناکا ئینسان بکەوێتە شوێن فەرمودەی یەکێك لە ئیمامو پێشەواکان، تا ئەوەندەی وەزعەکە بگۆڕێو، رێك کەوێ کە زاناو موسوڵمان و(مجتهد)و(متخصص)ەکان یەك بگرنەوە، ئەوان ئیدارەی کاروباری کۆمەڵ بگرنەوە دەست، حکومەتی ئیسلامی بێننەوە سەرکار ، قانونو بەرنامەی خوا بێننەوە ناو خەڵك، دەست بکەن بە ئیجرا کردنو پیادەکردنیو، لەناوخۆیانا کەسێك هەڵبژێرن، کە هەروەکو رەئیس جمهورێکە، دوای ئەوەی ئەوان قانونو بەرنامە لە کتێبی خواو لە سونەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەردێنن، بیدەنە دەست ئەو، ئەویش ئیجرای بکا لەناو خەڵکدا..

هەروەك چۆن لە زەمانی پێغەمبەری خواو یارانیو خولەفای راشیدیندا وابوو، قانونو بەرنامەی کۆمەڵ قورئان و ئەو رێنوڕەوشتەی پێغەمبەری خواو یارانی بوو کە دایان نابوو، دوای ئەوە هەرشتێ رووی ئەدا، ئەوانەیان کە پسپۆڕ و (مجتهد)و زانابوون کۆ ئەبوونەوەو رێك ئەکەوتن لەسەر شتێ، ئیتر خەڵکیتر واجب بوو لەسەریان ئیتاعەت بکەن لەوشتە.

**(سابقین)ی (أولین) و شوێن کەوتوانیان :**

لێرەشدا با ئەوە باس بکەین کە خوا لە قورئاندا باسی ئەوەی کردووە، ئەگەر ئینسان هەروەك ئەبێ بکەوێتە شوێن قورئان، ئەگەر وا بکەوێتە شوێن پێغەمبەری خواو یارانی دەستپەروەردەی ئەوو بەو رێیەدا بڕوا کە ئەوان پیایدا رۆیشتوون، ئەوە خوا رازی ئەبێ، ئەگەر نا خوای گەورە رازی نابێ.

جا کە دەڵێین یارانی دەست پەروەردە، مەبەست ئەوانەن قورئان ناویان ئەنێ (سابقین)ی (أولین)و، ئەوانەی بە چاکی بە شوێن ئەواندا چوون. (سابقین) واتە : ئەوانەی پێشڕەو بوونو پێش کەسانیتر کەوتوون. ئەوانەی لە رێگای بەندەییدا وەستانیان نەبووەو، تووشی لادان نەبوون، تووشی ئەنجامدانی کردەوەی ناشایستە وگوناهی گەورە نەبوون، هەمیشە لەحەرەکەت و رۆشتنا بوون بەرەو خوای گەورە. ئەوە مەعنای (سابقین)ە (أولین)یش : مەبەست ئەوەیە پێش لە خەڵکی تر موسوڵمان بوون. ئەو موسوڵمانانەی پێش لە کۆچ کردن بۆ مەدینە بڕوایان هێنا، ئەو موسوڵمانانەی مەدینەش کە پێش لەوەی پێغەمبەری خواو یارانی کۆچ کەن بۆ ئەوێ، موسوڵمان بوون. ئەوانە (سابقین)ی (أولین)ن. هەرکەسی تریش لەدواییدا موسوڵمان بووبێ و بە شوێن ئەواندا چووبێ، ئەوانیش ئەوانەن قورئان وەسفیان ئەکا بە : ﴿وَالَّذِينَ اتَّبَعُوهُم بِإِحْسَانٍ﴾ وەك لەئایەتی سەدی سورەتی تەوبەدا

باسیان ئەکا. خوا دەرهەقیان ئەفەرموێ : لەوسێ دەستەیە رازی بووە، بەهەشتی بۆ ئامادەکردوون، هەموو نازو نیعمەتەکانی بەهەشتی بۆ داناون : ئەوانەی کۆچیان کرد بۆ مەدینە، ئەوانەی لە (أنصار)و یاریدەدەرانیش بوون، لە مەدینەدا بوونو کۆمەکی (مهاجرین)یان کرد، ئەوانەش دوایی بە شوێن ئەواندا چوون، ئەوانەی دەست پێشخەر بوونو لەرێگای بەندەییدا نەوەستانو، پێش لە خەلکی تر موسولمان بوون، رچەیان شکاندو رێیان رۆشن کردەوە بۆ خەلك.

جا بەپێی ئەو باسەکە ئەفەرموێ : خوا لەو سێ دەستەیە رازی بووە، ئەگەر کەسێك بە شوێن ئەواندا چوو، لە ژیانیدا رێوڕەوشتی ئەوانی کرد بە بەرنامەی خۆی، ئەوە خوا لێی رازی ئەبێ. ئەگەر نا گومڕایەو لای داوەو خوای گەورە لێی قبوڵ ناکا. ئەمە زۆر گرنگەو ئەبێ موسلمانان لێی بەئاگا بن. ئەبێ بزانن کە صەحابە ویارانی پێغەمبەری خوا وەك خەلکی تری عادی نین، رەزامەندی و لێخۆشبوونی خوا لەرێگای شوێنکەوتنی ئەوانەوە دەستی ئینسان ئەکەوێ.

جا ئەگەر کەسێ شوێنکەوتووی ئەوان نەبێ ئەوە نەزانو گومڕایە، ئەگەر دینی بۆ رۆشن نەکرابووەوە، ئەوە نیازی بەوە هەیە بۆی روون بکرێتەوە، ئەگەریش خۆی زانیبوی قورئان چی باس کردووە، زانی بووی چەندە ئایەت هەن لە قورئاندا بۆ باسی ئائەمە ـ کە تەنها لەرێی

شوێنکەوتنی ئەوانەوە ئیمان رەزامەندی خواو بەهەشتی دەست ئەکەوێ‌و لە عەزابی جەهەننەم رزگار ئەبێ ـ ئەگەر ئەوەی زانی بوو، دوای ئەوە هەر خەریکی ئیهانەت کردن و قسە وتن بوو پێیان، لە جیاتی ئەوەی شوێنیان کەوێ، خەریکی دوژمنایەتی بوو لەگەڵیان، ئەوە دیارە ئەبێ شك لە ئیمانیا بکرێ.

بەهەرحاڵ تاکاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی کرد ولە دنیا دەرچوو، بەرنامە ئاوابوو، قورئان قانونی کۆمەڵ بوو، پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتەکانی باس ئەکرد بۆ خەڵك . ئەو شتانەی کەسی‌تر نەیئەزانین ئەو رۆشنی ئەکردنەوە، لەو شتانەیشا کە روویان ئەدا– وەك ئەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە (جەنگ)و(صولح)ەوە بوو، یان پەیوەندییان بە ئابوری‌و سیاسەتەوە بوو، یا غەیری ئەوانە– خۆی بانگی ئەکردە (مجتهد)و (متخصص)ەکان لەناو یارانیدا ـ ئەوانەیان کە خاوەنی راوبۆچوون بوون ـ ئەوانیش لەخزمەتیدا دائەنیشان و بەیەکەوە مەشوەرەتیان ئەکردو ئەگەیشتن بە نەتیجەیەك و رێك ئەکەوتن لەسەری.. ئەوەش ئەبوو بە قانون و فەرمانێ کە ئەبوایە موسوڵمانەکان ئیتاعەتیان لێ بکردایە.

دوای ئەوەی ئەوکۆچی دوایی کرد، بەرنامە هەر بەو جۆرە بوو، تەنها ئەوە بوو ئەو لە ناویاندا نەبوو. جا دوای ئەو بۆ ئەوەی کەسێك ببێت قانون و بەرنامەکان ئیجرا بکاو جێبەجێیان بکا، ئەو (مجتهد)و

پسپۆڕانە لەناو سەحابەدا ـ ئەوانەی ئەیانتوانی بەرنامەو قانونی خوا لە قورئان دەربهێنن‌و رۆشنی بکەنەوە بۆ خەڵك ـ هەڵسان یەکێکیان لەناو خۆیانا کە بە باشترینی خۆیانیان ئەزانی (ئەبوبەکری صدیق)یان ـ خوا لەو ولەوانی‌تریش رازی بێ ـ هەڵبژارد بە عینوانی خەلیفە تا نوێنەری ئەوان بێ لە ئیجرا کردن‌و پیادەکردنی فەرمان‌و قانونی خوای گەورەدا. دوای ئەو (عومەری فاروق)، دوای ئەو (ذی النورین)، دوای ئەو (عەلی کوری ئەبو تالیب)، دوای ئەو (حەسەنی کوری عەلی) ئەم پێنج نەفەرە، پێنج خەلیفەن ، پێیان ئەوترێ (الخلفاء الراشدون) کە یەك لە شوێنی یەك زاناو مجتهد بوون، (متخصص) بوون، موسوڵمانەکان لە یارانی پێغەمبەری خواو شوێنکەوتووانی ئەوان هەڵیان بژاردن، واجب بوو لەسەر موسوڵمانان ئیتاعەتیان لێ بکەن‌و شوێنیان بکەون. دوای ئەوان ئیتر ئەو بەرنامەیە تێك چوو، نیزامێکی تر هاتە سەرکارو، کەم کەم قانون‌و بەرنامەی خوای گەورە هەروا رۆژ بە رۆژ بێگانە تر ئەبووەوەو غەریب ئەبووەوە ، تا ئاوای لێ هات کە ئێستا ئەبینین ، موسوڵمانان دوورن لە قانون‌و بەرنامەی خوا، لە جێی قانون‌و بەرنامەی ئەو قانون و بەرنامەی ئەورووپا و ئەمریکا و غەیری ئەوانە لەناو موسوڵماناندا ئیجرا ئەکرێ. دیارە واجبە لەسەر موسوڵمانان بە هەموو هێزو توانایانەوە هەوڵ بدەن بۆ ئەوەی جارێکی‌تر ئەوحکومەتە و ئەو وەزعیەتەی کە لەو کاتەدا بووە بێتەوە

سەر دەور. ئەوەی حوکم ئەکا لەناو کۆمەڵی موسوڵمانانندا بەرنامەی خواو قورئانو سوننەتی پێغەمبەری خوا بێ، زانا موسوڵمانەکان بەیەکەوە رێك بکەون لەسەر شتێکو، بیدەن بە کۆمەڵ تا ئیتاعەتی لێ بکەنو فەرمانبەرداری بن. بتوانن هەروەکو سەردەمی خولەفای راشدین خەلیفە لە خۆیان هەڵبژێرنو بتوانن بەتەواویی عیبادەتو ئیتاعەتی خوای گەورە بکەن.

ئەمە بە کورتی باسی فەرمانبەرداری‌کردنو ئیتاعەت کردن لە خوای گەورەو، قبوڵ کردنی ئەو بە عینوانی تەنها فەرمانڕەوا ، مانای (إِيَّاكَ نَعْبُدُ)بوو.

ئێستا کاتی ئەوەیە بەشی دووەم باس بکەین : ﴿وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ : داوای کۆمەك کردن لە خواو، کردنی ئەو بەتەنها فەریادڕەسو پشتیوان.

## مانای تەواوی (استعانە) و داوای یارمەتی لە خوا

وتمان هەرشتێك روونەدا لەم عالەمەدا تەنها خوا ئەنجامی ئەدا، هەر ئەوە ئەیکاو سەبەبێکی بۆ داناوە. کاتێ سەبەبەکە بوو، ئەویش ویستی ئەو شتە بێ، ئەبێت. ئەگەر سەبەبەکە نەبوو، یا سەبەبەکە بوو بەڵام ئەو نەیویست بێ، ئەوە ئەو شتە نابێ.

جا لەسەر ئەو ئەساسە، ئینسانێك كە بە ئاگایی و زانستەوە، ڕێگای ئیمانو بەندەیی خوای گرتبێ، ئەوە هیچ شتێك لە ژیانیدا ـ غەیری خوا ـ ناكا بە فریادڕەسو پەناو پشتیوانی خۆی، چونكە هەر شتێكی بوێ، یەوێ شتێك بۆی ڕووبدا، یا یەوێ تووشی هیچ زەرەرو زیانێك نەیەتو مەنفەعەتێكی دەست كەوێ، ئەوە هەوڵ ئەدا بۆ ئەوەی سەبەبی ئەو شتە بەكار بهێنێ، داواش بكا لە خوای (متعال) تا ئەو شتەی بۆ بكا، ئیتر تەواو بوو. یا ئەگەر یەوێ لە نەخۆشیەك ڕزگاری بێ، ئەچێ بە شوێن سەبەبەكەیا ـ بە شوێن سەبەبی شیفا لەو نەخۆشیە ـ كە ئەو دەواو دەرمانە تایبەتەیە خوا بۆی داناوە، كاتێك دەواو دەرمانەكە بەكار ئەهێنێ، داوا ئەكا لە خوا شیفای پێ بدا، ئیتر شتێكیتر نیە لەو بەینەدا.

بە كورتی بەبێ ئەو دوو شتە (بەبێ سەبەبو، بەبێ ویستو ئیرادەی خوا) هیچ شتێ نابێ. ئەگەر ئەو دووانە بوون حەتمەن شتەكە ئەبێ.

## حەقیقەت و مانای (توكل) و پشت بە خوا بەستن

بە پێی ئەو باسە، واجبە لەسەر ئینسانی موسوڵمان كاتێ ویستی شتێك بكا سەبەبەكەی بەكاربێنێ، لەگەڵ ئەوەش كە سەبەبەكە بەكاردێنێ ئەبێ تەوەككول بكا لەسەر خوا، داوای كۆمەكی لێ بكا. بۆ

نموونە (نەخۆش) واجبە لەسەری بڕواتە لای پزیشکەو دەواو دەرمانی لێ وەرگرێ، دوای ئەوە لەوکاتەدا دەرمانەکە بەکار دێنێ عەرز ئەکا : خوایە! ئەوا من واجب بوو لەسەرم بڕۆم دەواو دەرمان بێنمو بەکاری بهێنم، ئەوا بەکارم هێناو تەکلیفو وەزیفەی خۆم ئەنجام دا، جا خۆ ئەزانم ئەو دەرمانە خۆی شتێ ناکا، ئەگەر تۆ نەتەوێ چاك بیمەوە، جا لە تۆ داوا ئەکەم تەئسیر دابنێی لەو دەرمانەداو چاکم بکەیتەوە.

لەبەرئەوە موسوڵمان لە کاتێکا دەست ئەکات بە خواردن ئەڵێ : (بسم الله الرحمن الرحیم). لە بیریایەتی کە خواردن بۆ ئەوەیە خێرێکی دەس کەوێ، سوودێکی پێبگا، نەخۆشیو لەبەین چوون لەسەر ڕێی هەڵگیرێ، کۆسپ لەسەر ڕێی لابرێ.. دەی ئەزانێ ئەوانە هەر بەدەست خوان، بەڵام سەبەبێکی داناوە بۆ ئەوە کە (خۆراك)ە، خۆراکەکە ئەخوا، سەبەبەکە بەکار ئەهێنێ، جا تەوەککول ئەکا لەسەر خواو دوعا ئەکا، داوای لێ ئەکا ئەوکارەی بۆ بکا. لە (بسم الله الرحمن الرحیم) وتندا یادی ئەو خوایە ئەکا کە سوودگەیاندنو زیان لە کۆڵ کردنەوە هەر بەدەست ئەوە. ئەوەیە مەعنای (توکل) کە پێویستە ئینسانی موسوڵمان لێی حاڵی بێ.

(توکل) ئەوە نییە ئینسان تەرکی وەزیفە بکا، لە ئەدای ئەرکی بەندەییو عیبادەتو مەسئولیەت دەس بکێشێ، جا بڵێ : خوا

گەورەیەو خوا بۆم ئەکا.. نەخێر، خوا شتی وا ناکا، ئەبێ سەبەبی شتەکە بەکاربێنێ، جا داوا بکا لە خوا ئەو شتەی بۆ ئەنجام بدا.

بۆنموونە : ئەگەر ئینسان بیەوێ خوا لە ئاخیرەتا رەحمی پێبکا، لە گوناهەکانی ببورێو نەیخاتە جەهەننەم و، بیخاتە بەهەشتو لێی رازی بێ، ئەوە ئەبێ سەبەبی ئەو شتە بەکاربێنێ. ئەبێ سەرەتا لەرێی گومرایی بگەرێتەوەو، دەس بکا بە حەرەکەت کردن لە رێگای ئیمانو عەمەلی سالحدا، جا دوعا بکاو بڵێ : خوایە! ئەوە من سەبەبەکەم بەکارهێنا، لە گومرایی گەرامەوە، ئەوە هاتمە سەر رێگای ئیمانو عەمەلی سالح، جا لە تۆش داوا ئەکەم لێم ببوری، رەحمم پێبکەی ولە عەزاب رزگارم کەی، لە نیعمەتو خۆشبەختی بەشم بدەی.

کەوابوو لەبەرئەوەی هەر مەخلوقێك لە مەخلوقات، تەنها سەبەبەو خۆی بەخۆیەوە ناتوانێ هیچێك بکاو، هەرخوایە ئەتوانێ هەرشتێ بکا، لەبەرئەوە، ئینسان جێگای ئەوەی نیە کە هاوار لە غەیری خوا بکاو لەغەیری خوا داوای کۆمەك بکا، کەسی ترو شتیتر نیە ئینسان بتوانێ داوای کۆمەکی لێ بکا، بۆ نمونە ئەفەرموێ : ﴿قُلْ إِنَّمَا أَدْعُو رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِهِ أَحَدًا﴾، ئەفەرموێ :

بڵێ: هەر لە خاوەنەکەم داوا ئەکەم کە شتێکم بۆ بکا، (دوعا کردن ئائەوەیە، ئینسان داوا بکا خوا سودێکی پێبگەیەنێ، یا لە زەرەرو زیانێ رزگاری بکا). هەر هاوار لای ئەو ئەبەم، هەر لەو

داوای کۆمەك نەکەم، کەسیتر ناکەم بە شەریکی ئەو لە هاوار لێکردندا. دەی ئەوە مانای ئەوەیە ئەگەر ئینسان هاواری کردە هەر شتێك غەیری خوا، ئەوە کردوویەتی بە شەریکی خوا..

رەنگە لێرەدا ئەو پرسیارە بکرێ : فەرقی ئەوە چیە کە ئینسان لەکەسێ داوا بکا لە چاڵێ دەری بێنێ، لەگەڵ ئەوەدا هاوار بکا لەیەکێ لەبەندە صالحەکانی خوا، یا لە روحی یەکێ لە پیاو صالحان کە بێت بە فریایەوەو کارێکی بۆ بکا، خۆ ئەمیش هەر سەبەبێکە؟!

رەنگە ئاوا گومانێك ببرێ و بوترێ : وەختێك من ئەڵێم : یا روحی فلان کەس لەبەندە صالحەکانی خوا! هەروەك ئەوەیە بلێم بەو شەخسە لەو چاڵە دەرم بێنە. بۆ لەوێ گوناه نەبوو، بۆ لێرەدا گوناهو شەریك بۆ خوا قەراردانە؟!

جوابی ئەمە ئەوەیە : ئێمە بۆمان رۆشن بۆتەوەو خوا بۆی دیاری کردوین کە ئەوە سەبەبەو، خوایە کە کارە حەقیقیەکە دەکات ، بەڵام خوای گەورە روحی ئەو بەندە صالحەی نەکردووە بەسەبەبی ئەوە کە زەرەرو زیانێ لە کۆڵی ئینسان بێتەوە، یا سوودو مەنفەعەتێکی دەست کەوێ. بڕیاری نەداوە ئاوەها شتێ بکرێ. نە لە قورئانا باس کراوە، نە لە هیچ حەدیسێکا لەو حەدیسانەی کە صەحیحن باسی ئەوە نەکراوە هاوارکردنە غەیری خوا جایز بێت ، یا بە سەبەب بەکارهێنان بزانرێ،

بەڵکو زۆرێك ئایەتو فەرموودە هەن باسی ئەوە ئەکەن کە دروست نیە ئینسان هاوار بکاتە غەیری خواو داوای کۆمەکی لێ بکا.

ئەگەر کەسێك داوای کۆمەکی لە غەیری خوا کردو، هاواری بردە لای غەیری خواو غەیری ئەوی کرد بە فریادڕەسی خۆی - ئەگەر چی بەو جۆرە بێ کە بڵێ لای خوا داوای شتێکم بۆ بکە، واتە بیکا بە واسیتەو سەبەب لە بەینی خۆیو خوادا- ئەوە قورئان ئەفەرمویٚ : ئەوە شەریکی بۆخوا قەرارداوە. ئەڵبەتە ئەوە بەو مانایە نیە کەسانێك لە موسڵمانان ئێستا هاوار ئەکەنە غەیری خوا موشریکن. نەخێر، خەڵکی لەبەرئەوەی حەقیان بەتەواوی بۆ رۆشن نەبۆتەوە مەعزورن. موسوڵمانان عوزریان هەیە، لەبەرئەوەی ئەم حەقە بە جوانی ڕوون نەکراوەتەوە بۆیان. بەم موسوڵمانانە ناوترێ موشریك. ناوترێ ئەمانە موسوڵمان نین.

بەڵام لەگەڵ ئەوەدا داوا ئەکەین لەهەر موسوڵمانێ کە دڵی بۆ خۆی ئەسووتێو، ئەیەوێ بەندەی ڕاستەقینەی خوابێ، بە زووترین کات بگەڕێتەوەو دەست بکێشێ لە هاوارکردن لە غەیری خوا. چونکە لەدوای ئەوە کە رۆشن بووەوە بۆی دروست نیە هاوار بکاتە غەیری خوا، ئیتر بە شوێن ئەوەدا گوناهبار ئەبێ، خوا لێی قبوڵ ناکا. ئەگەر لەوەوپێش ـ پێش ئەوەی بۆی ڕوون بووبێتەوە ـ هاواری

کردبێتە غەیری خوا، خوا لێی توورە نەبووبێ‌و غەزەبی لێ نەگرتبێ، دوای ئەوە کە بۆی مەعلوم بوو نیزا لێی قبوڵ ناکا.

## پلەی پیاوچاکان وحەقیقەتی رێزلێگرتنیان

ئەمەش مانای ئەوە نیە بڵێین بەندە صالحەکانی خوا لە مەلائیکەو پێغەمبەران و دۆستانی خوا (علیهم صلوات الله وبرکاته) کەم قەدەر وقیمەتن و سوکایەتی‌یان پێبکرێ، پەنا بەخوا.. کەسێك کە ئیمانی بەخواو رۆژی ئاخیرەت بێ، نە تەنها ناتوانێ کەمترین ئیهانەتێك بەیەکێك لەو بەندە صالحانەی خوا بکا ، نەتەنها ناتوانێ بەچاوی سووك تەماشای یەکێك لەوان بکا، بەڵکو تەنها لەکاتێکا ئیمانی هەیە و تەواوە،کە پێغەمبەرانی لەخۆی خۆشتر بوێ و، لە هەموو بەرنامەکانی ژیانیدا، پەیرەوی ئەوان بێ‌و بەشوێن ئەواندا بڕوا، گیان‌و ماڵی لەرێی سەرخستنی بەرنامەیەکدا کە ئەوان هێناویانە بەخت بکا.

ئەوەیە بەراستی رێزلێنان، ئینسان وا بیانناسێ کە خوا باسی کردوون، کە بەندەی خوابوون، فریادرەس نەبوون، بۆ ئەوە نەهاتوون خەڵك هاواریان لێ بکا، بۆ ئەوە هاتوون بۆ خەڵکی رۆشن کەنەوە هەر خوا فریادرەسە. رێزلێنانی ئەوان ئەوەیە ئینسان پەیرەویان لێ بکا. بزانێ ئەگەر شوێن ئەوان نەکەوێ خوا رەحمی پێناکا. ئەوەیە ئیحتیرام،

نە ئەوەی بە ناهەق بیان کات بە فریادڕەس ، یا شتێك بکا کـە خۆیـان بۆ لەبەین بردنی ئەو شتە هاتوون.

## دەربارەی (وەسیلە) لە نێوان عەبدەکان و خوای گەورەدا

زۆرکەس ئەڵێن ئێمە کاتێك هاوار ئەکەینە یەکێك لەو پیاوچـاکانە، خۆ وا نازانین خۆی لەخۆیەوە ئەتوانێ شتێك بکـا، ئـەزانین هەرخوایـە ئەتوانێ هەرشتێ بکا، بەڵام ئێمە لەبەرئەوەی خۆمـان زۆر بـاش نـین ـ وەك هەنـدێ ئـەڵێن لەبەرئـەوەی گوناهبـارو ڕوورەشـین نـاتوانین ڕاستەوخۆ لەگەڵ خوادا تەماس بگرین ولەگەڵ خۆی ڕازو نیاز بکەین ـ ناچارین یەکێك لەوان بکەین بە واسـیتەی خۆمـان، بـەهۆی ئـەوەوە نزیك بکەوینەوە لە خواو شتێکی لێ داوا بکەین. هەروەك چۆن ئەگـەر کەسێك بیەوێ بڕوا بـۆلای حاکمێـك بـۆی ڕێـك ناکـەوێ، مەگـەر پارتیو واسیتەیەك دەست بخا تا بە هۆی ئەوەوە بتوانێ بڕوا.

جوابی ئەمە ئەوەیە : ئەم قسـەیە قسـەی کەسێکە خوای نەناسـی بـێ، خوایەك کە ئەفەرموێ :

﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ﴾ واتە : من لە ڕەگی بنا مل لـە ئینسان نزیکترم. خوایەك ئەفەرموێ : هیچ شتێکی ئینسان نیـە لـە مـن پەنهانو پۆشراو بێ. خوایەك ئەفەرموێ : لەهەر خاتیرەو خەیاڵێك بـێ

بە دەرروونی ئینساندا من خەبەردارم. خوایەك ئەهلی ناحەقكاریو كاری نابەجیٚ نیە ـ نعوذ باللە ـ چ نیازی هەیە بەوەی ئینسان كەسیٚ بكا بە واسیتە لەبەینی خۆیو ئەودا؟! خۆی لە هەموو كەس نزیكە. ئاگادارە لە ئەحوالی هەموو كەس، هەركەس بەڕاستی و بە ئیخلاص رووی تیٚبكاو هاواری لیٚ بكاو پەنای پیٚ بیا، حەتمەن دیٚت بە هاواریەوەو ئەوەی وا ئەیەویٚت بۆی ئەكا، ئەگەر بەخیٚرومەسڵەحەتی بیٚ، ئەگەر بە خیٚرو مەسڵەحەتیش نەبوو شتیٚكی تری بۆ ئەكا لەوە باشتر.

بە نیسبەت حاكمەكەوە لەبەرئەوەیە خەڵكی پارتیو واسیتە دروست ئەكەن، كە جاهیلەو نازانیٚ خەڵك لە چ وەزعیٚكا ئەژینو چیان لیٚ قەوماوە، نازانیٚ چییان ئەویٚو گرفتاری چین، لەبەرئەوە ئەبیٚ واسیتەیەك دروست بكریٚو واسیتەیەك بیٚت یان گەیەنیٚتە لای ئەو حاكمە. بەڵام خوای موتەعال وا نیە! یا ئەو حاكمە ئەزانیٚ وەزعی ئەو خەڵكە چۆنە، بەڵام لەبەرئەوەی كە عەبدی هەواو هەوەسە، نایەویٚت گیروگرفتو كۆسپی سەر ریٚی خەڵكی لابەریٚ. تەنها لەكاتیٚكا ئەوە ئەكا كە واسیتەیەك بروا، لە ئاشناو نزیكەكانی خۆی و هەڵی ئەنیٚ بۆئەوەی ئەو كارە بكا. دەی خۆ خوا بەو جۆرە نیە.

ئەگەر ئینسانیٚك لە نویٚژكردن حالی بوویٚ، بەڕاستی ئیتر ناتوانیٚ شتیٚكی ئاوا بڵیٚ، بڵیٚ: من خۆم ناتوانم راستەوخۆ لەگەڵ خوا تەماس

بگرم، ئەبێ کەسێك یا واسیتەیەك دەست خەم تا ئەو نزیکم خاتەوە لـە خوا، چونکە نوێژکردن بـۆ ئەوەیـە ئینسـان لەگـەڵ خـوا راسـتەوخۆ تەماس بگرێو رازو نیازی لەگەڵ بکاو داوای شـتی لێ بکـا، غـەیری ئەوە شتێکی تر نیە. ئیتر چی ماوەتەوە؟! ئیتر چۆن کەسێك نـەتوانێ – ئەگەر لە نوێژ تۆزێك حاڵی بوو بێ– بڵێ : مـن نـاتوانم خـۆم لەگـەڵ خوا تەماس بگرم؟! مەگەر واسیتەو وەسیلەیەك لە خوا نزیکم کاتەوە.

لە سەرێکی ترەوە قورئان بەیانی کـردووە کـە وەسـیلە بـۆ نزیـك کەوتنەوە لە خـوا تـەنها (ئیمـانو عەمـەلی صـالحە)، بـاوەڕ کردنـەو کردەوەی چاك ئەنجام دانە. وەك لە ئاخرین ئایـەتی سـورەی (علـق)دا ئەفـەرموێ : ﴿وَاسْــجُدْ وَاقْتَــرِبْ﴾، کوڕنـووش ببـە بـۆ خـوا و ملکەچکردنو خۆکزکردنو خۆ نـزم گـرتن بکـە بۆخـوا و، ببـە بـە بەندەی راستەقینەی.. لەو رێیـەوە لـە خـوا نزیـك ببـەرەوەو بگـە بـە خزمەتی. هەروەها لە زۆرئایەتی تری قورئانا ئەمە بەیان کـراوە ئەگـەر کەسێك کەسێکی تر بکات بە واسیتە بۆ نزیك کەوتنەوە لە خوا، ئەوا کردوویەتی بە شەریك. بۆ نمونـە ئەفـەرموێ : کەسـانێك کـە غـەیری خوایان کردووە بە دۆستی خۆیان، کردوویـانن بـە فریـادڕەس و پـەنا وپشتیوانی خۆیان، کاتێك کە رەخنـەیان لێ ئـەگیرێو ئـەوترێ بـۆ وا ئەکـەن؟ جوابیـان ئەوەیـە کـە : ئێمـە ئەمانـەمان بۆیـە کـردووە بـە فەریادڕەسو پشـتیوانی خۆمان بۆ ئەوەی لە خوامان نزیکمان کەنەوەو،

هەر تەنها بۆ ئەوەیەو بۆ غـەیری ئـەوە نیـە. خـوا ئەفـەرموێ : ئەوانـە درۆزنن. ئەوانە دوای ئەوەی حـەقیان بـۆ رۆشـن ئەکرێتـەوەو دەلیـل ونیشانەکانیان بۆ بەیان ئەکرێ، کە غەیری خوا کەس فریـادڕەس نیـە، زۆر زۆر کافرن. خوای گەورە لە دواییدا حوکمو قەزاوەت ئەکا لـە بەینی ئەوانو بەندە موخلیسـەکانیدا، رۆشـنی ئەکاتـەوە کـێ راسـتی وتـووەو کـێ درۆی وتـووە، هەرکەسـیش ئەگەیـەنێ بـە جـەزاو بـە سـەرەنجامی خۆی.. ئەفەرموێ:

﴿أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ﴾ .

لە جێگای تردا ئەفەرموێ : ئەوانەی وا ملکەچ ئەکەن بۆ غـەیری خواو، پـەنا ئەبەنـە لای غـەیری خـوا، غـەیری زاتـی ئـەو ئەکـەن بـە فریادڕەسی خۆیانو بەندەو مەخلوقـەکانی خـوا ئەکـەن بـە پشـتیوانو پەناگای خۆیان، کاتێك کە رەخنەیان لێ ئەگیرێ، بۆچی ئـاوا ئەکـەن؟ ئەڵێن : خۆ ئێمە نەمانوتووە ئەمانە خۆیان سەربەخۆ شتێ ئەکەن، بەڵکو ئەمانەمان بە شەفیعو تکاکارو واسیتە لە بەینی خۆمـانو خـوادا قـەرار داوە. قورئان سـەبارەت بەوە ئەفەرموێ : ئائەوە شەریك قەراردانـە بـۆ خوا. خوای گەورە لەوە بەرییەو دوورە، خوا پاکو مونەززەهە، کەس

شەریکی نیە، شتی وای قەرار نەداوە، نە لە ئاسمانەکاندا نە لە زەویـدا، یەك نەفەری قەرارنەداوەکە ببیّ بە واسیتەو وەسیلە، خوا ئەفەرمویّ :

﴿وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لاَ يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَيَقُولُونَ هَـؤُلاء شُفَعَاؤُنَا عِندَ اللَّهِ قُلْ أَتُنَبِّئُونَ اللَّهَ بِمَا لاَ يَعْلَمُ فِي السَّمَاوَاتِ وَلاَ فِي الأَرْضِ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَى عَمَّا يُشْرِكُونَ﴾.

## دەربارەی غەیب زانین

جگە ئەوەش کەسێك کە هاوار ئەکا لەیەکێ لە بەندە صالحەکانی خوا، لە پێغەمبەران ، یا لە مەلائیکە، یا لە دۆستانی خوا، لـە راسـتیدا تەنها لە کاتێکدا هاواری لیّ ئـەکا کـە وا ئـەزانیّ ئـەو کەسـە غـەیب ئەزانیّ، وا ئەزانیّ ئەو خەبەری هەیە کە ئەم چ حاڵەتێکی هەیەو ئەتوانیّ بچیّ بە هاواریـەوە، ئەمـەش شـتێکی نادروسـتەو گومڕاییـە، خـوا لـە زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئاندا بەیانی کردووە کە غـەیری خـوا کـەس غەیب نازانیّ، تەنها یەك شت لـە غـەیب هەیـە کـە خـەڵك ئـەیزانن، ئـەویش ئـەو بەرنامـەی ڕێنمـایی وهیدایەتەیـە کـە لـە کتێبەکانیـدا ناردوویەتی، لە قورئـانو تـەوراتو ئینجیـلو غـەیری ئەوانـەدا، وەك ئەفەرمویّ:

﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ وَمَا يَشْعُرُونَ أَيَّانَ يُبْعَثُونَ﴾ : بلّێ : هەرچـی ئـەو کەسـانەی وان لـە ئاسمانـەکانو

زەویدا، بێجگە خوا، هیچ کەسیان غەیب نازانن . تەنانەت نازانن کەی خۆیان زیندوو ئەکرێنەوەو لە قەبرەکانیان رائەپەڕێنرێن . هەروەها ئەفەرموێ :

﴿قُل لَّا يَعْلَمُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ الْغَيْبَ إِلَّا اللَّهُ﴾ : لە جێی تری قورئانیشا ئەم باسە بە درێژی کراوە .

لەلایەکیترەوە خوای گەورە بە پێغەمبەری خوا ئەفەرموێ : تۆ بۆیان باس بکە کە چیت؟ پێیان بڵێ کە غەیب نازانی، ئەگەر غەیبت بزانیایە زۆر شتی باشت بۆ خۆت دەست ئەخست، بەڵام لەبەرئەوەی تۆش هەروەك بەشەرێکی تری، زۆرێ شتی باشت لەدەست دەرئەچێ . تۆیش تووشی گیروگرفتو دەردیسەری ئەبی، ئەوە ئیشارەی ئەوەیە تۆش غەیب نازانی، تەنها شتێ ئەیزانی ئەو بەرنامەی هیدایەتەیە کە خوا داویەتی . ئەفەرموێ بە پێغەمبەر: تۆ بڵێ :

﴿وَلَوْ كُنتُ أَعْلَمُ الْغَيْبَ لاَسْتَكْثَرْتُ مِنَ الْخَيْرِ وَمَا مَسَّنِيَ السُّوءُ إِنْ أَنَاْ إِلاَّ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ :

بۆیان باس بکە کە تۆ تەنها ئەرکی ئاگادارکردنەوەت لەسەرە، لەگەڵ ئەرکی مژدە پێدان . ئاگادارکردنەوە بۆ ئەوانەی رێی بەندەیی شەیتان ئەگرنو نایەنەوە سەر رێگای بەندەیی خوا، مژدەدان بەوانەش رێگای بەندەیی خوا ئەگرنو بە ئیخلاصەوە عیبادەتو بەندەیی بۆ خوا

ئەکەن . تۆ تەنها ئەوەی، غەیب نازانی، غەیب تەنها خوای (متعال) خۆی ئەیزانیو کەسی‌تر نایزانێ .

جا لە کاتێکدا هیچ کام لەبەندە صالحەکانی خوا غەیب نازانن‌و، خەبەریان لە حالی کەسی‌تر نیە، ئیتر چۆن دروستە هاوار بکرێ لێیان‌و، بکرێن بە فریادڕەس‌و پەناگا؟!

دوای ئەوە قورئان ئاوا باسی کردووە کە کەس غەیب نازانێ، ئیتر دەرئەکەوێ هەرکەس ئیددیعای ئەوە بکا خۆی شتی ئەزانێ، یا کەسێکی تر شتێ تری زانیوە، ئەمە بە هەڵەدا چووە، یا ئەگەر عەمدەن بێلێ ئەوە درۆی کردووە، ئەو شتەی وا بەغەیب ناوی ئەبەن خەیاڵ‌و گومان زیاتر هیچێکی‌تر نیە .. کەسێك خەیالی دێت بە دڵیدا، دوایی وا ڕێك دەکەوێ ئەوشتە روو ئەدا، وا ئەزانن ئەمە غەیبی زانیوە ، لە حاڵێکا هەر خەیاڵێکە کەوتووەتە دڵی‌و گومانێکە وا ڕێك کەوتووە .

وەك چۆن کەسێ خەوێ ئەبینێ، دوایی خەوەکەی دێتە دی، دەی خۆ ئەو لە کاتێکا خەوەکەی دیوە، لێی ڕۆشن ئەبووە ئەو شتە روو ئەدا، دوایی کە شتەکە رووی دا، ڕۆشن ئەبێتەوە خەوەکە مەعنای ئەوە بووە .

هەروەها ئەگەر هات‌و کەسێ شتێ لە دەمی دەرچوو، وتی ئەو شتە وائەبێ، دوایی شتەکە وابوو، وا رووی دا، ئەوە وە ئەبێ ئەو شەخسە ئەو شتەی زانی بێت‌و لێی ڕۆشن بوو بێ، بەڵکو هەروا خەیاڵێ

کەوتۆتە دڵی‌و وتویەتی، دوایش بە هەڵکەوت ئەو شتە وا رووی داوە، خەڵکیش وا ئەزانن ئەوە غەیبی زانیوە .

لەبەر ئەوەشە خوا ئەفەرموێ : ئەوانەی غەیری خوا دەکەن بە فریادرەسی خۆیان، هیچ دەلیل و بورهانێکیان نیە، چونکە فریادرەس ئەبێ خالق بێ، دروستکاری شت بێ . ئەبێ خاوەن‌و دەسەڵاتدار بێ،،سوودو زیانی لەدەستا بێ، دەسەڵاتی بەسەر ئینساندا هەبێ، سەرەنجامی ئینسان لەدەستیا بێ .. دیارە هیچ کەس غەیری خوا ئاوا نیە . کەسێ خالق نیە، خالقی هیچ شتێك نە لە ئاسمانو نە لە زەوی، هیچ کەس دەلیلی نیە بۆ ئەوەی کەسێکی‌تر غەیری خوا شایستەی ئەوەی هەیە هاواری لێ بکرێ . جا ئەفەرموێ : کەس لەوە گومڕاتر نی‌یە کە هاوار ئەکاتە کەسانێك لە خواری خواوە، کە تا رۆژی قیامەت جوابی نادەنەوە، نە تەنها جوابی نادەنەوە و نایەن بە هاواری‌یەوە، بەڵکو لە هاوار کردنەکەشی غافڵن، هەرخەبەریان نی‌یە کە هاواریان لێ ئەکا . ئەوەتا ئەفەرموێ :

﴿وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُو مِن دُونِ اللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُ إِلَى يَومِ الْقِيَامَةِ وَهُمْ عَن دُعَائِهِمْ غَافِلُونَ. وَإِذَا حُشِرَ النَّاسُ كَانُوا لَهُمْ أَعْدَاء وَكَانُوا بِعِبَادَتِهِمْ كَافِرِينَ﴾ :

لە رۆژی قیامەتا ئەوانەی وا هاواریان لێکراوە، ئەوانەی بەناحەق کراون بە فریادرەس، ئەوانەیان کە صاڵح بوونو بەندەی خوا بوون،

ئـەبن بـە دوژمنـی هاواربـەرەکان و، بێزاریـی خویـان دەرئـەبڕن لـەو کارانەی ئـەوان کردویـانەو، ئـەڵێن: ئەصـڵەن ئێمـە رازی نـەبووین، ناماقوڵێتان کردووە کە هاوارتان کردۆتـە ئێمـە. ئێمـە حـەزمان لـەوە نەکردووە. دەعوەتی ئێوەمان نەکردووە بۆ ئەوەو رازی نـەبوین بـەوە. ئێستاش هیچ کارێکمان لەگەڵ ئێوە نیە، هیچ عەلاقەیەکمان بە ئێـوەوە نیـەو ناگەینـە فریاتـانو نـاتوانین ئەصـڵەن ئێـوە لـە خۆمـان بـزانین، لەبەرئەوەی ئێوە خیلافی ئەوەتان کـردووە کـە ئێمـە دەعوەتمـان بـۆی کردووە!! ئێمە هاتووین بە خەڵك بگەیـەنین کـە هاوارکردنـە غـەیری خوا دروست نیەو شەریك بۆ خـوا قەراردانـە. کەچـی ئێـوە خیلافـی ئـەوەی وا ئێمـە بـۆی هـاتووین کارتـان کـردووە . کـەوابوو هـیچ پەیوەندیو رابیتەیەك لەبەینی ئێمەو ئێوەدا نیە .

جا رەنگە هەندێ خەڵك وا بزانن ئەوەی وا قورئان لێـرەدا بـەیانی نەکا و لەم ئایەتەدا ئەفەرموێ: نابێ هاوار بکرێتە غەیری خوا، ئەوانەی کە هاواریان لە غەیری خوا کردووە تووشی شەریك قەراردان بۆ خوا بوون، وابزانن مەبەست لەو ئایەتانە، (بتەکان) بووە کـە موشـریکەکان لەو سەردەمەدا هاواریان لێ کردوون .. بەڵام ئەگەر ئینسان بـە تـۆزێ ئاگاییو ئینسـافەوە سەیری قورئـان بکـا، هـیچ دوودڵـیو گومـانێکی نامێنێ کە مەبەست تەنها ئەو بتانە نیـە، زۆر زۆر رۆشـن لـە قورئانـدا بەیان کراوە ئەوانەی وا هاواریان لێ کراوە بت نەبوون، تەنانـەت ئـەو

بتانەیش (یادبوود)و یادگاری و نەزەرگەو موجەسسەمەو شت بوون بۆ ئەو بەندە صالحە پێشووانەی کە ئەوان هاواریان لێ کردوون. بۆ نمونە : ئەو بتانەی موشریکەکانی قورەیش دروستیان کردبوون بەناوی (لات و، مەنات و، عوززا)و غەیری ئەوانە، ئەو بتانەیان بۆ ئەوە بۆ خۆیان قەرار دابوو کە ئەیان وت : مەلائیکە رۆڵەی خوان . بە مەعنای ئەوە کە لای خوا نازیان ئەڕواو ئەتوانن تکایەك بۆ ئێمە بکەن . جا ئێمە دەستمان بە خۆیان ناگات، با موجەسسەمەو یادگاریو نەزەرگەو شتیان بۆ دابنێین، ئێمە ئەوانە ماچ ئەکەین، بەدەوریانا ئەگەڕێین، نەزرو شتی وا ئەبەینە سەریان، مەلائیکەکانیش دڵیان خۆش ئەبێو، خۆشەویستی ئێمە ئەکەوێتە دڵیانەوەو لای خوا بۆمان ئەپاڕێنەوە!! شەریك بۆ خوا قەراردانیان بەو جۆرە بوو، نە ئەوەی کەوا بزانن ئەو بتانە خۆیان شتێ ئەکەن . کاتێ ناوی ئەو بتەیان نابوو (عوززا) مەبەستیان ئەوە بوو کە (معاذ الله) خواکچێکی هەیە، کە یەکێك لە مەلائیکەکانەو ناوی عوززایە، وەك خۆی ناوی (أعز)ە! عەقیدەیان وابوو کە خۆی ئیسمی (أعز)ی هەیە (ئەمە دروستیشەو مەعناکەی وایە)، بەڵام ئەیان وت : کچێکیشی هەیە ناوی عوززایە . وەك چۆن ئەوترێ بە پیاو (أكبر)و بە ژن (كبرى)، یا (أصغر)و (صغرى)، ناوا خوایش (أعز)ەو یەکێك لەو فریشتانەش کچیەتی و ناوی(عوززا)یە .

بەڵام لە رۆژی قیامەتا ئەو بەندە صالحانە (ئەو فریشتانە) بێزاری خۆیان دەردەبڕنو، خۆیان بێبەری ئەکەن لەو گوناهە گەورەیەی ئەوان تووشی بوون .

ئەفەرموێ :

﴿ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ وَمَايَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللهِ فَيَقُولُ: أأنتُمْ أضلَلْتُم عِبادي هؤلاءِ أمْ هُمْ ضَلُّوا السَّبيلَ؟ قالوا سُبْحانَكَ ماكانَ يَنْبَغي لَنا أنْ نَتَّخِذَ مِنْ دونِكَ مِنْ أولياءَ ﴾.

لێرەدا دیارە کە ئەو قسانە قسەی (بت)نین، بگرە قسەی ئەوانەش نین کە ناصالحن، بەڵام خەڵك بە پیاوچاكو صالحیان زانیون، بەڵکو ئەوە قسەی مەلائیکەیە، قسەی پێغەمبەرانی خوایە، قسەی ئەولیایە (علیهم الصلاة والبركات).

با لێرەدا یەکێك لە فەرموودەکانی ئیمام عەبدولقادری گەیلانی (رحمه الله) ـ کە زۆر ستەمی لێکراوە و نەناسراوە ـ بگێڕینەوە، کە چۆن لەبارەی یەکتاپەرستی‌یەوە قسە ئەکات :

لە وتارێکیدا کە لە حزووری زۆرێك لە خەڵکا لە بەغدا داویەتی، ئەفەرموێ: (ئێوە پشتو پەناتان بە دینارو درهەمتانو بەدەسەڵاتداران بەستووە، ئێوە ماڵو سەروەتتان کردووە بە پشتیوانی خۆتان، مەقامو شوهرەتتان کردووە بە یاریدەدەری خۆتان، ئەوونەوتان کردووە بە پشتگیری خۆتان). جا دوایی ئەفەرموێ : (كُلُّ مَنْ إعْتَمَدْتَ فَهُوَ

(إلآهُكَ)، هەركەس غەیری خوا پشتی پێ ببەستی و تەوەككولی لەسەر بكەی، بە پشتیوانی خۆتی بزانی، ئەوە كردووتە بە ئیلاهی خۆت . ئەوە كردووتە بە فەرمانڕەواو فریادڕەس و بەخاوەنی خۆت . ئەوە تووشی شەریك قەرار دان بۆ خوا بوویت . جا ڕوویان تێئەكاو ئەفەرموێ: (یا مشركین بما بسلاأبا)، ئەی ئەوانەی وا سەبەبەكانتان كردووە بە شەریكی خوا! ئاخر بەندەی خوا سەبەبە بۆ كردەوەی خوا. خوا ئەیەوێ شتێ بكا بەندەیەكی كردوتە سەبەبی ئەوە . دەی ئێوە هەستاون ئەو سەبەبانەتان كردوون بە شەریكی خواو بە هاوتای ئەو ..).

ئەو پێشەوایە هەمیشە خەریكی ئەوانە بوو، باسی ئەكرد بۆ خەڵك كە هەر خوا فەرمانڕەواو فریادڕەسە . هەروەها زۆرێكیتر لە پیاو ساڵحەكان كە ئێستا بە جۆرێكیتر ناسراون، وەك ئیمامی ڕەببانی (رحمه الله) كە ئەویش بانگخوازێك بوو بۆ لای ڕێگەی خوا، (داعیە)یەك بوو بۆ یەكتاپەرستی . بەڵام لە دوایدا بە جۆرێكیتر ناوی براوەو خەڵك وا ئەزانن شتێكیتر بووە .

لێرەدا ئەیڵێینەوە كە ئەوە مەعنای ئەوە نیە ئەم خەڵكەی وا ئێستا هاوار ئەكەنە غەیری خوا، ئەوە بە موشریك ناو ئەبرێن؟! نەخێر! ئێمە بە موسوڵمانان ناڵێین موشریك، بەڵام لەگەڵ ئەوەدا دەڵێین كردەوەكە خۆی شیركە، بەڵام موسوڵمانان مەعزوورن، داوایان لێ ئەكەین ئەگەر

ئەیانەوێ خۆشبەختیی دونیاو ئاخیرەتیان دەس کەوێ، بێ‌ئەوەی هەل وفرسەت لەدەست بدەن، بگەڕێنەوە و دەست بکێشن لەو کارە، رووبکەنە بەرنامەی خوا، رووبکەنە قورئانو سوننەتی پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والبركات).

شتێکی‌تریش لێرەدا باشە کە بوترێ ئەویش ئەوەیە : جارجار هەندێ لە موسوڵمانان لە کاتێکدا کە دوعا ئەکەنو هاوار ئەکەن، ئەڵێن : خوایە! لەبەرخاتری فلان شەخس، لەبەرخاتری فلان کەس لە پێغەمبەران یا لە ئەولیاو دۆستانت، ئەو شتەمان بۆ بکە . ئەمە شتێکە کە زانایان تیایدا ئیختیلافیان بووە، هەمویان ئەیان وتووە کە گوناهە؟! هەندێ وتوویانە گرفت نیە .. ئەمە شەریك قەراردان بۆ خوا نیە، وەك ئەوەی پێشوو نیە، وەك هاوارکردنە غەیری خوا نیە، بەلام لەگەڵ ئەوەدا شتێکە دوورە لە ئەدەبی دینی، ئەگەر ئینسانێ بیەوێ بە ئەدەبەوە دوعاو هاواری باتە لای خوا، حەق نیە ئاوا شتێ بڵێ . چونکە نە لە قورئاندا شتی ئاوا هەیە، نە لە حەدیسە صەحیحەکانا هەیە، نە لە بەرنامەی پیاوساڵحەکاندا شتی ئاوا بووە.. لە قورئاندا بەیان کراوە کە ئینسان لە دوعا کردنیا هەر (یارب ، یارب!)و شتانی تری لەو بابەتانە بڵێ، ناوەکانی خوا بڵێ: (یارحیم ، یارحمن ، یا رزاق ، یاغفور ، یاودود ) یا شتانی تری لەم جوزە . حەق نیە غەیری ئەوە شتێکی تر بڵێ .. ئینسان ئەبێ ئەوە بزانێ ئەو کەسەی وا پیاوی

صالحه، تەنها لە کاتێکا کەسێکی تر لە صەلاحەت و پیاو چاکییەکەی ئەو ئیستیفادە ئەکا کە شوێنی بکەوێت .. ئەگەر پێغەمبەری خوا بە باشترین بەندەی خوا ئەناسیو ئەزانێ کە ئەو نزیکترین بەندەی خوا بووە، ئەبێ بزانێ کە باشتربوونیو نزیک بوونی بۆ خۆیەتی، تەنها لەکاتێکا بۆ ئەم مەنفەعەتی هەیە کە ئەمیش شوێنی کەوێ، ئیمانی پێ بێنێ، پەیڕەوی بێت . لەو کاتەدا سوودی دەس ئەکەوێ، ئەگەر نا خۆی باش نەبێ، هەزار ساڵ عومر بکاو هاوار بکاتە لای خوا کە لەبەرخاتری پێغەمبەر ڕەحمی پێبکا، ڕەحمی پێناکا . خوا بڕیاری ئاوای نەداوە .. بەڵام ئەگەر خۆی ئینسانی باش بوو، ڕێگای ئیمانو عەمەلی صالحی گرت، ئەوە هەم خوا ڕەحمی پێئەکا، هەم ئیجازە ئەدا بە پێغەمبەرو بە تێکڕای پێغەمبەرانو بەندە صالحەکانی، کە دوعای خێری بۆ بکەن ..

ئالەو کاتەدا خێروبەرەکەتو خۆشبەختی دەس ئەکەوێ . هەروەها ئەگەر ئینسان بەندەی صالحو پیاوی چاك بوو، لە دونیادا موسڵمانانی تر و بەندە صالحەکانی تر دوعای خێری بۆ ئەکەن . چونکە شتێکی باشە کە موسوڵمان بۆ موسوڵمان دوعای خێر بکا.. هەروەها لە قیامەتیشا خوا مۆڵەت ئەدا کە بەندە صالحەکان بۆ یەکتر دوعای خێر بکەن . تکا بۆ یەکتر بکەن . دوای ئەوە ڕوونی ئەکاتەوە هەرکەس

موستەحەقی چیە؟ هەرکەس جەزاو پاداشتی چۆنە؟ بەو جۆرە ئەوەی وا پێی ئەوترێ شەفاعەت لە قیامەتا، ڕووئەدا..

## پوختەیەك دەربارەی شەفاعەت

لە پێشا ئەوە بڵێین کە شەفاعەت بە مەعنای ئەوەیە کەسێك یا شتێك ببێ بە پشتیوانو لایەنگری کەسێکیتر. ئینسانێ خۆی تەنها شتێکی پێ ناکرێو لاوازو بێدەسەڵاتە، کەسێکیتر خۆی ئەداتە پاڵیو بەهێزی ئەکا وکۆمەکی ئەکاو ئەبێتە پشتیوانی، لەوحاڵەتە دا ئەوترێ : ئەو کەسەی تر بووە بە شەفیعی ئەم . ئەوە پێی ئەڵێن شەفاعەت ..

ئەگەر کەسێ لەگەڵ کەسێکیتردا دوژمنایەتی بوو و خۆی بەتەنها چاری نەئەکرد و نەیئەتوانی خۆی لەدەست ئەزیەت وئازاری رزگار بکا، کەسێکیتر هاتو خۆی دا یە پاڵیو کۆمەکی کرد، جا بەهۆی کۆمەککردنی ئەوەوە چاری دوژمنەکەی کرد و، توانی خۆی لەدەستی رزگاربکا .. ئەوە ئەوترێ : ئەوپشتیوانە، ئەوشەختە سێیەمە، بووە بە شەفیعو شەفاعەتی ئەوی کردووەو تەنیدی کردووە.. جا ئەم شەفاعەتە هەم لە دونیادا هەیە، هەم لە قیامەتا، بەم جۆرەی کە ئێستا باسی ئەکەین :

ئەگەر ئینسانێك خۆراك نەخوا، دوای بەینێ ئەفەوتێ . ئەوە بەرنامەو قانونێکە خوا دایناوە.. دەی ئینسانێ بڕیار بدا خۆراك نەخوا،

بەهێنێکی بێ چوو مردن بەپێی فەرمانی خوا هێرشی بۆ ئەهێنێ‌و لەبەینی ئەبا و، ڕووبەڕوو ئەبێ لەگەڵ ئەم بەڵاو موصیبەتە کە مردنە، جا بۆ ئەوەی ڕزگاری بێ، پەناو پشتیوانێکی ئەوێ،کەسێکی ئەوێ کە تەئیدی بکاو ڕزگاری بکا لەدەست مەرگ .. ئەمە چیە؟ ئەمە قانونێکی ترە کە خوا دایناوە، ئەویش ئەوەیە کە بڕوا خۆراك بخواو تەوەککول بکا لەسەر خواو داوای لێ بکا کە خوا تەئسیر لە خۆراکەکەدا دابنێ ..

ئەگەر چوو پەنای بردە بەرئەو قانونەی (خواردن)و، داوای تەئسیرکردن ، ئەوە ئەم قانونە خۆی ئەداتە پاڵێ‌و شەفاعەتی ئەکا و ناهێڵێ قانونی مردنەکە لە بەینی بیا ..

یا ئەگەر کەسێ توشی گوناه بوو، بەڕێی ناموسوڵمانی‌وئەنجامی کردەوەی ناپەسەندا چوو، ئەوە ئەکەوێتە بەر غەزەبی خواو خوالێی تورە ئەبێ و، موستەحەقی ئەوە ئەبێ کە خوا ئەشکەنجەی بدا، دەی بۆ ئەوەی لەوە ڕزگاری بێ، ڕێچارەی ئەوەیە پەنا بباتە بەر قانونێکی‌تری خوا، ئەویش ئەوەیە (تەوبە) بکا، بگەڕێتەوە، کردەوەی چاك‌و بیروبڕوای موسوڵمانانەی بێ .. لەکاتێکا ئەگەڕێتەوەو ئەکەوێتە سەر ڕێی ئیمان‌وعەمەلی صالح، قانونێکی تری خوا پشتیوانی ئەکاو لە عەزابی خوا ڕزگاری ئەکا، ئەویش قانونی ئەوەیە کە هەرکەس تەوبەی

کردو گەڕایەوە، ئەوە لە گوناهەکانی ئەبوریت، رەحمی پێ ئەکا، بەزەیی دێتەوە پایدا..

کەوابوونەم قانونە ئەبێ بە شەفیعی، واتە شەفاعەتی بۆ ئەکا کە لەدەست قانونەکەی تر رزگاری بێ . قانونێکیان ئەیەوێ عەزابی بدا، بەلاّم کە گەڕایەوەو تەوبەی کردو ئیمان و عەمەل صالحی کرد بەکارو پیشەی خۆی، قانونەکەی تر کە لێبوردنو رەحمەتو بەزەیی یە، ئەبێ بە پشتیوانیو رزگاری ئەکا.. هەروەها لەهەر شتێکا، لەهەر کارو رووداوێکا، لەهەر وەزعیەتێکا دوو قانوون هەن لای خوای (متعال)، یەکێکیان هجوم ئەکاتە سەر ئینسان، وەك قانونی نەخۆشی لەکاتێکا کە تەندروستیو پاکو تەمیزیو ئەوانە ریعایەت نەکرێ، وەك قانونی تووشی سەرمابوونو لەبەین چوون لەسەرمادا لەکاتێکا کە سەبەبی خۆپاراستن لەسەرما بەکارنەهێنیو غەیری ئەوانە . لەهەر شتێکا دوو قانوون هەن یەکێکیان بەرەو ئەوە ئەڕوا ئینسان لەبەین ببا، ئەوی تریان ئەبێتە پشتیوانو پەنای ئینسانو نەجاتی ئەدا.. ئینسان بۆ ئەوەی لە تیاچوون لە دونیاو لە قیامەتا رزگاری بێ، ئەبێ پەنا بباتە بەر ئەو قانونانەی خوا دایناون بۆ نەجاتی ئینسانو، ئەوانە بکا بە شەفیعو پشتیوانی خۆی .

ئاوا رۆشن ئەبێتەوە کە شەفاعەت هی ئەو قانونانەیە کە خوا دایناون، خۆی ئەفەرموێ :

﴿ لله الشَّفَاعَةُ جَمِيعـا ﴾ : شـەفاعەت هـەمووی هـەر هـی خـوا خۆیەتی، خۆی بڕیاری داوە کە شتێك ببێتە پەناو پشتیوانی شتێکیتر.
جا لە کاتێکا ئینسان لەڕێی نافەرمانی گەڕایەوەو تەوبـەی کـردو ڕێـی ئیمانو عەمەلی سالحی گرت، خوا ڕەحمی پێ ئـەکاو لێـی ئـەبورێ . لەو کاتەدا جێی خۆیەتی موسڵمانانی تریش دوعای خێری بۆ بکەن .. عـەرزی خـوا بکـەن : (خوایـە ئـەم شەخسـە لـە ڕێگـای گـومڕایی گەڕاوەتەوەو موستەحەقی ئەوەیە تۆ ڕەحمی پێبکەیتو بەزەییت پێـەوە پایداو لێی ببوریت، جا ئێمەش داوای ئەوە ئەکەین کە لێی ببوریـت)، ئەوە هەم لە دونیادا بەجێیە کە بکرێ، هەم لە قیامەتیشا خوای گـەورە ئیجازە ئەدا کە بەندە صالحەکانی، بۆ یەکتر ئاوا دوعایەك بکەن ..

شەفاعەت بەم مانایە شتێکە قورئان بەیانی کردووە، لە زۆرێـك لـە حەدیسـەکانیشدا هەیە، کەسێك کە شایستەییو لیاقەتی ئەوەی ببێ خوا لێی خۆش ببێو لە گوناهەکانی چاوپۆشی بکـا، ئـەوە خـوا هـەم لـە دونیا، هەم لە قیامەتیشدا، ئیجازە ئەدا بە بەندە سالحەکانی دوعای بۆ بکەن، بە تایبەت ئیجازە ئەدا بە پێغەمبەران، بەتایبـەتی تـر بـە (محمـدی کوڕی عبدالله) خاتم النبيين ـ عليـه وعلـيهم صـلوات الله وبركاتـه ـ دوعای خێری بۆ بکەن، شەفاعەت بکەن بۆ بەنـدە صـالحەکانی، بـەو مانایە کە هەرکـەس موسـتەحەقی چیـە؟ لایـەقو سـزاواری چ جـۆرە جەزاو پاداشـتێکە؟ دوای ئـەوە کـە خـوا خـۆی بڕیـاری ئـەوە ئـەدا،

ئەوانیش دوعا بکەن‌و دڵسۆزیی خۆیان‌و دۆستایەتی خۆیان بۆ ئەو شەخسە دەربڕن .

جا بۆ ئەوەی کە باشتر ڕۆشن بیێتەوە پێویستە بڵێین:

جۆرێکیتر شەفاعەت هەیە کە قورئان فەرمویەتی : نیە، ئەگەر کەسێ بڕوای پێ بوو ئەوە شەریکی بۆ خوا قەرار داوە . لە قورئاندا ئایەتی زۆر باسی ئەوە ئەکەن ئەگەر کەسێ بڕوای بەو جۆرە شەفاعەتە بێ (ئەمەیان کە ئێستە بەیانی ئەکەین) ئەوە شەریکی بۆ خوا قەرارداوەو لە ڕەحمەتی خوا بێبەش ئەبێ .

لە دونیادا باوە کاتێ کەسانێك تووشی نافەرمانی حکومەتەکان ئەبن، لە قانون‌و بەرنامەی حکومەتەکان لائەدەن‌و سەرپێچی ئەکەن. کاتێ کە ئەکێشرێنە دادگا، بۆ ئەوەی تووشی سزا نەبن، بۆ ئەوەی خۆیان ڕزگار کەن، هەوڵ ئەدەن پارتی‌یەك، یا وەکیل موداڤیعێك. (محامی)یەك دەستخەن‌و، بە کۆمەکی ئەو خۆیان ڕزگار بکەن .

کەسێ تاوانبارو موجریمە، بەڵام بۆ ئەوەی ڕزگاری بێ، مەحامی‌یەك پەیدا ئەکات بۆ خۆی کە بڕوا قازی‌یەکە بخەڵەتێنێ‌و بە بێ‌تاوان دەری بکاو ڕزگاری بێ. یا ئەگەر قازی‌یەکە ئەیزانی تاوانبارە، ئەچێ پارتی‌یەك دەست ئەخاو هەوڵ ئەدا بە پوڵ‌و پارە ڕزگاری کا لە سزاو موجازات. یا زۆرجار وا ئەبێ کە کەسێ بێ‌گوناهە، بەڵام قازی‌یەکە نازانێ‌و لەبەرئەوەی کە جاهیلە بە تاوانبارو موجریم دەری

نەکاو حوکمی زیندانی بۆ دەر ئەکا، جا ناچارە ئەو شەخسە بڕوا مەحامی و وەکیل دەست خات بۆ خۆی تا بۆ ئەو قازییە ڕۆشن کاتەوە کە ئەمە موجریم نیە .. یا قازییەکە ئەزانێ ئەم شەخسە موجریم نیە، بەلاّم هەوەس و ئارەزوی وا حوکم ئەکا کە بە موجریم دەری کاو توشی سزاو موجازاتی بێنێ .. ئالەو کاتەدا ئەمیش پارتییەك دەس ئەخا کە بڕوا تکای بۆ بکا، ئەحیلێ قازییەکە ئاوا حوکمێکی بۆ دەرکا.. ئەمە باوی دونیایەو لە دادگا دنیایییەکانداو لە حکومەتە جاهیلیەکانا ئاوا شتانێك هەن ..

جا لەبەر ئەوەی خەڵکی وائەزانن دادگای خواش شتی ئاوای تیادایە، قورئان لە زۆرێك لە ئایەتەکاندا باسی کردووە کە لە دادگای خوادا نە مەحامی و وەکیل مودافیع هەیە، نە پارتی و واسیتە . چونکە هیچ شتێك لە خوای گەورە پۆشراو نیە، وانیە تاوانبار بەبێ تاوان بزانێ، یا بەپێچەوانەوە . یا گوناهکار بەبێ گوناهو بێ گوناه بە گوناهکار بزانێ . هەروەها ئەو تابیع و شوێنکەوتەی هەواو هەوەسیش نیە، ئەگەر زانی کەسێ گوناهکارە بەبێ گوناه دەری کا، یا زانی کەسێ بێ گوناهە بە گوناهکار دەری کا.. هەر کەسیتریش لە مەلائیکە یا پیغەمبەران یا پیاوصالّحەکان ئەگەر شتێ بزانێ ئەوە خوا پێی وتووەو بۆی بەیان کردووەو کەس لەخۆیەوە شتێ نازانێ..

کەوابوو ئەوێ جێگـای ئـەوە نیـە کەسـێ بـڕوا (وەك لـە دونیـادا ئەکرێ) شتێ بۆ خوا ڕۆشن کاتەوە. یا نەهێڵێ شتێ بکا ئەگونجاو بێ، خوا نە هیچێکی لێ شاراوەیە تا کەس بۆی روون بکاتـەوە، نـە نـەهلی هەواو هەوەسیشە تا (پەنا بە خوا) شتێکی نابەجێ بکا..

لەبەرئەوە ئەفەرموێ کە لە دادگای خوادا جێی پارتیـازیو وەکیـل مودافیعیوئەو جۆرە شتانە نیە، هەرکەس بە کـردەوەی خوبـەوە حـازر ئەبێو خۆی بە تەنها ئەچێتە حزووری خوا، ئەوەتا ئەفەرموێ :

﴿ وَكُلُّهُمْ آتِيهِ يَوْمَ القِيامَةِ فَرْدا ﴾ : هەرکام لەوان رۆژی قیامـەت خۆی بە تەنهایی دێتە حزووری خوا، بەو شتەوە خۆی ئـەنجامی‌داوە، بـە ئیمانو عەمەلی صالحی خۆیەوە، یا بە کـوفروکردەوە خراپەکانیـەوە، کەس لەگەڵ‌کەسی‌تردا نایەت، جـا ئەفـەرموێ : هـیچ کـەس لەسـەر غەیری کردەوەی خۆیوغەیری ئەوەی خۆی هەوڵی بـۆداوە، جـەزاو پاداشتێکی دەست ناکەوێ . هەروەها هیچ کەسیش لەبـەر گوناهکاریی کەسێکی‌تر موجازات ناکرێو سزای نادرێ، هەرکەس بـە کـردەوەی خۆیەوە حازر ئەبێ . ئەفەرموێ :

﴿ فَاليَومَ لاتُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً وَلاتُجْزَونَ الاَّ ماكُنْتُمْ تَعْمَلونَ ﴾ : جـا دوای ئەوە کە هەرکەس خۆی بەتەنها چـووە دادگـاو موحاکەمەکـەی کراو دیاری کرا کە سەرەنجامی چـیە؟ بەهەشـتە، یـان دوزەخ؟ ئەگـەر بەهەشتە لەکام پلەدایە، ئەگەر جەهەننەمە لەکام بەشیایەتی؟ دوای ئەوە

ئەوانـە دیـاری کـران، بەنـدە سـاڵحەکانی خـوا زانییـان هەرکـەس موستەحەقی چیە، ئـەو کاتـە خـوا ئیجـازە ئـەدا بـۆ هەرکـەس بـەپێی لیاقەتو شایستەیی خۆی دوعای خێر بکەن، خۆی ئەفـەرموێ : بـەبێ مۆڵەتو ئیجازەی ئەو کەس ناتوانێ قسە بکا، تەنانەت مەلائیکـەش - کە مەئموری خوان و خەڵکیی ئامادە ئەکەن بۆ دادگا - ناتوانن قسـە بکەن .. کەسیش ناتوانێ قسـەی ناڕێك بکا. ئەبێ قسەی ڕێك بکـرێ، قسەی ڕێکیش ئەوەیە کە بۆ کافر لەعنەت داوا بکرێ، بۆ بـڕواداریش پاداشتو جەزای باش داوا بکرێ، هـەرکام بـەپێی خـۆی .. کافرێـك لەعنەتی لێ ئەکرێ بە قەدەر ئـەو کوفرەی کـە هەیـەتی، بـڕوادارێکیش دوعـای خێـری بـۆ ئـەکرێ بـەپێی ئـەونیمانو عەمـەلی صـالحە کـە هەیەتی .. زیاتر لەوە نا ، کەمتر لەوەش نا ..

ئائەمە شەفاعەتێکە کە هەیەو خوا ئیجازەی ئـەدا، ئەوەکـەی تریـان ( ئەوە کە وتمان وەکیل موداقیعێك یا مەحامیەك بـێ، یـا پارتییـەك)، ئەوە شەفاعەتێکە کە قورئان نەفی کردووەو، هەرکەس عەقیـدەی پێـی بێ، شەریکی بۆ خوا قەرار داوەو گومڕا بـووەو لـە ڕێ دەرچـووە.. تەنها کەسێ ئەکەوێتـە بـەر شـەفاعەتی پێغەمبـەری خـواو بـاقی بەنـدە ساڵحەکان ،کە لەوە دووریی بگرێ، خۆی بڕیار ئـەدا کەسـێ ئەگاتـە فریایو دێ بە هانایەوە، خۆی خەریکی ئیمـانو عەمـەلی سـاڵح بـێ، خەریکی ئەدای مەسئولیـەت وئەرکی بەندەیی بێت ، جا کـاتێ ئـەرکی

خۆی ئەدا کرد، ئەوەککول بکا لەسەر خواو ئومێدی بێ خوا رەحمی پێ ئەکا، هەروەها بەندە سالحەکانی خوایش دوعای خێری بۆ ئەکەن بێ ئەوەی خۆی لێیان داوا بکاو، بێ ئەوەی خۆی کەسێ بکا بە تکاکاری خۆی .

بەڵام ئەگەر هەڵەی کرد وگومڕا بوو، وای زانی کەسێ ئەبێتە تکاکاری، بێ ئەوەی کردەوەیەکی چاکی بێ، بێ ئەوەی ئیمانو کاری چاکی بێ، یا لە حاڵێکا ئیمانو عەمەلی سالحی زۆر کەمە کەسێ ئەگاتە فریای، ئەوە گومڕا بووە، ئەوە تووشی هەڵە بووە .. مەشهوورە کە پێغەمبەری خوا بە فاتیمەی کچی فەرمووە : (ئەی فاتیمە ، خۆت لە بیری دوارۆژی خۆتا بە . نەڵێی من کچی پێغەمبەرمو، ئەگەریش کردەوەی باشم نەبێ ئەو ئەگاتە فریامو شتێکم بۆ ئەکا، ئەوە بزانەو دڵنیابە کە ئەگەر خۆت شتێك بۆ خۆت نەکەی من ناتوانم هیچت بۆ بکەم). خوای گەورە ئەفەرموێ:

﴿ فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَاءَلُونَ ﴾..
کاتێك کە فووکرا بە شەیپورداو، فەرمان درا بە زیندووبوونەوەو حازر بوونی خەڵك بۆ دادگای خوا، ئیتر لەو رۆژەدا نەسەبەکان نین لە بەیناو نین لە ئارادا، هیچ کام لە نەسەب و بنەماڵە -کە لە دونیادا بوون- نین . کەس لەکەس ناپرسێتەوە، کەس لەکەس شت داوا ناکا .. یانی لەو رۆژەدا هەرکەس خۆی تەنهایە، ئاوتری : فاتیمەی

کچی محمد .. ناوتری فلآنە کەس کوری فلآن بەندەی صالحی خوا..
هەرکەس خۆی تەنهایە، بە ئیمانو عەمەلی سالحیخۆیەوە حازر نەبێت، بەپێی ئیمانو عەمەلی صالحی خۆی موحاکەمەو موحاسەبەی نەکرێ، خۆی موستەحەقی چیە، ئەوەی پێنەدرێ .. جا کاتێك جەزاو پاداشتی دیاری کرا، ئیجازە ئەدرێ بە بەندە صالحەکانی خوا کە دوعای خێری بۆ بکەن .

## چۆنیەتی دوعاکردن و لە خوا پارانەوە

ئەوەش ئەبێ بزانین کە ئینسانی موسولمان لە دوعای خێردا نابێ زیاتر لەوە کە خوا بریاری داوە داوا بکا.. بۆ نموونە : ئەگەر ئینسان ئەوەندە ئیمانوعەمەلی سالحی بووکە لە پلەیەك لە پلەکانی بەهەشتا بووکەوا لە خوارەوە، لەبەرئەوە ئیمانو عەمەلی صالحی کەمە، حەقی نیە داوای ئەوە بکا کە برواتە پلە بەرزەکان .. هەروەها لە دونیادا ئەگەر کەسێ خۆراکی نەخوارد جایز نیە داوا بکا لە خوا، کە تێری بکات . چونکە ئەگەر خۆراك نەخواو داوا بکا لە خوا تێری بکا، مانای ئەوەیە داوا ئەکا لە خوا،کە بەرنامەی خۆی تێك بدا. خوا قەراری داوە هیچ کەس تێر نەبێ مەگەر بە خواردنی خۆراك، دەی ئەگەر ئەو داوا بکا لە خوا کە بەبێ ئەوەی خۆراکی خواردبێ تێری

بکا، مەعنای ئەوەیە داوا ئەکا لەخوا ئەزمو بەرنامەیەك کە ڕێکی خستووە تێکی بدات ..

هەروەها ئەگەر ئینسان ئیمانو عەمەلی سالحی نەبوو، داوای کرد لە خوا رەحمی پێبکا، یا کەسیتربۆی داوا کرد، ئەوە داوای کردووە خوا بەرنامەی خۆی تێك بدات . یا کەسێ شایانی شتێکی زۆرنیە ئەگەر داوا بکرێ کە ئەو شتە زۆرەی پێ بدرێ، ئەوە ناشەرعیەو نادروستە، هەرکەس تەنها ئەوەندە دروستە دوعای بۆ بکرێ کە خۆی حەقیەتی و خۆی شایانیەتی، چونکە خوا خۆی دیاری کردووە هەرکەس موستەحەقی چیەو چی و چەندەی دەست ئەکەوێ؟

بۆیە جائیزە موسوڵمانانیش بە پێی ئەوە بۆیەکتر دوعای خێر بکەن، بپاڕێنەوەو شەفاعەت بکەن بۆ یەکتر.. دیارە لەسەرووی هەموشیانەوە پێغەمبەری خوایە (علیه الصلاة تسلیم كبرا!او)کە عەلاقەی بە هەموو بڕوادارانەوە هەیە، لەگەڵ تێکڕای پێغەمبەران،کە دوعای خێریان بۆ ئەکەن، لە خوا ئەپاڕێنەوە کە بیانگەیەنێت بەوەی وا هەوڵیان بۆ داوەو سەبەبەکەیان بۆ بەکارهێناوە..

ئاخر ئەبێ ئەوە بزانین کە وەنەبێ ئەگەر ئینسان ئیمانوعەمەلی سالحی بوو، ئیتر حەتمەن ئەبێ دڵی تەخت بێو خوای لەبیر بچێتەوەو وابزانێ تەنها ئیمانو عەمەلە صالحەکە ئەیگەیەنێ بە خۆشبەختی . نا، نەخێر، هەروەك چۆن کەسێك خۆراك ئەخوا بەڵام دوای ئەوە

تەوەککول نەکا لەسەر خوا، بۆ ئەوەی کە تێربێ‌و، ئەزانێ خۆراك بەتەنیا تێری ناکا، هەروایش ئیمان‌و عەمەلی صالح سەبەبێکە ئینسان بەکاری ئەهێنێ، جا دوای ئەوە ئەبێ ئومێدی بەخوا بێت کە ئەسەر دائەنێت لەو ئیمان‌و عەمەلی سالحەدا. ئەبێ هیوای بێ کە رەحمی پێ‌ئەکا، لە گوناهی خۆش ئەبێ، جەزای باشی ئەداتەوە .. ئیمان‌و عەمەلی سالح سەبەبێکە، ئینسان کە ئیمان‌و عەمەلی سالحی بوو، جا دوای ئەوە ئەبێ تەوەککول بکا لەسەر خوا، داوا بکا : خوایە ئەوە من ئیمان‌و عەمەلی سالحم هەیە، جا تۆش تەئسیری تێدا دابنێ تا بگەم بە خۆشبەختی‌و، لە بەدبەختی رزگار ببم .. هەروەها بەندە سالحەکانی تریش ئەو دوعایەی بۆ ئەکەن : خوایە ئەم شەخسە ئیمان‌و عەمەلی سالحی هەیە، جا تۆش رەحمی پێ بکە .. ئاوا دوعای خێر ئەکرێ‌و شەفاعەت ئەکرێ ..

ئەوەش بزانین کە لە قورئاندا زۆرێك دوعا هەن کە خوای گەورە بەیانی کردوون تا بڕوادارەکان ئەو دوعایانە بکەن، هەمووشیان بەو جۆرەن کە وتمان، هەمویان باسی ئەوە ئەکەن ئەبێ سەبەبەکە رێککەوتبێ‌و بەکارهێنرابێ، جا دوای ئەوە ئینسان حەقی هەیە دوعا بکا ، بلێ : خوایە، وامن ئەم سەبەبەم بۆ بەکارهێناوە، ئەوەم بۆ بکە یا دوعا بکا بۆ کەسێکی‌تر.

بۆئەوەش کە وتمان ئیمانو عەمەلی سالّح تەنها سەبەبێکە، ئەبێ دوای ئەوە ئینسان تەوەککولی لەسەر خوابێ‌وئومێدی بەو بێت ، خوا ئەفەرموێ :

﴿ إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُولَئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَةَ اللَّهِ ﴾ واتە : ئەوانەی ئیمانیان هێنا، ئەوانەش لەبەرخاتری خوا هەموو شتێکی خۆیانیان بەجێ‌هێشتو کۆچیان کردو، لەرێی خوادا بە هەموو هێزو توانایانەوە هەوڵیاندا، ئەوانە ئومێدیان هەیە بە رەحمەتی خوا. بەڵێ پاش ئەوە ئومێدیان هەیە بە رەحمەتی خوا، چونکە ئەو ئیمان و هیجرەتە، ئەوتێکۆشانە لەبەر خوا، خۆی سەبەبە (هەروەك خۆراکەکە وایە)، ئەمیش خۆی بەتەنها ئینسان ناگەیەنێت بە خۆشبەختی .. ئینسان ئەگەر پڕ بەم زەوی‌یە کردەوەی چاکی هەبێ، ئەبێ هەر ئومێدی بە خوا بێ، وا ئەزانێ کردەوە چاکەکەی – بە تەنها – ئەیباتە بەهەشت .

لە ریوایەتێکا هەیەکە پێغەمبەری خوا (علیەفلاصلا وتماکبرلا ) ئەفەرموێ: هیچ کەس تەنها بەکردەوەی چاکی خۆی ناچێتە بەهەشت . لەو کاتەدا یارانی عەرزی ئەکەن: (تەنانەت تۆیش؟!) ئەفەرموێ: (بەڵێ، تەنانەت منیش، مەگەر خوا رەحمم پێ‌بکاو بم خاتە بەر رەحمەتی خۆی). بەڵێ کردەوە سەبەبێکەو ئەگەر خوا نەیەوێ ئینسان خۆشبەخت بێ، کردەوە بە تەنها خۆشبەختی ناکا..

بە کورتی ئەوەی باسمان کرد ئەوە بوو کە : ئەبێ ئینسان ئیمانی بێ هەرخوا دروستکەری ئاسمانەکانو زەویو هەرچی‌یەك لە بەینیاندایە، هەرخوایە ئەتوانێ هەر شتێ بکا، مەخلوقەکان هەموو سەبەبن، هەرخۆیەتی شتیان پێ‌ئەکا. هەرخوایە خاوەنەو هەموو ئیمکاناتو نیعمەتەکان رێك ئەخاو کۆسپو موشکیلەکان لەسەر رێ لائەبات . هەرخوایە کە (إلە) واتە فەرمانڕەواو فەریادڕەسە، غەیری ئەو فەرمانڕەواو فەریادڕەسی تر نیە . بەوجۆرە مەعنای ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِين﴾ رۆشن ئەبێتەوە، کە تیایدا ئینسان پەیمان ئەبەستێ لەگەڵ خوای خۆی کە بەندەیی بۆ ئەو بکا، هەر داوای کۆمەك لەو بکا، موخلیسانە دوای ئەوەی ئەرکی خۆی بەجێ هێنا، تەوەککول لەسەرئەوئەکاو لێی ئەپارێتەوە کە کۆمەکی بکات بۆ ئەوەی وانەیەوێ ئەنجامی بدا، تا بتوانێ ئەنجامی بدا. هەروەها مانای (لاإلە إلاّ الله) رۆشن ئەبێتەوە کە یەعنی: هیچ فەرمانڕەواو فەریادڕەسێك بێجگە لە (الله) نیە . .

ئائەمە وشەیەکە پێش لە هەموو وشەیەك بۆ ئینسانێك بیەوێ رێگای بەندەیی خوا بگرێ، ئەبێ مانای رۆشن بێ، بەبێ رۆشن بوونی مانای ئەمە، بەبێ تەسلیم بوون بە مانای ئەو وشەیە، ئینسان بەندەیی خوای پێ‌ناکرێ .. زۆر بە داخەوە ئەو کەلیمە گەورەیە ماناکەی غەریب بووەو داپۆشراوە لە زۆرێك لە موسوڵمانەکان .

# بەشی چوارەم

## پوختەیەك دەربارەی حیكمەتەكانی نوێژو ڕۆژو و زەكات

- پوختەیەك دەربارەی حەقیقەتی نوێژو حیكمەتەكانی
- مانای حەقیقی (الله أكبر)
- كورتەیەك لە مانای سورەتی (فاتیحە)
- مانای سورەتی (إخلاص)
- هەندێ لە حیكمەتی جولەو زیكرەكانی نوێژ
- كورتەیەك لە مانای (التحیات)
- حیكمەتی چەندبارەبونەوەی نوێژەكان لە شەوو ڕۆژدا
- حیكمەتی نوێژی ویتر لە شەودا
- پوختەیەك لە باسی زەكات
- پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو

## پوختەیەك دەربارەی حەقیقەتی نوێژ و حیكمەتەكانی

ئێستا جێی ئەوەیە باسی ئەوە بكەین كە گەورەترین كردەوەیەك ئینسانی موسوڵمان ئەبێ ئەنجامی بدا (نوێژە). لە پێشا وتمان كە عیبادەتو بەندەیی مانای ئەوەیە ئینسان لە ژیانیدا بۆ ئەوەی بەرەو پێگەیشتن بڕوا، بۆ ئەوەی ئیسلاحی خۆی بكا، ئەبێ بەپێی فەرمانی خوا لە نیعمەتو ئیمكاناتێ بۆی ئامادە كردووە ئیستیفادە بكا..

وتیشمان ئینسان كاتێ كە خۆی ناسیو زانی مەخلوقێكە ئامادەیی هەیە بۆ ئەوەی ئیسلاح بێو بچێ بەرەو تەواوبوون . هەروەها زانیشی كە ئاسمانەكانو زەویونەوەی تیایاندایە هەمووی نیعمەتو ئیمكاناتن، لەبەردەستیا دانراون، بۆ ئەوەی كەڵكیان لێ وەرگرێ بۆ ئەو كارە، واتە : خوا ئەناسێ بەوە كە (رحمن و رحـيم)ە، میهرەبانە، هەمیشەش رەحم ئەكا بە بەندەكانی خۆی، ئەوەی كە پێویستیانە بۆیان ئامادە ئەكا، ئەوەی كۆسپوگرفتیشە لەسەر ڕێیان لای ئەبا.. دیارە بێهودە ئەم كارە ناكا، ئەوە كە ئینسانی دروست كردووە، بۆ ئەوەی بەرەو كەماڵ بڕوا، ئەو ئیمكاناتەشی لەبەردەستیا قەرارداوە، تەنها هەر ئەوە نیە، حەتمەن ڕۆژێكیشی داناوە بۆ ئەوەی لە ئینسان پرسیار بكا : كەچی كردووەو چی نەكردووە؟

كەوابوو خوای گەورە خاوەنی دوارۆژیشە، خاوەنی ڕۆژێكە ئینسان جەزای كردەوەی خۆی وەرئەگرێتەوە . كاتێك خوا ئاوا ناسرا كە

((رحمن) و((رحیم) و((مالك یوم الدین)ه، ئیتر دەروونی ئینسان ـ ئەو ئینسانەی ئاوا ئەیناسێ ـ پڕ ئەبێ لە (ئومێد)و لە (ترس) بەرامبەر خوای گەورە . ئەوەش هەڵی ئەنێ بۆ ئەوەی پەیمانی بەندەیی لەگەڵ خوا ببەستێ، بۆیە ئیتر ڕوودەکاتە خوای خۆی و دەڵێ: ﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ ﴾ .. دیارە لەبەرئەوەی کە ناتوانێ یەك هەنگاو بەبێ کۆمەکی ئەو هەڵگرێ، داوای کۆمەکیشی لێ ئەکا، پەنای پێئەباو هاواری لێ ئەکا، کە بێت بە هاواریەوەو کۆمەکی بکا، بۆ ئەوەی بتوانێ عیبادەتو بەندەیی بکا، بۆیە پاش ئەوە دەڵێ: ﴿ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴾.

جا لەبەرئەوەی ئینسان سەری لێ ئەشێوێ لە هاوار کردنو داوای کۆمەك کردنا، لەبەرئەوەی هەرکەس بە مەیلی خۆی ڕێگایەك بۆ خۆی هەڵئەبژێرێ، یەکێ بە هەڵسانەوە، یەکێ بە دانیشتن، یەکێ بە ڕاکردن، یەکێ بە خولان بەدەوری خۆیا، یەکێ بە مات بوون، یەکێ بە قاڵ کردن، هەرکەس بە جۆرێ دەست ئەکا بە هاوارکردنو داوای کۆمەك کردن، بۆ ئەوەی ئەوە ڕوونەدا، خوا خۆی بەڕەحمەتی خۆی،باشترین چەشنی دوعاو پاڕانەوەو هاوارکردنی بۆ ئینسان دیاری‌کردووە، ڕۆشنی کردۆتەوە کە چ جۆرە هاوارکردنو دوعاکردنو پاڕانەوەیەك لە گشت جۆرەکانی‌تر باشترە، واجبی کردووە لەسەر ئینسان کە ئاوا بپاڕێتەوە، ئەو پاڕانەوەیە لە هەرچی دوعاو پاڕانەوەی ترە باشترە، ئەوەش نوێژە.

نوێژعەرەبیەکەی (صلاة)ە . (صلاة) بە مەعنای دوعـاو پاڕانەوەیـە، داوای شتی باشکردن، لە خواکۆمـەك خواسـتن، بـۆ ئەوەی‌کۆسـپو گرفت لەسەر ڕێ لاببا .

کاتێ ئینسـان بڕیار ئەدا ڕێگای بەندەی خوا، ڕێگای ئیمانو عەمەلی صالح، بگرێتە بەر، چارەی نیە غەیری ئەوەی لە خـوا داوای کۆمـەك بکا، جا خوا خۆی فەرموویەتی بـەو جـۆرە داوای کۆمـەکم لێ بکـەن (نوێژ بکەن).

جا لەبەرئەوەی بەندەیی‌و عیبادەت بە دوعاو پاڕانەوەیـە، لەبەرئـەوە یەکەم کردەوەیەك کەئینسـانی (مؤمن) ئەبێ ئەنجامی بـدا نوێـژە.. بۆیـە هەمیشە لە هـەموو کتێبـەکانی خـوای گـەورەدا، لـە زەمـانی هـەموو پێغەمبەرەکانی خوادا (علیهم صلوات الله وبرکاته)، نوێژ فەرزو واجب بووە لەسەر موئمینەکان .

ئیتر لەعەر زەمانێکا چۆن بووە؟ ئەوە گـرنگ نیـە، بـەڵام ئەوەنـدە یەقینە قورئان باسی ئەکا کە لە هەموو دەورو زەمانێکـا نوێـژ هـەبووە، هـەر بـەو بۆنەیشـەوە لەسـەرەتای ئـەو زەمانـەوە کـە قورئـان هاتـە خوارەوە- هەر لە (مەککە)دا ، لەو ساڵانەی ئەوەڵـەوە – دەسـتوری نوێژکردنیش هاتە خوارەوەو فەرزکرا لەسەر پێغەمبەری خـواو لەسـەر [illegible] ـتان کە نوێژ بکەن ..

ئەڵبەتە ئەبەو شێوەیە کە ئێستا هەیە، ئەمە دواتر وای لێهاتووە .
بەلاَم لە پێشا دوعاو پاڕانەوەو نوێژ بەچەند جەشنو شێوەیەك هەبووە، هەر لەسەرەتای دەعوەتو بانگ کردن بۆ ڕێگەی خواوە، پێغەمبەری خوا خەریکی نوێژو دوعاو پاڕانەوە بووە..
شتێکی زۆر ڕوونە نوێژ ـ کە دوعایە ـ لازمەو پێویستە بەر لە هەر کردەوەو کارێکیتر ئەنجام بدرێ .. بەبێ نوێژ ئینسان ناتوانێ ڕێگای بەندەیی خوا بگرێ .
لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر موسوڵمان دوای ئەوەی ئیمانو باوەڕی دروست بوو ـ وەك باس کرا ـ، دوای ئەوە کە ئەیەوێ دەست بکات بە ئەنجام دانی کردەوە چاکەکان، پێویستە لەسەری پێش لە هەموو شت بزانێ نوێژ چی‌یە؟ پاشان نوێژ بکا، هەر لە ئێستایشەوە بڵێین کە نوێژێك نوێژە ئینسان لێی حاڵی بێو بزانێ چی ئەکا؟ چی ئەڵێ؟ بەبێ لێحاڵی بوونو بەبێ دەرککردنی مانای نوێژ ، کەڵکی وای لێ نابێو ئیستیفادەی وای لێ ناکا، بەداخەوە ئەو کردەوە گەورەیە، ئەو شتە گرنگە زۆربەی موسوڵمانان بەبێ ئەوەی فەهمی ماناکەی بکەن، بەبێ ئەوەی بزانن چیە؟ ئەنجامی ئەدەن. بۆیە زۆر ئیستیفادەی ئەبووەو نیەتی .. کەسی وا هەیە هەشتا ساڵە نوێژ ئەکا بەلاَم ئەخلاقو خورەوشتە ناڵەبارەکانی هەرماون، هەربەوەشەوە ئەمرێ .. کە ئەگەر

نوێژی بەدەرك و فەهمەوە بكردایە، بیزانیایە چی ئەكا، حەتمەن ئاوا نە ئەبوو.. خوا ئەفەرموێ:

﴿ إِنَّ الصَّلاةَ تَنْهى عَنِ الفَحْشاءِ وَالْمُنْكَرِ ﴾ : بە دڵنیایی نوێژ ئینسان مەنع ئەكاو ئەیگێڕێتەوە لەهەرشتێ كە ناپەسەندەو مونكەرو ڕەدكراوەیە .

دەی كەسانێ كە زۆر زۆر نوێژ ئەكەن و دوای ئەوەیش هەر كردەوەی ناپەسەند ئەنجام ئەدەن، دیارە ئەوە نوێژەكەیان نوێژ نەبووە .

پێویستە لەسەر هەر موسوڵمانێ كە ئەتوانێ، ئەم ڕاستی‌یە ڕۆشن كاتەوە بۆ خەڵكی، مانای نوێژیان پێ‌بگەیەنێ، بۆیان باس بكا .

باس بكا كە (قیام)و وەستان لە حزووری خوادا بۆچی‌یە؟! (ركوع)و چەمینەوە بۆچی‌یە؟! (سجود)و كڕنووش بردن بۆچی‌یە؟! (دانیشتن) لە تەشەهوددا بۆچی‌یە؟! سورەتی فاتیحە بۆ ئەخوێنرێ؟! مانای چی‌یە؟! (تحیات) بۆ ئەخوێنرێت و مانای چی‌یە؟! هەروەها هەر شتێكی‌تر كە لە نوێژدا ئەنجام ئەدرێ، چی‌یەو بۆچی‌یە؟! فەرزە لەسەر هەر موسوڵمانێكیش پێش لەهەر شتێكی‌تر هەوڵ بدا بۆ ئەوەی مانای نوێژ فێربێ و بزانێ نوێژ چیە؟! بە زانینەوە نوێژ ئەنجام بدا.. ئەوانەش كە منالیان هەیەو ئەیانەوێ منالەكانیان فێری نوێژ بن، با ئەوە بزانن كە واجبە لەسەریان لە پێشا نوێژەكەیان پێ فێر بكەن، مانای نوێژەكە،

حەقیقەتی نوێژەکە. جا ئەو کاتە پێیان بڵێن نوێژ بکەن، ئەگەر دوو ساڵیش فێری مانای نوێژەکە بووە بابکەوێتە دواوە ئەوسا نوێژبکا..

خوا ئەفەرموێ: لەکاتێکا حەواستان جەم نیەو هۆشتان بە خۆتانەوە نیە، نازانن ئەگەر نوێژ بکەن چی ئەڵێن، حەقتان نیە نزیکی نوێژ بکەونەوە:

﴿لاَ تَقْرَبُواْ الصَّلاَةَ وَأَنتُمْ سُكَارَى حَتَّىَ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ﴾ .

عالمەکان لە تەفسیرەکانیانا باسیان کردووە : ئەمە بۆ ئەوەیە هەرکەسێك لە حاڵەتێکا بێ کە هۆشی بەلای نوێژەکەوەو بەلای ئەوشتانەوە لەئەنوێژەکەیا ئەیانکا و ئەیانڵێ نەبێ، ئیجازەی نیە نزیکی نوێژ بکەوێتەوە .. چ کەسێ کە مەستی شەراب بێ، چ کەسێکی‌تر کە حەواسی جەم نەبێ‌و هۆشی لەسەرخۆی نەبێ ..

هەرچۆنێك بێ تەنها لەکاتێکا جائیزەو دروستە ئینسان نزیکی نوێژ بکەوێتەوە، کە هۆشی بەخۆیەوە بێ، بزانێ چی ئەکاو چی ئەڵێ . دیارەکەسێ مانای نوێژەکە نەزانێ لە مەستیش خراپترە ..

جا با باس لەوە بکەین کە حەقیقەتی ئەوشتانەی لە نوێژدا ئەنجام ئەدرێن چین و چۆنن؟ ئینسان ئەبێ بە چ حاڵێکەوە خەریکی نوێژکردن بێ ؟ ..

ئەوە بەرەبەیانە، فەجر بووە، نوێژی بەیانی هاتۆتە پێشەوە، قەرارە ئینسان بەوەی زانیبێت کە رۆژ دەستی پێ‌کردووەو، لەخەو خەبەری

بووبێتەوە.. کە لەخەو خەبەری بوەوە ئەبێ بیری ئەوە بکاتەوە ئەوا ڕۆژێکی تر دەستی پێ‌کرد، ئەم ئینسانە کە بەندەی خوایە ئەبێ ئەمڕۆیش وەك ڕۆژانی تر بەندەیی بۆ خوا بکا، یا ئەگەر یەکەم ڕۆژی بەندەیی‌یە ئەبێ دەستی پێ‌بکاو خەریکی عیبادەت‌وئیتاعەت‌و فەمانبەرداریی خوا بێ.. ئائەوە یەکەم شتێکە کە ئەبێ بێت بە دڵی ئینسانا کاتێك کە خەبەری ئەبێتەوە و لەخەو هەڵدەستێ.

دیارە ئەم بەندەیی‌و ئیتاعەتە بەبێ پاڕانەوەو دوعا ناکرێ، بۆیە ئەبێ بە شوێن ئەوەدا زوو لە بیری ئەوەدا بێ کە بڕوا لە خوا بپاڕێتەوە، دوعا بکا، نوێژ بکا، کە خوا کۆمەکی بکا بۆ ئەوەی بتوانێ بەندەیی بکا..

جا هەڵئەسێ‌و ئەڕوا.. بەڵام نەك هەروا بەشڵ‌وشێواوی، بەبێ ئامادەنەکردنی دیمەنی دەرەوەی، یان ئامادەیی دەرونیی. نەخێر، ئەبێ بڕوا ئەگەر پیسەکی پێوەیە لای ببا، خۆی پاك کاتەوەو لیباسی جوان بکاتە بەری. جێیەك کە قەرارە بەسەریەوە نوێژ بکا پاك‌وتەمیز بێ، هەروەها چۆن ئینسان ئەڕواتە مەجلیسێك، نایەوێت لەو مەجلیسەدا ناموحتەرەم بێت‌و خەڵك بەچاوی سووك تەماشای بکەن، دەستێك ئەهێنێ بەسەروو ڕووی خۆیاو دەموچاوی ئەشواو، خۆی پاکوخاوێن ئەکا..

بۆ نوێژیش ئەبێ بڕوا دەموچاوی بشوا، دەستەکانی تا ئەنیشکی بشوا، دەستێ بکێشێ بەسەریا، سەری ئەگەر تۆزو شتی پێوەیە بەو دەست بەسەرا کێشانە پاکی بکاتەوە.. پێیەکانی تا قاپکی بشوا، دوای ئەوە بڕوا ڕووبکاتە ئەو ماڵەی خوای گەورە لە زەویدا قەرارو دەستوری داوە کە بینا بکرێ بۆی، ئەوە وەك پایتەختی خوای گەورەیە لەسەر زەوی، چونکە خوا حاکمو فەرمانڕەوای ئینسانە، ئەوەش پایتەختەکەیە، جا ئەگەر ئینسان ناتوانێ لەگەڵ خوای خۆیدا ڕووبەڕوو بێ ـ چونکە نایبینێو ئەو وەك حاکمێك لەحاکمانی بەشەری نیە ـ با ڕوو بکاتە ئەو ماڵە، ڕووبکاتە ئەو پایتەختە، هەر وەك چۆن ئەوانەی وا بەندەی حاکمەکانن ڕوونەکەنە پایتەختەکانیانو ئەیانکەنە قیبلەی دڵی خۆیان ..

با ئینسانێ کە بەندەی خوایە ڕووبکاتە پایتەختی خوای گەورە ـ کە کەعبەیەو وا لە مەککەدا ـ ڕوو بە ئەوێ بوەستێ . جا هەرکات کاتی نوێژ هاتە پێشەوەو خۆی ئامادە کرد، بەدەستو دەمو چاو شۆردنەکەی ـ بەدەست نوێژ گرتنی ـ وپاش پۆشاکی جوان وپاك کردنە بەریو، پاکبوونی لاشەو لیباسو جێی نوێژەکەی، ئەوجا ڕووی ئەکاتە کەعبەو ماڵەکەی خوا، بەو جۆرە هەم ڕووی دەرەوەیو هەم ناوەوەی ئامادە دەبێ بۆ ئەوەی دەست بکات بە نوێژ کردن .

## مانای حەقیقی (الله أكبر)

دیارە وەك لەمەوپێش باسمان كرد، گومڕایی‌و ئینحرافی زۆرێك لە خەڵك ئەوەیە كە غەیری خوایان كردووە بە فەرمانڕەواو فەریادڕەسی خۆیان ، ئەوەش كە ئەبێ بە كۆسپ لەسەر رێی ئینساناو ناهێڵێ بەندەیی موخلیسانەی خوا بكا، ئەو فەرمانڕەواو دەسەڵاتدارە زاڵمانەن . هەروەها ئەوانەی وا سەر لە خەڵك ئەشێوێنن‌و، خۆیان ئەكەن بە واسیتەو وەسیلە لەبەینی خەڵك‌و خوادا، جا بۆ ئەوە كە ئینسان لەدەست ئەوانە رزگاری بێ، ئەبێ بەیادی خواوە دەست پێبكا، بەسكاڵاو دوعاو نوێژكردن. چۆن؟ سەرەتا بیری ئەوە بكاتەوە ئەم خەڵكەی واسەریان لێ شێواوە ئەچن بەندەیی بۆ ئەو تاغوت و حاكمە زاڵمانە ئەكەن، ئەوانەی سەریان لێ شێواندوون، ئەمانە كردوویانن بە فەریادڕەسی خۆیان، لەوانەی وا درۆزنن و بەناحەق خۆیان ئەكەن بە واسیتە لەبەینی خەڵك‌و خوادا. بیری ئەوە بكاتەوە خەڵكی وا ئەزانن ئەمانە دەسەڵات و گەورەیی‌یەكیان هەیە بۆیە كەوتوونەتە شوێنیان .

دەی ئەمیش كە رووی كردە خوا بیری ئەوە ئەكاتەوە كە خوا گەورەترە لەوانە، گەورەترە لەهەرچی حاكم‌و دەسەڵاتدارە، گەورەترە لەهەركەسێك خەڵكی وا ئەزانن دەسەڵاتێكی هەیە ـ بە فەرزی ئەوەیش كەسێكی تر غەیری خوا دەسەڵاتی بێ ـ خۆ خوا دەسەڵاتدارترو

گەورەترە، بيرى ئەمە ئەكاتەوە، ئيتر ئەوان لەبەرچاوى ئەكەون، لەبەرچاوى ون ئەبن‌و هەر خوايە كە حازرەو رووى دڵى هەر لەو ئەبێ، هەموو شتێكى جێ‌هێشتووەو رووى كردۆتە خوا. جا ئيتر ئامادەيە بۆ ئەوەى نوێژ بكاو بپاڕێتەوە، وەك ئەفەرموێ: ﴿ وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّى ﴾ بەيانى خۆشبەختى كەسێ ئەكا دواى ئەوە كە حەرەكەتى كردووە بەرەو كەماڵ‌و عەزمى گرتووە رێگاى بەندەيى خوا بگرێ ئيمانى هێناوە، پاش ئەوە يادى خوا ئەكا، جا دەست دەكات بە دوعا كردن‌و پاڕانەوەو نوێژ كردن ، سەرەتا ئەڵێ : (الله أكبر)، بيرى ئەوە ئەكاتەوە ئەبێ نوێژێك بكا (نوێژى فەرزى ئەو بەيانى‌يە وەك نموونە).
ئەڵێ : (الله أكبر) خوا گەورەترە، ئەگەر حاكمێك، دەسەڵاتدارێك گەورە بێ، هەرچى بێت ، خۆ خوا گەورەترە .

كەوابوو هەر حاكم‌و دەسەڵاتدارێكى تر ئەبێ ون ببێت‌و لە دڵ دەركرێ، چونكە وەختێ خوا گەورەترە ئەبێ ئينسان هەر رووى دڵى لەو بێت .

دواى ئەوە كە وتى: (الله أكبر) خوا گەورەترە، ئينجا دەست ئەكا بە دوعاو سكاڵا.. ديارە بۆ ئەوەى بەشێوەى باشتر دوعاو سكاڵا بكا، خوا خۆى چەند كەليمەيەكى داناوە تا ئينسان بەوانە دوعا بكا، كە عيبارەتە لەو سورەى (فاتيحە)بەى مەشهورەو هەموو كەس خەبەرى لێى هەيە، لە: ﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيم ﴾ تا ئەگاتە ﴿ غَيْرِ

المَغضوبِ عَلَيْهِمْ وَلا الضَّالِّين ﴾. ئائەوە گەورەترین دوعایەکە خۆی لە قورئانا ناردوویەتی بۆ ئەوەی بەندەکانی بەوە دوعا بکەنو پاڕێنەوە وسکالا بکەن .. لەوەش گەورەتر ئینسان ناتوانێ دوعا بکا..

## کورتەیەك لە مانای سورەتی (فاتیحە)

جا لەبەرئەوەی بە قورئان خوێندن دەست پێ ئەکا، پێش لەوە ئەبێ نوێژخوێن پەنا بە خوا ببا لەدەست هەر شەیتانوهەرکۆسپێك ، تا بتوانێ بە جوانی سکالاو دوعاکەی بکا . کەسانێك کە خوێندەوارن شتی تر هەیە کە پێش لە ﴿ أعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَجيم ﴾ بیلێن کە سوونەتەو ئەگەر کەسێك ئەوەش نەلێت قەیناکا، بەلام ئەوە واجبە کە لە دڵەوە رووی کردبێتە خوا، هەروەك کەسێك ئەڕوا بۆ سەفەرێك نیتر هەر بیری وا بەلای سەفەرەکە وە و، لەهەموو شتێکیترلەماڵو لەمناڵولە هەمووکەس غافڵە، چونکە ئەڕوا بۆسەفەر، نوێژخوێنیش ئەبێ ئاوا رووی هەرلە خوابێ، لە هەمووشتێکیتر روو وەرئەگێڕێ .
جا دەست پێ ئەکاو ئەڵێ:

﴿ أعُوذُ بِاللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرَجيم ﴾ پەنا ئەبەم بە (الله) لە شەیتانێك کە لە رەحمەتی خوا دەرکراوەو دوورخراوەتەوە . جا لێرەدا مەبەست تەنها شەیتانە گەورەکە ـ واتە (إبليس) ـ نیە . بەڵکو هەر مەخلوقێك موزاحیمی ئینسان بێ، نەهێڵێ ئینسان بەندەیی خوا بکا، نەهێڵێ

ئینسان بە جوانی دوعاو سکاڵاو نوێژ بکا لەلای خوا، ئەوە شەیتانەو دوورە لە رەحمەتی خوا. جا کاتێ ئینسان پەنا ئەبا بە خوا ئیتر نەجاتی ئەبێ لەدەست ئەوانە..

جا یەکەیەکە ئەم کەلیمانە ئەوترێن، ئەبێ لە مانەکەیان وردببینەوە، هەرکەسێ کە نوێژ ئەکاو هەر کەلیمەیەك لەمانە ئەڵێ ئەبێ مەعناکەی بێت بە دڵیا.. ﴿ أعُوذُ باللهِ منَ الشَّيطانِ الرَّجيم ﴾ پەنا ئەبەم بە (الله) لەشەیتانێ کە لە رەحمەتی خوا دوور خراوەتەوە.

کاتێك ئەمەی وت مەعناکەی بێت بە دڵیا، جا ئەگەر ئەیتوانی لەگەڵ وتنی کەلیمەکە مەعناکەی بێ بە دڵیا، دوای ئەوە تۆزێ بوەستێ‌و بیر لەمەعناکەی بکاتەوە. دوای ئەوە ئەڵێ :

﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم ﴾ بۆ ئەویش تۆزێ ئەوەستێ، مەعناکەی دێت بە دڵیا، جا ئەڕوات بۆ کەلیمەی دوایی .. هەروەها تا ئەوەندەی مەعنای کەلیمەکان لە دڵیدا جێگیر ئەبێ .. دوای ئەوە ئیتر ئەتوانێ هەرلەوکاتەداکەلیمەکە دێت بە زمانیا، مەعناکەیش بێت بە دڵیا .

بۆکەسێکیش ئیمامەت بکات، باشتر ئەوەیە لە جێی ئەوە (ئوعوذ بالله) بڵێ (نعوذ بالله) بڵێت، واتە : هەموومان پەنا ئەبەین بە (الله) لە شەیتانی رەجم کراو و دوورخراوە لەرەحمەتی خوا..

دوای ئەوە دەست ئەکا بە خوێندنی سورەی فاتیحە . دیارە ئینسان هەرکارێك ئەکا ئەبێ بە کۆمەکی خوا بیکا، خوێندنی سورەی فاتیحەیش کارێکە، ئەبێ ئینسان بە کۆمەکی خوا بیکا، مەعلومە ئینسان نە سوودێکی دەست ئەکەوێ، نە لە زەرەرو زیانێ نەجاتی ئەبێ، ئەگەر خوا کۆمەکی نەکات..

جا کە ئەیەوێ لێرەدا سوودو نەفعێکی دەست کەوێو لەزەرەرو زیان دوورکەوێتەوە، ئەبێ لە خوا داوای کۆمەك بکا، بۆیە ئەبێ لەسەرەتاوە بڵێ :

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم : بەناوی (الله)، میهرەبانی بە ڕەحم، دەست ئەکەم بە خوێندنی ئەم سورەتە ..

پێشتر وتمان : (رحمان) یانی ئەوەی خوا هەموو زاتی ڕەحمەتو میهرەبانی‌یە .(رحیم)یش واتە : هەمیشە خەریکی ڕەحمەت کردن وسوودگەیاندنە بە خەڵكو زەرەرو زیان لەسەر ڕێگایان لا دەبا .

جا کە ئەڵێ ﴿ بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم ﴾ یادی ئەو خوایە ئەکاتەوە کە هەرچی ڕەحمەتە لەلای ئەوەیە . هەرئەوە سورد ئەگەیەنێ ، هەر ئەوە زەرەر و زیان لا ئەبا .. جاکە ئەوەی وت، ئیتر ئومێد پەیدا ئەکا بەوەی لە خوێندنەوەی سورەتەکەدا ولە دوعاکردنەکەیدا سودی دەست کەوێ ولەزەرەر و زیان رزگاری ببێ ، سوودیش ئەوەیە کە

بگات بە خۆشبەختی، زەرەر و زیانیش ئەوەیە کە تووشی غەزەبی خـوا بیی‌و بەرەو گومڕایی بڕوا.

﴿ الحَمْدُ لله رَبِّ العالَمين ﴾ : ستایش و قەدردانی بـۆ خوایـەك کـە خاوەنی خەڵکە . بۆ ئەوە مانای (ستایش‌و قەدردانی) ڕۆشن بـێ ئـەبێ ئینسان هەر خوا بەوە بزانێ کە ئـەتوانێ سـوود بگەیـەنێ‌و هەرئـەویش زەرەرو زیان لائەبا، تەنها ئەو بـەو زاتـە بزانـێ کـە دەسـەڵاتی هەیـەو سەرەنجامی ئینسان لـە دەستیایەتی، هەر ئومێدی بەو بێت، هـەر ترسـی لەو بێت، هەر فەرمانبـەرداریی بۆ ئەو بکـا، هـەر داوای کۆمـەك لـەو بکا، ئا ئەمانە هـەمووی بەیەکـەوە ئەبێتـە سـتایش‌و قـەدردانی . دیـارە هەندێکی بە دڵە، هەندێکی بە زمانە، هەندێکیشی بـە ئـەعزای بەدەنـە، بەکردەوەیە، کە هەموو ژیانی ئینسـان ئەگرێتەوە . ستایش‌و قـەدردانیی بۆ (الله) لەبەرئەوەی کە خاوەنە، لەبەرئەوەی ئەو شـتانە لەدەسـتیایەتی ئەبێ قەدردانی لێ بکرێ‌و، ئێمەش ئاوا بیناسین، ئـاوا بکـەین کـە لێـی داوا کردووین . جـا پاشـان خـوای گـەورە خـۆی ئـا ئەمـە ڕۆشـنتر ئەکاتەوەو ئەفەرموێ :

﴿ الرَّحْمنِ الرَّحيم ﴾ : میهرەبانی بـەرەحم . ئـەوەی هـەموو زاتـی ڕەحمەتە، هەر قازانج‌و سودێك تەنها بەدەس ئەوەو ئەو ئەیگەیەنێ، هـەر زیان‌و زەرەرێك لەدەس ئەودایەو، ئەوە کە لای ئەبا .

﴿ مالِكِ يَوْمِ الدِّين ﴾ : داراو خاوەنی رۆژی جەزایە . دوای ئەوە کە هەرچی سوودە ئەیگەیەنێ‌و هەرچی زیانە لای ئەبا، دیارە رۆژێکیشی داناوە بۆ ئەوەی ئینسان زیندوو بکاتەوەو لێی بپرسێ‌و موحاکەمەو موحاسەبەی بکا، چۆن بووە بەپێی ئەوە جەزای بداتەوە . ئەگەر ئیمانو عەمەلی صالحی بووە جەزای خێر، ئەگەر کوفرو کردەوەی ناپەسەندیشی بووە ، جەزای شەڕی بداتەوە .

﴿ مالِكِ يَوْمِ الدِّين ﴾ : خاوەنی رۆژی جەزا و پاداشت .

کاتێ کە گەیشتە ئێرەو دڵی پڕ بوو لە ئومێدو لە ترس، جا روو ئەکاتە خوا. ئەوەشمان لەبیر نەچێ کە ئەبێ کاتێك ئینسان ئەم سورەتە ئەخوێنێتەوە ئیحساسی ئەوە بکات کە بەندە موخلیسەکانی تریش وان لەگەڵی، هەروەك ئەوەکە لە جەماعەتێکدا، لەگەڵ چەن نەفەری تردا ئەزانێ کە ژمارەیەك وان لە دەوری و پێکەوە خەریکی دوعاو سکاڵانو دەستە جەمعی خەریکن دوعا ئەکەن، هەروا ئەگەر خۆیشی تەنها بوو هەر لەبیری نەچێ کە بەندەی سالحی تریش هەن، ئەوانیش هەر خەریکی دوعاو پاڕانەوەن، وا هەست بکا کە وا لەگەڵ ئەوان . بۆیە لێرەیشا بەم چەشنە دوعاکە هاتووە کە ئێستا دەرئەکەوێ بۆمان، ئینسان خۆی تەنها نیە، لەگەڵ جەماعەتی بڕواداراندایە کە خەریکە سکاڵا ئەکاو ئەپاڕێتەوە .

﴿ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِين ﴾ : تەنها بۆ تۆ بەندەیی و فەرمانبەرداریی بێ غەلوغەش ئەکەین، تەنها لە تۆش داوای کۆمەك ئەکەین . ئەوە کورتەی مانای دووکەلیمەی (عبادە) و(استعانە)ە یە کە پێشتر بە باشی روون کرانەوە .

جا دوای ئەم شتانە کە بۆی رۆشن بوەوە ئەمە رێگای راستە ، لەگەڵ ئەو بەندە موخلیسانەی تر، روو ئەکاتە خوای گەورە و، بەیەکەوە هاوار ئەکەن لە خوا کە هیدایەتیان بداو رێنومایان بکا، بۆ ئەوەی بکەونە سەر رێگە راستەکە، یان ئەگەر وان لەسەری هیدایەتیان بدا بۆ ئەوەی هەنگاوەکانی تریشیان لەوەو دواتر هەر لەسەر رێگای راست بێ و لێی لانەدەن .

﴿ إِهْدِنا الصِّراطَ الْمُسْتَقِيم ﴾ : رێنماییمان بکە بۆ رێگە راستەکە . ئەو رێگەیەی ئینسان رەحەت پیایدا ئەچێ . چونکە خوا ئینسانی ئامادە کردووە بۆ چوون بەو رێگەیەدا، رێگەکەش سازگارو موافیقە لەگەڵ ئینسانا، (مستقیم)ە، ئینسان ئەگەیەنێ بە مەبەست ، (دواتر باسی ئەکەین کە مەبەستەکە چی یە؟ ).

﴿ صِراطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِم ﴾ : رێگای ئەوانەی خۆش بەخت کردن، نیعمەتی خۆتت رژان بەسەریاندا . لە ئایەتی تردا بەیان کراوە کە ئەوانە (پێغەمبەرانی خوا) و (راستگۆکانن)، یانی ئەوانەی هەموو گیانیان (صدق) و راستی بووە، بەراستی بەندەی خوا بوون، درۆ لە

کاریانا نەبووە، هەروەها (شەهیدەکان) یانی ئەوانەی هەموو ژیانیان شایەتی بووە بۆ ئەوەی هەر بەرنامەی خوا راستە . هەروەها (صالحەکان)، ئەوانەی ئەگەر چی لەدەرەجەی خوارترەوە بوون بەڵام لەرێی ئیمانو عەمەلی صالحا بوون، ئەگەر جارجاریش تووشی گوناهێك بووبن گەڕاونەتەوەو پەشیمان بوونەتەوە .. ئەمانە خوای گەورە لە دونیا وئاخیرەتا خۆشبەختی کردوون ، لە دنیادا خۆشبەختی کردوون کە ژیانێکی پێداون دوور لە ترس‌و لە خەفەت، هەروەك لەمەوپێش بەیانمان کرد. لەبەینی مردن تا قیامەتیشا دیارە ئەو هەموو نیعمەتەی بۆ ئامادە کردوون، لە هەمووی زیاتر رەزامەندی‌و لێخۆشبوونی خۆی .

﴿ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيْهِمْ وَلا الضَّالِّين ﴾ : نەك ڕێگای ئەوانە ی وا غەزەبیان لێ گیراوە . ئەوانەی وا رێیان بۆ رۆشن کرایەوە، بەڵام نەکەوتنە سەری، نەیانویست بەندەی خوابن، جا غەزەبیان لێ گیرا. غەزەبی خواش ئەوەیە کە لە دنیادا ژیان تەنگو تاڵ بێ، ئەگەر چی ئیمکانات بێ، ئەگەر چی نیعمەتی زۆر هەبن، بەڵام دڵ پڕ بێ لە ترس‌و لە خەفەت، لە مردنیشەوە عەزاب‌و ئاگر دەست پێ بکا، لە قیامەتیشدا جەهەننەم بەو هەموو عەزابەوە، لە هەمووی زەحمەت تر توورەیی و غەزەبی خوا ﴿ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيْهِمْ ﴾ ڕێگە راستەکە غەیری ڕێگای ئەوانەیە غەزەبیان لێ گیرا. ﴿ وَلا الضَّالِّين ﴾ غەیری

ڕێگای ئەوانەش کە گومڕا بوون، سەریان لێ شێوا، دوای ئەوەی بەرنامەی خوایان بۆ هات، حەقیان بۆ ڕوشن بووەوە، لەبەر بێ موبالاتییان، لەبەرئەوەی ژیانی دنیایان ویست ، لایانداو غافڵ بوونو هیدایەتەکەیان لەبیر چووەوەو سەریان لێ شێوا. دیارە ئەوانەیش هەربەرەو بەدبەختی ئەڕۆن .

جا کاتێ دوعاکەیان بەو جۆرە کرد، سورەی فاتیحە یان تەواو کرد، پاشان پێکەوەئەڵێن : (آمین) کە ئەم وشەیە لە قورئاندا نیە . ماناشی ئەوەیە : خوایە ، ئەو پاڕانەوەیەمان لێ وەرگرە .

ئەمە گەورەترین دوعایە کە ئینسان ئەیکا . واجبە لەسەری لە شەو و ڕۆژێکدا لای کەم حەڤدە جار ئەگەر لەسەفەرا نەبێت، ئەگەریش لە سەفەرا بێت کەمتر لەوە (لەسەفەرا لەجیاتی چوار ڕکات دوو ڕکات ئەخوێنرێت) — واتە بە قەدەر ڕکاتی نوێژە فەرزەکان — ئەبێ ئەم دوعایە بکا .

دوای ئەوە سورەیەکی‌تر لە قورئان ئەخوێنێ ، ئەویش بەم فکرەوە : دوای ئەوە بڕیاری دا کە بەندەی خوابێ‌و داوای کرد لە خوا کۆمەکی بکا بۆ ئەوەی بتوانێ عیبادەت بکا، ئەبێ ڕووبکاتە کتێبەکەی خوا، بزانێ لەوێ ڕێگای بەندەیی چۆن بەیان کراوە . بەعزێکی لێ بخوێنێتەوە، تا شارەزا بێ لە ڕێگای بەندەیی‌وبەو ڕێگایەدا بڕوات . بۆیە سوورەیەك لە قورئان ئەخوێنێتەوە، باشتر ئەوەیە لای کەم هەر

موسوڵمانێ دوو سورەتی لەبەر بێ، وەك سورەتی (قُلْ هُوَ اللَّهُ)و سورەتی (والعصر) کە لەهەر رەکعەتێکا یەکێکیان بخوێنێ، ئەگەر لە دوو رکعەتیشا هەر (قُلْ هُوَ اللَّهُ) بخوێنێ هەر دروستە ، بەڵام باشترە دوو سورەت بێ .

## مانای سورەی (إخلاص)

لەبەرئەوەی زۆرکەس ئەو سورەتە ئەخوێنەوە، باش ئەوەیە ئەویش ماناکەین ئەفەرموێ :

﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴾ بڵێ : حەقیقەتێك هەیە کە (الله) یەکتایە، هەرئەوەو لە خاوەنێتیدا کەسی ترنیە، هەر ئەوە فەرمان رەوایەو هەرئەوە فەریادرەسەو، غەیری ئەوکەس ئەو دەسەڵاتەی نیە .

﴿ اللَّهُ الصَّمَدُ ﴾ : (الله) پڕ کەماڵە، هیچ ناتەواوی تیا نیە، بێ نیازە، فەرمانڕەواکانی‌تر پوچن، فەریادرەسەکانی ترلە حەقیقەتدا فەریادرەس نین . خوا لە هەموو صیفەتەکانیدا کەماڵی هەیە، هیچ جۆرە ناتەواوی وکەمی تێدا نیە .

﴿ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴾ : نە منالی لێ بووە، نەخۆی رۆڵەی کەسێکەو لەکەسی تر بووە . نەك وەك فەرمانڕەوا نارەواکان، نەك وەك ئەو نافەریادرەسانەی کە بە گومانی خەڵکی فەریادرەسن، هەموویان هەم منالیان ئەبێت، هەم خۆیشیان منالی‌کەسی‌ترن و

لەکەسی‌تر بوون، کەواتە نیازمەندن، چونکە لەوەوپێش نەبوون و لە دوایشدا لەبەین ئەچن و نامێنن ، مەگەر رۆڵەکانیان رێگایان درێژە پێ‌بدەن.

﴿ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ ﴾ : هیچ کەسێك هاوتای ئەونەبوو، هیچ فەرمانڕەوایەك و هیچ فەریادرەسێك نیەکە هاوشانو هاوتای ئەوبێت .

## هەندێ لە حیکمەتی جوڵەو زیکرەکانی نوێژ

دوای ئەوەکە نوێژخوێن سورەتێك یا چەند ئایەتێك لە قورئانی خوێندو، بەو جۆرە لە خزمەتی خوادا وەستا و، ئەوبەشە لە بەندەیی جێبەجێ کرد، بیر لەوە ئەکاتەوە کە ئەم رادەیە بەس نیە، خوا لەوەش گەورەترەو زیاتر لەوە ئەبێ بەندەیی بۆ بکرێ، بۆیە ئەڵێ : ( الله أكبر) خوا لەوە گەورەترە، بۆیە زیاتر بەندەیی ئەکات، ئەچێتە رکوع ، دەس ئەنێتە سەر ئەژنۆ، سەری بەرێزهێنانەوە دائەنەوێنێ بۆخوا . جائەبێ بیری بێ لە کاتێکا بە پێوەیە ئەوە لە خزمەتی خوادا راوەستاوە، ئێستایش ئەبێ ئەوە لە بیری بێ کە بۆرێزلێنانی ئەو خەریکە سەری دائەنەوێنێ، جا لە وێشدا ئەڵێ :

(سبحان ربي العظيم): خاوەنەکەم دوورە و پاکە لەوەی هەر جۆرە ناتەواوییەکی بێ . دیارە بۆ کەسانێك کە خوێندەوارن شتی تریش

هەن ئەتوانن بیانخوێنن و، شتی زیاتر بڵێن و، لە ڕکوعا خێری زیاتریان دەس ئەکەوێ .

دوای ئەوە ئەم کارەشی کردو سەری دانەواند بۆ خوا، کاتی ئەوەیە تۆزێ نیسراحەت بکا، دوای ئەوە بڕوا زیاترئیحترامی خوا بگرێ ، بۆیە هەڵئەسێتەوەو ئەڵێ :

(سمع الله لمن حمده): خوا قوبوڵی بکا، خواگوێڕاگرێ بۆئەوانەی حەمدی ئەکەن، ئەوانەی قەدردانیلێ ئەکەن وستایشی ئەکەن .(ربنا ولك الحمد): ئەی خاوەنەکەمان، حەمدوقەدردانیش تەنها بۆ تۆیە،- هەروەك بەیاننان کرد- چونکە تۆ دووری لە هەر عەیبو ناتەواوییەك . جا ئەگەرئەوکەسە خوێندەوار بێ لێرەشدا شتی تریش هەیە کەبیڵێ .

دوای ئەوە کاتی ئەوەیە بیری ئەوە بکاتەوە ئەمەش بەس نیە . خوا گەورەترە لەوەش، ئەمیش ئەتوانێ لەوە زیاتر تەعزیمی بکاو بەندەیی بۆ بکا، بۆیە ئەڵێ :(الله أكبر) خوا گەورەترە لەمە، جا خۆی ئەخاتە زەوی، دەمو چاوی ئەنێتە سەر خاك ، هەروەك چۆن ئەوانەی کە بەندەی غەیری خوان، خۆیان ئەخەن بەسەر پێی خاوەن و ئاغاکانیانداو پێیان وخاکی بەر پێیان ماچ ئەکەن ، نوێژ خوێنیش ئاوا حاڵەتێکی ئەوێ کە خۆی بخاتە سەر زەوی و، دەمو چاوی-کە بە قیمەتترین ئەعزای بەدەنیەتی - بنێتە سەر خاك، تا خوا بەزەیی بێتەوە پێیدا، ڕەحمی پێ بکاوئەوەی وا ئەنجامی داوە لێی قبوڵ بکا .

دوای ئەوە بیری ئەوە ئەکاتەوە ئەگەر ناتوانێ زیاتر بەندەیی بکا، خۆ ئەوە ئەتوانێ کە لە سەر ئەم بەندەییەی کە پێی گەیشتوە پایەدار بێ و بمێنێتەوەو درێژەی پێ بدا. بۆیە ئەڵێ : (الله أكبر) خوا گەورەترە لەوەی کە ئینسان هەر جارێك ئاوەها بکا و لەسەری نەڕوا.. بۆیە جارێکیتر سەر ئەنێتەوە سەر زەوی، هەروەك جاری پێشوو، ئەم جارە کە لەوەش بووە وە دوبارە ئەڵێ : خوا لەوە گەورەترە، تەنانەت لەوەش گەورەترە کە ئینسان پایەداری بێ و هەرچی لە هێزو توانایدایە بیکا، هەر خواش لەوە گەورەترە، وا ئەزانێ حەقی بەندەیی بۆخوا ئەدا کردووە . بۆیە هەڵئەسێتەوە ڕەکعەتێکی تریش هەر بەو جۆرە ئەنجام ئەدا .. دوای ئەوە ڕەکعەتی دووەمی ئەنجام دا، دائەنیشێ لە حزووری خوادا، جا سوپاس ئەکا لە خوا، هەروەها لە چەند کەسێکیتر کەبوون بەهۆی ئەوەی بگاتە حزووری خواو ئائەم دوعاو سکالایە بکا، سوپاس ئەکاو پاشان دوایەمین قسەو ڕازو نیازی خۆی ئەکا و ئەچێتەوە بۆ لای خەڵکی و نوێژەکەی تەواو ئەکا .

## کورتەیەك لە مانای (التحیات)

(التحیات لله) : هەموو ڕێزلێنانەکان، هەموو ئیحترام گرتنەکان، بۆ خوان .

(والصلوات) : هەموو نوێژو سکاڵاو دوعاکان، ئەوانیش هەر بۆ خوان، نەبێ هەر بۆ خوا بکرێن .

(والطیبات) : هەموو کردەوە پاکو خالیصەکان بۆ خوان، هەر نەبێ بۆ ئەو ئەنجام بدرێن .

جا ئەوەی کە ئەوترێ (التحیات لله) هەموو ڕێزلێنانو ئیحترامەکان، هەموو ( تەعزیمەکان ) بۆ خوان، ئەواتەن کە لە پێشا ئەنجام دراون، وەك(بە پێوە و بە حاڵەتی بەندەیی وەستان)، (ڕکوع بردن)، (سجود بردن)، (وتنی ئەو کەلیمانەی کە وتراون). هەروەها هەر جۆرە قەدردانییەکی‌ترکە ئینسان ئەتوانێ بیکا، جا ڕوونی ئەکاتەوە هەموو ئەوانە بۆخوان،کەسی‌تر نیە ئینسان ئەو تەعزیمانەی بۆ بکا جگە لە خوای گەورە .

بە جۆرێکی تریش ئەکرێ ئەو تەحیاتە بخوێنرێتەوە : (التحیات المبارکات، والصلوات الطیبات لله)،کە زۆر لەگەڵ ئەوی ترفەرقی نیە، هەر کامیان بێ دروستە .

بەم جۆرە قەدردانی لە خوای ( متعال) ئەکا، کە تەوفیقی داوە بۆئەوەی بگاتە ئەم پلەیە . پاشان بیری ئەوە ئەکاتەوە ئەگەر پێغەمبەری

خوا ( محەممەدی کوڕی عبداللە ) (علیە الصلاة والبرکات) نەبوایە -کە بەرنامەی هیدایەتی لەلایەن خواوە وەرگرتو هێنای - خۆ ئەم ڕێی نە ئەکەوت لەم نیعمەتە گەورەیە . بۆیە سوپاسی زۆری ئەویش ئەکاو دوعای خێری بۆ ئەکا .

جا لەدڵی خۆیدا حازری ئەکا بۆئەوەی بەکوڵ دوعاکەی بۆبکا، وەك چۆن کەسێك باسی پیاوێکی ساڵح ئەکا ، جا لەناکاو ئەڵێ : ئەی خوا دەرەجەت بەرز کاتەوە، ئەی خوا ڕەحمەت پێ بکا، ئەی خوا بتبەخشێت .. لێرەدا یادی پێغەمبەری خوا ئەکاتەوە، بۆیە وەك لە بەرامبەریەوە بێ پێی ئەڵێ :

(السلام علیك أیها النبي ورحمة الله وبرکاته) : ئەی پێغەمبەری خوا، خوا سەلامەتت کا، خوا ڕزگارت کا لە هەر دەردو ئافاتێك کە دێتە ڕێی ئینسان ، لە بەرزەخا، لە بەینی مردن تا قیامەتا، هەروەها لەڕۆژی قیامەتدا، ئەی خوا بتپارێزێ لە هەر ئافاتێك، خوا بەزەیی بێتەوە پیاتا و، ئەوەی خێرە بۆتی بکا، یاخوا خوا بەرەکەت و خێرە بەردەوامەکانی خۆی برژێنێ بەسەرتا .

دوای ئەوە بیری ئەوە ئەکاتەوە کە بەندە ساڵحەکانی خوایش چ ئەوانەی لەمەوپێش بوون و ڕێیان بۆ ڕۆشن کردۆتەوە، چ ئەوانەی ئێستا هەنو هاوکاری لەگەڵ ئەکەن بۆ بەندەیی، ئەوانیش حەقیان

بەسەریەوە هەیە، ئەبێ دوعای خێر بۆ ئەوانیش بکا لەگەڵ خۆی، بۆیە خۆیو ئەوانی تریش کە خەریکن نوێژ ئەکەن ئەڵێن :

(السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین) : خوا ئێمەیشو بەندە ساڵحەکانیش سالم بکاو بمانپارێزێ لە هەر شتێ کە ئافاتەو زەرەرو زیانە لە دونیاو لە قیامەتیشدا. کاتێ ئەڵێ : (السلام علینا) خوا ئێمە سالم و رزگار کا، خۆیوئەوانەی ئێستا هەن لەسەر زەویدا ئەگرێتەوە، چ ئەوانەی لەبەرچاون، چ مەخلوقی تری وەك مەلائیکەو غەیری ئەوانیش. کاتێ ئەڵێ : (و علی عباد الله الصالحین) کەسانیترکە لەمەو پێش بورن و رێیان رۆشن کردۆتەوە ئەگرێتەوە . ئەوە سوپاس کردن لەو کەسانەی حەقیان بەسەریەوە هەیە .

جا دوای ئەوە باسی ئەو نیعمەتە گەورەیەو ئەو پلەوپایە بەرزە ئەکا کە پێی گەیشتوە و ئەڵێ: (أشهد أن لا إله إلا الله) : مانای ئەوەیە دوای ئەوە خۆم بۆم رۆشن بۆتەوەو هیچ گومانو دوو دڵیم نەماوە، ئێستا بۆ خەڵکیش روون ئەکەمەوە کە بزانن : ( لا إله إلا الله) بزانن هیچ فەرمانڕەواو فەریاد رەسێك نیە بێجگە لە (الله).

(وأشهد أن محمدا رسول الله) : هەروەها شایەتی ئەدەمو ئەویشم لێ رۆشن بۆتەوەو ئیقراری پێ ئەکەم کە (محمد) فرستادە و نێرراوی خوایە .

جا باشتر ئەوەیە کە بلێین : (وأشهد ان محمدا عبده ورسوله): شایەتی ئەدەم کە ـ محەممد ـ بەندەو فرستادەی خوایە .. بەندەی خوایە، دیارە لەوپەڕی پلەی بەندەییدا بووە، لە هەمووکان زیاتر بەندەیی بۆ خوا کردووە، هەروەها ڕەسول و فرستادەی خوایە، ئەو ناردویەتی بۆئەوەی ڕێگای بەندەیی بۆ ئێمە ڕۆشن کاتەوە .

تائێرە سوپاسگوزاریی کردووە لەوانەی حەقیان بەسەریەوە هەیە، باسی ئەوەی کردووە کە گەیشتۆتە چ پلەیەکی بەرز.

ئێستا کاتی ئەوەیە دوا قسەی خۆی بکاودوای ئەوە بڕاوەتەوە بۆ لای خەڵك، جا ئاوا دەست پێ دەکات:

(اللهمَّ صَلِّ على محمد وعلى آل محمد، كما صَلَّيْتَ على إبـراهيمَ وعلى آلِ إبراهيم) يا (اللهم صلِّ على محمد وعلى آل محمد كما صليت على آل إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد). یانی : خوایە ڕەحمەت، هاوڕێ لەگەڵ ئیحتیرامو ڕێزلێنان برژێنە بەسەر محمددا، هەروەها بەسەر لایەنگرانو پەیڕەوانی محمددا، ئەوانەیهەر وەك ئەوان ڕێیان ڕۆشن کردۆتەوەو بەرنامەی بەندەییان گەیاندۆتە خەڵك، مەردومیان هێناوەتە سەر ڕێگای بەندەیی خوا، هەرووەك ڕەحمەتو ڕێز لێنانت ڕژاند بەسەر ئیبراهیم و پەیڕەوو دۆستانی ئیبراهیم دا، بە ڕاستی تۆ (حمید)ی، شایستەی ئەوەی قەدردانیت لێ بکرێ، هەروەها (مجید)ی، خێرو بەرەکەتت زۆر زۆرەو گەورەی .

(وبارِكْ على محمد وعلى آل محمد كما بارَكْتَ على إبرهيمَ وعلى آل ابراهيمَ إنك حميد مجيد) :

بەرەکـەت برژێنـە بەسـەر محمـدو لایـەنگرانی محمـددا، هـەروەك بەرەکەتت رژانـد بەسـەر ئیـبراهیمو لایـەنگرانی ئیـبراهیم دا، چـونکە بەڕاسـتی تـۆ شایسـتەی ئـەوەی قـەدردانیت لێ بکـرێ، تـۆ خێـرو بەرەکەتو گەورەیی زۆرت هەیە..

جاکە ئەمەی ووت، هەم دوعای خێری کردووە بۆ پێغەمبەری خوا، هەم بۆ ئەوانەی هاورێی ئەو بوون تا قیامـەت ، ئەوانـەی رێگایـان بـۆ خەلك رۆشن کردۆتەوە..

دوای ئەوە ئەگەر زانی دوعای تـریش بکـا، ئـەوە خـۆ زۆر باشـە، دوعا بکا بـۆ خـۆیو هـەموو موسـولمانانیتر، ئەگـەر هـەر ئـەیتوانی لەبەرئـەوەی کـە نەخوێنـدەوارە ، یـەکێك لـەو دوعایانـەی کەلـە حەدیسـەکاندا بەیان کراون بکا، ئـەتوانێ کەلیمەیـەك یـا دوو کەلیمـە لای کەسەکەی لەبەر بکاو چەندجارێك بیانلێتەوە، وەك ئەوەی بلێت: (اللهمَّ اغْفِرْ لَنا وارْحَمْنا) : خوایە لە گوناهەکانمان چاوپۆشی بکـەو رەحمان پێ بکە .

دوای ئەوە کە ئاخرین قسـە و رازو نیازی خۆی کرد، ئـیتر ئـەرکی خۆی تەواو بووەو، کاتی ئەوەیە بگەرێتـەوە بـۆ نـاو خـەلك .. بۆیـە دوای ئەوە ئەبێ لابکاتەوە بەملاو بەولادا، جا لە کاتێکدا لادەکاتەوەو

لـە حـزوری خـوادا ئەگەڕێتـەوە ـ وەك ئـەوەی کەلـە سـەفەرێك ئەگەڕێتەوە ـ ئەبینێ خەلکی لەملاو لـەولاوە هـەن، ئەگـەریش کـەس نـەبوو خـۆ مەلائیکـە هـەن، خۆموسـولمانیتر لـە جیهـانیتر هـەن.. سەلامیان لێ ئەکاو ئەحوالیان ئەپرسێ، ئەلێ:

(السـلام علیکم ورحمه الله .. السـلام علـیکم ورحمـه الله) : خـوا سەلامەتتان کات، خوا بتان پارێزێ لە هەرچی ئافاتو دەردو بەلایە .. خوا ڕەحمتان پێ بکاونەوەی خێرە بۆتانی بکات، (لەسـەفەر هاتۆتـەوەو ئەبێ سەلامیان لێ بکا)..

دیارە عادەتەن کەسێك کە ئـەڕوا بـۆ سـەفەر بۆلایگەورەیـەك، کاتێ هاتەوە خەلکی چاوەڕوانی ئـەوەن شـتێکیان بـۆ بهێنـێ، ئـەمیش ئەمەی بۆ هێناونەتەوە،(دوعای خێروسەلامەتیورەحمەتیخوایی).

## حیکمەتی چەند بارەبونەوەی نوێژەکان لە شەو و ڕۆژدا

بەو جۆرە دوعاو سکالاو پاڕانەوە بەباشترین شێوە ئـەنجام ئـەداو. ئامادەیی پەیدا ئەکا بۆئـەوەی دەسـت بکـا بـە جێبـەجێکردنی ئـەرکو بەندەیی لەدوای نوێژی بەیانی تا ئەگاتە نیوەڕۆ، بەلام لەو بەینەدا لەبەر ئەوەی ڕەنگە غەفلەت هاتبێ بەسەریا، یا گرفتو دەردیسـەری بۆ پەیدا بووبێ، لەبەر ئەوەی هەمیشە ئینسان نیازی هەیە بەوەی خوا کۆمەکی

بکا، ئارادەیەکیش ناتەواوی و لاوازی ڕووی تێکردووە ، لەبەر ئەوە واجبە لە نیوەڕۆیشا نوێژێکی تر بکاو دوعاو سکالایەکی تر بکا ـ ئەمجارە زیاتر لە ڕەکعەتەکانی بەیانی ئەکا، چوار ڕەکعەت ئەکا، لە ڕەکعەتی دووەمەدا کاتێك کە تەحیاتەکەی گەیاندە ئەو جێگایەی هەموو ئەزانن، هەڵئەستێتەوەو ئەڵێ: ( الله أكبر) خوا گەورەترە لەوەی کە ئەمە بەس بێ بۆی، هەروا بڕۆمو بەجێی بهێڵم، بۆیە دوو ڕەکعەتی تر ئەکا، پاشان تەواوی ئەکا، لا ئەکاتەوەو سەلام ئەکا لەملاولای خۆی .

هەروەها دوای ئەوە ماوەیەکی تری پێ چوو نیازی ئەبێ بەوە نوێژێکی تر بکا، لە بەشی دوایی ڕۆژدا، بۆئەوەی کارو چالاکی ئەو ڕۆژەی بە دوعاو سکالا دوایی پێ بێنێ، هەروەها لە سەرەتای شەویشدا نوێژی مەغریب ئەکا، پاشان لەکاتی خەوتنیشا نوێژی عیشا

بەو جۆرە کە ژیانی بە نوێژو دوعاو سکالا دەستی پێکرد، هەرواش بەدوعاو سکالاو نوێژ دوایی پێ بێنێ .

## حیکمەتی نوێژی ویتر لەشەودا

جا دوای ئەم پێنج نوێژە کە فەرزن‌و بەبێ ئائەمانە ئینسان ناتوانێ بەندەی خوابێ، پاش نوێژی خەوتنان نوێژێکی تریش هەیە کە ئەکرێ رەکعەتێك بێ، ئەکرێ سێ رەکعەت بێ، ئەکرێ پێنج رەکعەت بێ، تا یانزە بێ بەشێوەی تاك، واتە : پێنج، حەوت، نۆ، یانزە..

ئەگەر ئەو نوێژەش بکات ئەوە زۆر باشە ، پێی ئەوترێ نوێژی (وتر) یانی (تاك) چونکە رەکعەتەکانی تاکن، یا یەکە، یا سێیە، یا زیاترە لەوە، جا ئەکرێ پێش لە خەوتن بیکا، ئەکرێ لە نیوە شەودا خەبەری بێتەوەو بیکا، ئەکرێ لە ئاخری شەویشەوە یا لە پارشێوا بیکا، چونکە نوێژێکی گەورەیەو باش ئەوەیە ئەگەر ئینسان نوێژە سوننەتەکانی تر نەکا، بەلایەنی کەمەوە ئەم نوێژە بکا ..

ئاوا رۆشن بووەوە کە نوێژ سکاڵاو دوعایە، گەورەترین‌وکاملترین شێوەیە بۆ سکاڵاو دوعاو پاڕانەوە لە خزمەت‌وحزووری خوای گەورەدا.

جا ئەگەرئینسان ئەو پێنج نوێژە فەرزەی بەئاگایی و دەرك‌و فەهمەوە کرد، ئەوە خوای ( متعال ) قەولی پێ داوەکە هیدایەتی بداو تەوفیقی بدا کە بە ڕێگای بەندەییدا بڕوا، ئەگەر ئەو نوێژانەی ئاوا کرد، ئیتر هەمیشە دڵی لای خوایە ولە خوا غافڵ نابێ، ئەگەریش جارجار غەفڵەتێك بێت بەسەریا زۆرکەم ئەبێت‌و زوونەکەوێتەوە بیری خواو

خۆی نەجات ئەدا و ئەگەڕێتەوە بۆلای خوا. کاتی وایش هەیە زیاتر لەم نوێژانە ئینسان لە هەندێ کاتا مەجبور ئەبێ دوعایەك بکا ئەوەش هەر دروستە .. کاتی وا هەیە ئینسان توشی بەلآیەك ئەبێ، تووشی خەتەرێك ئەبێ، هەرچەندکاتی نوێژیش نیە، دیارە ئەگەر بڕوا لەوکاتەدا بۆی بکرێ دوو ڕەکعەت نوێژ بکاو لەو نوێژەدا بپاڕێتەوە، ئەوە زۆر باشترە .. پێغەمبەر (علیه الصلوات والبرکات) هەر کاتێ تووشی گرفتو دەردەسەرییەك ببوایە لە نوێژدا دوعاو پاڕانەوەی ئەکرد لە لای خوا، ئەگەریش بۆی ڕێك نەکەوتایە نوێژ بکا، دەستی ئەکرد بە دوعا کردنو پاڕانەوە لەلای خوا، بەلآم ئەبێ بزانین کە نوێژ گەورەترین دوعایە کە سودی زۆری لێ ئەکەین .

## پوختەیەك لە باسی (زەکات)

دووەمین کردەوەیەك کە ئینسانی موسوڵمان ئەبێ ئەنجامی بدات، زەکات دانە . لە زۆرێك ئایەتی قورئاندا ئەم باسە کراوە کە دووکردەوەی گەورە هەن حەقەن ئەبێ ئینسان دوای ئیمان هێنان ئەنجامیان بدات ، یەکێکیان نوێژە بەو جۆرەی باسمان کرد، دووەمیان زەکاتە ..

زەکات بە مانای ئەوەیە ئینسان لەو سەروەتو ماڵەی هەیەتی، ئەوەی زیادە لە پێویستی خۆی، بیدا بەوانەی ئیحتیاجیان پێیەتی . ئاوا

کردەوەیەك نەبێ بەهۆی ئەوەی بڕوا بەرەو کەماڵ و زیاد بکا. هەروەك چۆن گیایەك یا دارێك مەوادی غەزایی پێ درا زیاد نەکاو بەرەو کەماڵ نەڕوا.

مەعنای زەکات لە ئەصلا یانی زیادکردن و چوون بەرەو کەماڵ جا لەبەرئەوە کە بەخشینی ماڵ ئەبێ بەهۆی گەشەکردنی ئینسان، ناوی نراوە (زەکات). دیارە ئەوکارە بەستراوە بە ئیمانی ئینسان ولە خوا ترسانییەوە، چونکە ئینسان خۆی دەزانێ چ شتێکی لێ زیادە لەنیازی خۆی ، تا بیدا بەوانەی کە نیازیان پێیەتی . چونکە نابێ ئینسان خۆی دەست بکات بە خۆشگوزەرانی و ڕابواردن و بڵێ ئیتر هیچم لە خۆم زیاد نیە تا بیدەم بە خەڵکی .. ئەبێ ژیانەکەی خۆی دوور بێت لە خۆشگوزەرانی و ڕابواردن، جا لەوکاتەدا شتی زۆری ئەبێ کە لە خۆی زیادئەبێ و، ئەبێ بیداتە ئەم و ئەو.

## پوختەیەك دەربارەی ڕۆژوو

لێرەدا ئیشارەیەکی کورتیش بکەین بە ڕۆژوو. حەقیقەتی ڕۆژوویش پێویستە ئینسانی موسوڵمان بیزانێت ئەویش ئەوەیە کە ئینسان لە ڕێگای بەندەیی‌دا ئەبێ ئەوەی خوا پێی خۆشە، ئەوە بکات، ئەوەی خوا پێی ناخۆشە نەیکات و لێی بەدوور بێت . جائەوە زۆر زەحمەتە ئینسان وای لێ بێ خوا چی پێ خۆشە ئەوە بکا و چی پێ ناخۆشە ئەوە

نەکا، واتە (تەقوا)ی بیێت، لەبەرئەوە خوای گەورە دەورەی داناوە بۆ ئینسان لەو دەورەیەدا بەشداری ئەکات و، لە فەجرەوە تاخۆر ئاوا بوون خۆی دوور ئەگرێ لەو شتانەی زۆر دڵی پێوەیەتی و ئیشتیهایەتی ، لەو شتانە دووری ئەکا ، تا فێری تەقوا بیێت، لەمانگەکانی تر و ڕۆژەکانی تردا لە خوا بترسیّ، لەکاتێکدا خۆراکی هەیە ، خواردنەوەی هەیە ، ئەتوانیّ لەگەڵ هاوسەریا نزیکی بکا، بەلام لەبەر خاتری خوا، لەتەواوی ڕۆژدا خۆی دوور ئەگریّ لەوانە ، بەهەوەس و ئارەزوی خۆی کار ناکات .. جا کە مانگێك لەو دەورەیەدا کاریکرد فێری ئەوە ئەبێت لە مانگەکانی تریشدا لەوەی خوا مەنعی ئەکا دووری بکاو، ئەوەی کەخوا ئەمری پیّ ئەکا ئەنجامی بدا. بەو جۆرە (متقی) بەرەو خۆشبەختی و سەعادەتی هەمیشەیی ئەڕوا..

جا ئەو دەورە یەك مانگییە بەشی یەك ساڵی ئەکا، دوایی کە ئەندازەیەك لاوازی ڕووی تیّ کردەوە، دەورەکە دوبارە ئەبێتەوەو مانگێکیتر دێتە پێشەوە و ئەچێتەوە ناو دەورە و خۆی بەهێزئەکات بۆ یانزە مانگیتر.

# بەشی پێنجەم

## کورتە باسێك دەربارەی پایەکانی ئیمان

- کورتەباسێك دەربارەی فریشتەکان
- کورتەباسێك دەربارەی کتێبە ئاسمانیەکان
- کورتەباسێك دەربارەی پێغەمبەران (علیهم السلام)
- هەندێ لە صیفەتەکانی خوای پەروەردگار
- دەربارەی قەزاو قەدەر

## کورتە باسێك دەربارەی فریشتەکان

پێشتر وتمان خوای گەورە هەروەك خالق و دروستکەری ئەم جیهانەیە، هەرخۆی فەرمانڕەواشیەتی، خۆی دروستی کردوە، خۆیشی فەرمان ڕەوایی ئەکات. لەزۆرێك ئایەتی قورئاندا هاتووە کەئاسمانەکان و زەی وئەوەی لەبەینیاندایە لەشەش ڕۆژگارا دروستی کردورن، پاشان تەختی فەرمان ڕەوایی گرتە دەست و دەستی کرد بە ئیدارەکردنی کاروباری ئەم جیهانە .

جا هەروەك فەرمانڕەوا خۆی لە مەرکەزێکدایە و بەملاوبەولادا ناچێ، بۆ ئەوەی گەورەیی و فەرمانڕەوایەکەی بپارێزێ ، بۆ ئەوەی فەرمانەکانی بگەیەنێ بە هەموو لایەکدا، کەسانێك هەن بەدەوروبەریا، ئەو فەرمان دەرئەکا، ئەوانیش ئەیگەیەنن بەهەموو لایەکی وڵاتەکەیدا ، هەروا خوای گەورەش ـ وَلَهُ الْمَثَلُ الأَعْلَىـ جۆرێك مەخلوقی دروست کردووە بەناوی (مەلائیکە)، فەرمانەکانی ئەسپێرێ بەوان و ئەوانیش ئەیگەیەنن بە هەمورلایەکدا. بەوجۆرە فەرمان ڕەوایەکەی تەحقیق ئەبێ و فەرمانەکانی لە هەموو لایەکدا حازر ئەبن .

کەلیمەی مەلائیکە خۆی بەمانای (پەیامبەران)دێت ، یانی ئەوانەی پەیام لەلایەك وەرئەگرن و ئەیبەن بۆ لایەکی تر. (ملائکە) بەهەمویان ئەوترێ ، بەیەکێکیان ئەوترێ (مەلەك). مەلەك یانی کەسێ پەیام لەلایەك ئەبات بۆ لایەکی تر. لە ئایەتدا باس کراوە کە خوا مەلائیکەی

کردوون بە فرستادە ،کەلیمەی (رسل) یانی فرستادە (نێرراو). باسی کردووە هەر کاتێ یەوێ فەرمان و ئەمرێ دەرکا بۆلایەك لەم جیهانەدا، ئەیسپێرێ بەیەکێك یا چەند ئەفەرێك لەوفریشتانە ، ئەوانیش ئەیبەن و ئەیگەیەننە جێگای خۆی . بەو جۆرە فەرمان رەوایەکەی سەرئەگرێ و، جیهان بەو جۆرە ئیدارە ئەکا.

ئەو مەلائیکانە هەندێ سیفاتیان هەیە کەقورئان باسیان ئەکا ، ئەبێ ئینسان بیان زانێ و باوەری پێیان بێ ، بۆ نمونە : ئەوە کە لە فەرمانی خوا دەرناچن . هەرچییەك ئەو ئەفەرموێ ئەوە ئەکەن ، غەیری ئەوە هیچی تر ناکەن . هەر پەیامێکیان پێ درا بێنت ئەیگەیەنن . بەندەی بەرێز و رێزلێنراوی خوای گەورەن ، کاریان هەمیشە بەندەیی و عیبادەت و طاعەت وفەرمان بەرداریە لەفەرمانی خوا. لەکاتێکەوە خوا ئینسانی دروست کرد، دەستوری دا بەوان کە لەخزمەتی ئینساندا بن، ئەو شتانەی کە پێویستیەتی بۆی ئامادە بکەن ، یارمەتی بدەن تا بتوانێ عیادەت و بەندەیی خوا بکا، ئاسانکاریی بۆ ئینسان بکەن تا بیانوی ئەمێنێ ، بۆ هیچ شتێك دانەمێنێ، ئەڵێ ئیمکانیات لەبەر دەستمدا ئەبوو، ئەمتوانی بەندەیی بکەم .

ئەوانیش هەر لەو سەرەتایەوە قبوڵیان کرد، ئیتاعەتیان کرد، لەوکاتەوە وان لەخزمەتی ئینساندا، هەرشتێك پێویست بێت بۆ ئینسان ئامادەی ئەکەن ، یەکێك لەو شتانەی ملائیکە ئەیکا بۆ ئینسان ئەوەیە

کە هەردوو کەسیان مەئموری یەك ئینسانن ، لەلای ڕاست و چەپی‌یەوە هاونیشنن، هەرشتێ کە ئەیکا ئەینوسن و یاداشتی ئەکەن، بۆئەوەی لەدواییدا بەپێی ئەوە موحاسەبەو موحاکەمەی بکرێ لەدادگای خوادا..

هەروەها یەکێکی ترلە ئەرك وکاری مەلائیکە ئەوەیە ئەگەر ئینسان ڕێی ئیمان و عەمەلی صالحی گرت، ئەوان کۆمەکی ئەکەن، بەئیزنی خواتەئیدی ئەکەن . ئەگەر ئیمانی زۆر زۆر بەهێز بوو، ئەوان زۆرتر پشتی ئەگرن ، تاڕادەیەك کە لەکاتی شەڕکردن لەگەڵ کافرەکاندا دێن بۆ پشتیوانی لێکردنی، ئەوانیش دەست ئەوەشێنن، شەڕئەکەن، لە دوژمن ئەکوژن . هەروەك لە قورئاندا باس ئەکا لە غەزای (بەدر)دا کاتێ بڕوادارەکان لە پلەیەکی بەرزی ئیماندا بوون، (هەزار نەفەر) لەمەلائیکە بە دەستوری خوای گەورە هاتن و، کۆمەکی‌یان کردن، دەستیان کرد بەلێدانی دوژمن .

هەروەها ئەگەر کەسێکیش ڕێی کوفرو ئەنجامدانی کردەوەی خراپ بگرێتە بەر، خوای (متعال) شەیتانێ ئەکا بە مەئموری کە لەگەڵیایێ بۆ ئەوەی زیاتر بیبا بەڕێی گومڕاییدا..

لە قیامەتیشدا ئەو مەلائیکە بەڕێزانە کە بەندەی بەڕێزی خوان، مەئمورن و، وەزیفەو مەسئولیەتیان هەیە ، خەڵکەکە کۆئەکەنەوە وحازریان ئەکەن لە دادگای خوادا . پاشان ئەوان ئامادەن بۆئەوەی

ڕەئیسی دادگا، قازی دادگا ـ کە خوای گەورەیە ـ هەرفەرمانێك دەرئەکا ئەوان جێبەجێی بکەن .

بۆ نمونە : کاتێك ئەمر دەرئەکا بۆئەوەی موئمینەکان ببرێن بۆ بەهەشت و، کافرەکان ببرێن بۆ جەهەننەم، ئەوانن ئەیانبەنە پێش خۆیان و هەرکامێکیان دەبەن بۆ جێگای خۆی، چەند نەفەرێکیش لەوان مەئموری ئازاردانی کافرەکانن لە جەهەننەمدا، هەندێکی تریشیان مەئموری میوانداریی و پەزیرایی کردنن لە موئمینەکان لە بەهەشتدا.

## کورتە باسێك دەربارەی کتێبە ئاسمانیەکان

پێویستە موسوڵمان بڕوای بە کتێبەکانی خوا هەبێت ، هەروەك پێشتر بەکورتی ئیشارەمان بۆ کرا. نەبێ ئیمانی بەوە بێت کە بۆ هەر ئوممەتێك خوای (متعال) بەرنامەی هیدایەت و ڕێنمایی ناردووە، لەهەر جێ و زەمانێکا کە پێویست بووە، بۆئەوەی خەلکی عەقیدەیان بەو جۆرە بێ کە خوای گەورە ئەیەوێ . بۆ ئەوەی ڕێ و ڕەوشتی ژیانیان وابێ کە خوا ئەیەوێ ، بۆئەوەی ڕێگای عەمەلی صالح بگرن، ئەو کتێبانەی ناردووە، کە هەموشیان یەك بەرنامە بوون، ئەویش ئەوەیە ئینسان بەندەی خوا بێت . هەروەك لەوەو پێش باسمان کرد.. فەرقێك کە بوویانە ئەوە بووە کە یەکێکی بەعەرەبی ناردووە ، یەکێ تر بە

عیبری ، یا بەکوردی، یا بەتورکی، یا بەفارسی، بەغیری ئەوانەش، [1] بۆ هەر ئوممەتێك بەزمانی خۆیان کتێبی ناردووە ، تا ئـەو خەڵکـە بکەونـە سەر رێی هیدایەت ، بۆیە ئوممەت نەبوە کە پێغەمبەری بۆ نەنێرری.

## کورتە باسێك دەربارەی پێغەمبەران (علیهم السلام)

هەروەها ئەبێ بڕواداریمانی بیێ بە پێغەمبەران، بەوهلـــیداً )، یـانی : ئەوانـەی خەبـەری وەحـی و بەرنامـەی هیدایـەتیان لەلایـەن خـواوە بۆهاتووە . هەروەها بـە (مرسلین) یـا (ڕُسـسر) واتـە : ئەوانـەی خـوا ناردونی بۆئەوەی بەرنامەی هیدایەت بگەیەنن بەخەڵك و رێی بەندەیان بۆ ڕۆشن بکەنەوە . ئیمان هێنـان بـەوانیش ئەوەیـە بـاوەڕی بیـێ کـە پێغەمبەری خوا بوون، فرستادەی ئەو بوون ، ئەوەی وەریانگرتوە حەق بووە ، بەرنامەی هیدایەت بووە لەلایـەن خـواوە . شـتێك نـەبووە لـە لایەن شەیتانەوە بیێت، یاخەیاڵی خۆیان بێ . ئەوانیش توشـی کـەمترین خەتاو هەڵە نەبوون، بەتایبەتی‌لەومەجالەدا کەئەو شـتەیان وەرگرتـوە ، یانی ئەو بەرنامەی هیدایەتە .

---

[1] مامۆستا ناصر بەرەحمەت بێ بەپشت بەستن بـەو ئایـەتی ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾ و ئایـەتی ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِ﴾ بـڕوای شـەواوی هـەبوو بـەوە کـە هـەموو نەتـەوە رەسەنەکان بەزمانی خۆیان پەیامی ئاسمانیان بۆ هاتووە و پێغەمبەریان بووە.(دەزگای بەرهەم).

هەروەها ئەبێ باوەڕ و یەقینی بێ کە هەرچییەك پێیان دراوە بێ ئەوەی لێی زیاد و کەم کەن گەیاندویانە و تەبلیغیان کردووە . هەروەها لە گەیاندنەکەشدا هیچ کەمتەرخەمییان نەکردوە .

جگە لەوەش ئەبێ باوەڕی بەوە بێ کە ئەوان ئیمام و پێشەوا و سەرمەشق بوون بۆئەو خەلکەی لە زەمانی خۆیانا بوون، هەروەها بۆ هەر بەندەیەك بیەوێ ڕێگای بەندەیی خوا بگرێ تا ڕۆژی قیامەت . ئەوان کە بەرنامەی هیدایەتیان لەخوا وەرگرتوە وگەیاندویانە بەخەڵك، موکەللەف بوون خۆیان یەکەم کەسێك بن عەمەلی پێ بکەن ، واجب بوە لەسەریان بین بەپێشەواو بۆ خەلکی ڕۆشن کەنەوە کەئەبێ چۆن ئیمان بێنن بەکتێبەکانی خوا و ئەبێ چی بکەنو چی نەکەن؟ جالەسەر مەشق و پێشەوایی‌یەکەیاندا بەباشترین شێوە پێشەوایی‌یان کردوە و ئەرکی بەندەیی خۆیانیان بەجێ هێناوە ، بەلآم لەبەر ئەوەی کە بەشەر بوون جارجار توشی هەلە بوون، بەلآم عەمەدی نەبووە، بە قەصد نەبووە، دوای ئەویش کە تووشی بوون خوا وەحی بۆ ناردونو بەیانی کردووە کە ئەوە هەلەبووە، ئەبوایە ئاوا بوایەو وا نەبوایە، ڕۆشنی کردۆتەوە کەحەق کامەیە ، ئەوەی دروستە کامەیە، ئەوانیش زوو لە هەلەی خۆیان دەستیان کێشاوە و هاتونەتەوە سەر ئەو شتەی خوا بەیانی کردوە .. هەلبەتە هەلەکانیش زۆر کەم بوون ، ئەمەش پێچەوانەی ئەوە نیە کە ئەوان پێغەمبەر بوون و ئەو دەرەجە بەرزانەیان

هەبووە .. یانی وا نەزانرێ کە نابێ کەسێك پێغەمبەر بێت لـە شـتێکا هەڵە بکا، چونکە هەرچییەك بێت بەشەرە ، حیکمەتیشـی تیـابووە کـە خوا بەو جۆرە بەخەڵکی نیشان داوە تـا بزانـرێ ئـەوانیش بەشـەرن، بۆئەوەی خەڵکی نەیانکـەن بەفەریادرەسـی خۆیـان و توشـی شـەریك قەرار‌دان بۆ خوا نەبن ..

لـەلایەکی تریشـەوە ئەم حاڵـەتە خەتەری تیا نـەبووە، چـونکە دوای ئەوە کە توشی هەڵە و(اشتباه) بوون خوا وەحی بـۆ نـاردون، رۆشـنی کردۆتەوە کـە ئـەوەی دروسـتە شـتی تـرە و ئـەوە نیـە .. بـۆ نمونـە: مەسەلەیەك کە لە غەزوەی (بەدر)دا رووی دا، کاتێ پێغەمبەری خوا بە مەشوەرەتی هەندێ لەیارانی رەئی لەسەر ئەوە بـوو ئـەو کافرانـەی وا ئەسیر کرابوون، نەکوژرێن و، لە بەرانبەری فیدیە ئازادیان کـەن، کـە ئازادیان کـردن هەنـدێ ئایـەتی قورئـان نـازڵ بـوون، هەرەشـەی زۆر توندیان تیا بوو، بەیانی ئەوە کرا کە نە دەبوو ئەو کارە بکرێ ، حـەق نەبوو وا بکەن، بەلای خواوە کارەکە زۆرکـارێکی گـەورە و نابـەجێ بووە، بەڵام ئێستا خوا لێیان ئـەبوورێ و عـەزابیان نـادا، لەبەرئـەوەی ئیجتیهادیان کردووە و، بەعەمدی نافەرمانی خوایان نەکردوە، لەرووی هەڵەوە توشی ئەوکارە بوون، نەئەوەی بیانەوێ نافەرمانی خوا بکـەن .

ئەفەرموێ : ئەوا ئێستا چاوپۆشی ئەکەم ، عەفووتان ئەکەم ، بەڵام جارێکیتر ئاوا کارێك ئەکەن[1] ..

جالێرەدا شتێك زۆر پێویستە گرنگی پێ بدرێ و دیققەتی تیا بکرێ، ئەویش ئەوەیە کە ئیمان بە مەلائیکە و کتێبەکان و پێغەمبەران (علیهم الصلاة والبرکات) ئەوە نیە تەنها ئینسان بزانێ مەلائیکە هەن بەو جۆرە کە وتمان، کتێبەکان هەن، یا پێغەمبەران نێرراون ، بەوجۆرەی باس کرا، ئەوە تەنها زانستێکە و ئیمانی پێ تەواو نابێ . بۆ نمونە : ئیمان بە مەلائیکە ئەوەیە ئینسان بزانێ خوا فەرمانڕەوای ئەم جیهانەیە، فەرمانەکانی بەهۆی مەلائیکەوە ئەگەیەنێ بەهەموو لایەکی جیهاندا. هەروەها مەلائیکە خەریکن کردەوەکانی ئینسان تۆمار ئەکەن .. لە قیامەتیشدا مەئموری خوان بۆ ئامادەکردنی خەڵك لەدادگای خوادا. لە بەهەشت و جەهەنەمیشدا هەرکام مەئموریەتێکیان هەیە . جا ئەبێ ئینسان ئائەوانە بزانێ و تەسلیمی ئەوانە بێ، پاشان زیاتر ئیحساسی مەسئولیەت بکا لەبەرانبەری خواوە کەئەو هەموو نەزم و تەشکیلاتەی رێك خستوە بۆئەوەی ئینسان بەندەیی بکا.

---

[1] - مەبەستی مامۆستا ناصر ئەوەیە کە دەبوایە ئەو دیل و ئەسیرانە بکوژرانایە. چونکە ئایەتەکانی ٦٦-٧١ الأنفال ئەوە ئاگەیەنن گومانی زۆر بۆ ئەوە دەچی کە بۆ هیچ پێغەمبەرێك نیە دیل بگرێ تا تواناو دەسەڵاتێکی ئەبێ و پێگەو هێزی مەیدانی ئەبێ. ئایەتی ﴿ما کان لنبی أن یکون له أسری حتی یثخن فی الأرض﴾ لەم واتایە هەڵدەگرێ . (دەزگای بەرهەم).

هەروەها ئیمان بە کتێبەکان ئەوە نیە ئینسان بزانێ ئەوانە کتێبی خوان . بەڵکو ئیمان ئەوەیە ئینسان تەسلیمیان بێ ، چی لەکتێبەکانیدا هەیە دوای ئەوە کە ئەیزانێ عەمەلی پێ بکا ، بەپێی ئەوانە بژی، ئەگەر نا زۆر باشیش بزانێ کەلەو کتێبانەدا چیهەیەو بزانێ کتێبی خوان ، بەڵام عەمەلیان پێ نەکا، ئەوە ئەو زانینە تەنیایە هیچ بەکەڵکی نایەت .

هەروەها ئیمان بەپێغەمبەرانی خوا (علیهم صلوات الله وبرکاته) ئەوەنیە ئینسان بزانێ ئەوانە پێغەمبەربوون ، یا تەنانەت ئەوەش نیە بڵێ: خۆشم ئەوێن و ئیحترامیان ئەگرم ، قەدەمیان ئەنێمە سەرچاوم و ئەو جۆرە شتانە .. نەخێر؟ ئیمان بەپێغەمبەران ئەوەیە دوای ئەوە ئینسان زانی ئەوان بەرنامەیان لەلایەن خواوە وەرگرتوە و هێناویانە و خۆیان بورن بەسەرمەشق و، ڕێیان ڕۆشن کردۆتەوە بۆ خەڵك، دوای ئەوە تەسلیمیئەوە بێ، لە ژیانیدا پەیڕەوی ئەوان بێ، تەنها شوێن ئەوان کەوێ ، پێشەواو ڕابەری ترغەیری پێغەمبەران قبوڵ نەکا، تەنانەت ئەگەر زانایەکی مۆئمین و لەخوا ترس ئەکا بەپێشەوا و ڕابەری خۆی، ئەبێ لەبەر ئەوە بێ کە بەشوێن پێغەمبەرانی خوادا ئەڕوا، لەبەرئەوەی شوێن کەوتووی ئەوانە ئەم شوێنی ئەکەوێ ، چونکە لە حەقیقەتدا تەنها لەوحاڵەتەدا شوێنی ئەوان کەوتووە..

کەوابوو ئیتر ناتوانێ شوێن قانون و بەرنامەی تر بکەوێ، ناتوانێ ئیتاعەت لەوحاکمانە بکات کە بە قانونی خۆیان و هەواو هەوەسی خۆیان حوکم ئەکەن. ئەگەرکەسێ ئیتاعەت و فەرمانداریی لەوحاکمانە

کرد و،کەوتە شوێن ئەو قانون و بەرنامانەی کە هەوەس و هەوای ئەو حاکمانەن، ئەوە ناتوانێ بڵێ کە من ئیمانم هەیە بە پێغەمبەران. ئەگەریش پێغەمبەرانی خۆش بوێ و بزانی کە پێغەمبەرن ، یا بزانێ ئەوکتێبانە کتێبی خوان بەکەڵکی نایەت و، خوای (متعال) لێی قبوڵ ناکا .

## هەندێ لە صیفاتەکانی خوای پەروەردگار

شتێکی زۆر گرنگ هەیە بەبێ ئەوە ئینسان ناتوانێ بەندەی خوابێ و عیبادەتی بکات، ئەوەش ئەبێ ڕۆشن بێ و، ئینسان بەتەواوی تەسلیمی بێت، تابتوانێت ڕێگای بەندەیی خوا بگرێت.. ئەویش ئەوەیە بزانێ کە خوای (متعال) لە هەموو شتێ خەبەرداره، هەموو شتێ ئەزانێ، قودرەت و توانای هەیە بۆ ئەوە هەر شتێ بیەوێ بیکا و ئەنجامی بدا، هەرکارێ بیکا بەجێگەیەو دروستە، کاری نابەجێ و بێ هوودە ناکا. بۆیە لەسەر ئەو ئەساسە پێش ئەوەی ئەم جیهانە دروست بکا، نەخشەیەکی ڕژاندوە بۆ دروست کردنی، هەروەك چۆن ئەگەر لەجێگایەکا بیانەوێ نەخۆشخانەیەك دروست کەن، لە پێشدا موهەندیسێ نەخشەو گەڵاڵەی ئەڕێژێ و دیاری ئەکا، دوایی میعمارو وەستا وکرێکار دێنە سەری و بەوجۆرە کە نەخشەی بۆ ڕژاوە دروستی ئەکەن و نەخشەکە پیادە ئەکەن.. هەروەها خوای گەورەش - وَلِلّـه

الْمَثَلُ الأَعْلَىَ- پێش ئەوە ئەم جیهانە دروست بکا، نەخشەی بۆ ڕژاند، دیاری کردکە چەند ئەوع مەخلوقات دروست بکـا ، لەھەرئـەوعێك چەند فەرد بەدی بێنیٚ و چەند شتیش خەلق بکا، هەروەها دیاری کـرد چەند ڕوداونەبیٚ ڕووبدات، چی ببیٚ، چی نەبیٚ؟ هەروئەوەی کە ئەبیٚ دیاری کرد، ڕۆشنی کردەوە کە چی دێتە دی ، چـیناپەتە دی ، چـی نەبیٚ، چی نـابیٚ ؟ جـادوای ئـەوە دەسـتی کـرد بـە پیـادەکردنی ئـەو نەخشـەیە ..

خوای گەورە لە پێشا ناوی بەدی هێنـا، دوای ئـەوە ناوەکـەی‌کرد بە دوو کـەڵ ، جـا لـە دوکەڵەکـە ئاسمانـەکان و زەوی و ئـەوەی لـە بەینیاندایـە دروسـت کـرد.. ئاسمـان و زەوی لـەدوو مەرحەلـە و ڕۆژگاردا، ئەو شتانەش کەوان لە زەویدا- لە گیا و دارو درەخـت و خێرات و بەرەکاتیٚ تیایدا هەن وکەژو کێوەکـان - ئەمانـەش لەچـوار مەرحەلەی تردا، لەچوار ڕۆژگاری تردا، هەمووی بووە شـەش ڕۆژ ، شەش ڕۆژی خوا کە هەر ڕۆژێکی زەمانێکی زۆر دوور و درێژە .

## دەربارەی قەزاو قەدەر

جـا هـەر لـەو نەخشـەو گەڵاڵەیـەدا ئـەوەی دیـاری کـردوە کـە مەخلوقێك دروست بکا، هـەم (عـیلم و زانسـت )ی ببـیٚ و، خێـرو شەڕو، دروسـتو نادروسـت لەیـەك جیـا بکاتـەوە، واز لـەوی تریـان

بهێنیَ، ئەو مەخلوقەش ئینسانە . بەڵام هەروەك لەپێشا وتمان خـوای گەورە باسی كردووە كە هەر خۆیەتی هەرشتێك ئەكا ، كارێك بكـریَ هەر خوا ئەیكا، ئینسانیش هەروەك ئـاگر و بـەرد و دار و هەرشـتێكی تر، سەبەبێكە لە سەبەبەكانی خـوا، خـوا بـەهۆی ئـەوەوە هەنـدیَ لـە كارەكانی ئەنجام ئەدا. بەڵام مانای ئەمەش ئەوە نیە ئینسان ئیرادەی نیە، یا هەروەكوئاگر وایە و بیَ ئیرادەیە، یا سەبەبێكەو خوا شتی پیَ ئەكا بە بیَ ئەوەی كەخۆی ئیرادەی بیَ .. نەخێر لەعەینی ئـەوە دا كەئینسـان سەبەبێكە لەسـەبەبەكانی خوا، دارای (ئیرادە )شە، ئەتوانیَ لە دوو ڕێگا یەكێكیان هەڵبژێریَ و لەوی تریـان دەسـت بـەردار بـیَ، بـوَی هەیـە ڕێگای خۆشبەختی یا بەدبەختی بۆخـۆی هەڵبـژێریَ. وانیـە كـە خـوا زۆری لیَ بكا ، بەزۆر بەرێگایەك لەو ڕێگایانەدا بیبا..

جا بۆئەوەی ئەمە ڕۆشـن ببێتـەوە، بـا یـەك دوو نمونـە بێنینـەوە و ڕوونی كەینەوە كە چۆن ئینسان هەم سەبەبە بۆ كارەكانی خـوا، هـەم ئیختیارو ئیرادەشی هەیە و بە ئیرادەی خۆیەتی‌كە ڕێگایەك هەڵئەبـژێریَ : فەرز ئەكەین ڕۆژی قیامەتە ، خوای گەورە خـەڵكی بـانگ كردۆتـە دادگا ، یـەك نەفـەر كەكابرایـەكی بـە تفـەنگ كوشـتووە ڕاگرتـوە ، خەریكە مەحكەمەی ئەكا و پرسیاری لیَ‌ئەكا كە بۆچی ئـەو كابرایـەت كوشت؟ ئەویش جواب ئەداتەوە كە من خۆم شتێكم نەكردوە، مەگـەر من سەبەبی كارەكانی تـۆ نـیم؟ منـیش وەك هـەر شـتێكی تـر مەگـەر

سەبەب نیم؟ تۆ - واتە خوای گەورە - کارت کردووە و من سەبەبی تۆبووم، ئیتر من چ گوناهێکم هەیە؟ خوای گەورەش ئەفەرموێ: باشە تۆ سەبەبی کاری منی، بەلاّم شتێکی ترهەیە: خۆمن لەسەر ئەوە مەحکەمەت ناکەم کە کابرایەك کوژراوە، ئەوەتا کەسێکی تریش لەولاوەیە ئەفەریکی کوشتوە، بەلاّم لەبەرئەوە کە قەسدو(تەصمیمی) نەبووە بیکوژێ مەحکەمەی ناکەم، چونکە لە دەستی دەرچووە کەکوشتویەتی، بۆیە تۆلەسەرئەسلّی کوشتنەکە موحاکەمە ناکەم، لەسەر شتێکی‌تر موحاکەمەت ئەکەم، تۆ لەکاتێکدا پەنجەت نابووە سەر ماشەی تفەنگەکە، خەریك بوو بیتەقێنی و بیدەی لەسەر دلّی کابرا و بیکوژی، ئالەوکاتەدا ئەتزانی من چیم بریار داوە؟ چیم تەقدیرکردووە کە تۆ بیکەی؟ ئەتزانی کە من نوسیومە ئەبێ تۆ ئەم شەخسە بکوژی؟ دیارە کابرا عەرز ئەکا: نەخێر، لەوکاتەدا ئیحتیمالی ئەوە هەبووە کەتۆ (مقدر)ت کردبێ من ئەو شەخسە بکوژم، ئیحتیمالی ئەوەش هەبوو کە (مقدر)ت نەکردبێ و قەرار وابێ کە من نەیکوژم. واتە پەنجا لە سەد ئیحتیمالی کوشتن بووە، پەنجا لە سەد ئیحتیمالی نەکوشتن، لەوکاتەدا من نەمئەزانی کەچی بریار دراوە. جا خواش ئەفەرموێ: ئەی کەی بۆت روون بوەوە؟ کابرا ئەلّێ: من تفەنگم تەقاند،کابرا کەوت و چوومە سەری، تەماشام کرد سارد بۆتەوە، ئەو

کاتە من زانیم کە(مقدر) بووە و بڕیار بووە کە من ببم بەسەبەب بۆ کوشتنی ئەم شەخسە..

جا خوای (متعال) ئەفەرموێ : کەوابوو لە کاتێکدا وا تۆ خەریك بووی ئەو بکوژی، لەلات ڕۆشن نەبووە چی بڕیار دراوە و لە دواییدا مەعلوم بووە کە قەرار بووە تۆ بیکوژی، تازە تۆ کاری خوتت کردبوو، تۆئەوەی وا لەدەستت هاتبوو ئەنجامت دابوو، ئیتر شتێك نەمابوو بۆ تۆکە بیکەیت؟ دەی من لەسەر ئائەوە موحاکەمەی تۆ ئەکەم ،کە لەوکاتەدا وا نەتئەزانی کە کوشتنو نەکوشتن کامیان بڕیار دراوە، کەچی تۆ کوشتنت هەڵبژارد بۆ خۆت، من ئەڵێم : بۆ لە دوو ئیحتیمال، لەو خێر و شەڕە، تۆ شەڕەکەیانت بۆ خۆت هەڵبژارد؟ خۆ شەریعەت و بەرنامەو کتێبەکەی من حازر بوو، لەوکاتەدا بەرنامەی هیدایەت پێی ووتی کە : مەکوژە، لە جیاتی ئەوە کە کوشتنەکە هەڵبژێری، نەکوشتن هەڵبژێرە. پێشتر وترابوو: مەکوژە، دروست نیە .. تۆ بۆچی لە بەینی کوشتن و نەکوشتندا،کوشتنەکەت هەڵبژارد؟ من لەبەر ئەو هەڵبژاردنە تۆ موحاکەمە ئەکەم و تۆڵەت لێ ئەکەمەوە، تەنانەت ئەگەر دوای ئەوە کە تۆکوشتنت هەڵبژارد و تفەنگت تەقاند، نەشی کوشتایە، ئێستا هەر موحاکەمەم ئەکردی، چونکە تۆ ئەو نیەت وعەزمە و ئەو هەڵبژاردنەت لەدەست هات و ئەوەت ئەنجامدا..

بەم جۆرە ڕۆشن ئەبێتەوە کە ئینسان لە ڕێگای بەندەیی خوادا ئەوەی لەدەستی بێت ئەوەیە (تەصمیم) بگرێ کاری باش بکات، لە خراپە دوور بێت ، لەوکاتەدا کە نیەت دێنێ ڕۆشن نیە کە خوا چی دیاری کردوە .

کەوابوو ئینسان بۆخۆی موختارە و بەمەیلی خۆیەتی‌کە یەکێك لەو دوولایە هەڵئەبژێرێ . دوایی کە هەڵیبژارد ئەوکاتە ڕۆشن ئەبێتەوە خوا چی کردوە، ئەم تەکلیفی خۆی و مەسئولیەتی خۆی ئەنجام داوە، لەسەر ئەو تەکلیف و مەسئولیەتە خوا موحاکەمەی ئەکا، جەزاو پاداشت یا سزای ئەداتەوە..

پاشان ئەبێ ئەوەش بزانین مادام ئینسان بۆ بەندەیی دروست کراوە، ئەبێ هەمیشە بیری لای ئەوە بێت تەکلیفی چیە ، ئەبێ چی بکا و چی نەکا؟ چی خوا ئەفەرموێ بیکە ، ئەوە بکا . ئەوە مەکە، نەیکا . مانای ئەوەیە ئەوەی خێرە (تصمیم) بگرێ بۆی و هەڵیبژێرێ، ئەوەش کە شەڕە لێی دوور کەوێتەوە، ئەوەی‌لەدەستی ئەم بێت تەنها (تصمیم) گرتنەکەیە، بەڵام بەئەنجام گەیشتنی خێرەکە یا شەڕەکە، ئەوە لەقودرەتی ئەما نیە و خوای گەورە ڕێکی دەخا.. دەی کاتێ وابوو ئیتر ئینسانی موسوڵمان نابێ بیری بەلای ئەوانەوە بێ کە چی ئەبێ و چی نابێ ، چی ڕوودەداو وچی ڕوونادا؟ ئەوە بسپێرێ بەخوای (متعال). ئەوهەر بیری بەلای ئەوەوە بێت کە ئەبێ چی بکا و چی‌نەکا؟ کەسێك

کەرێگای بەندەیی خوا نەگرێتە بەر، زۆرێك لەو گیروگرفت و دەردەسەرییە ـ لەوانەی کە دەردی سەر و گیروگرفتی زاهیرین ـ دێتە ڕێگای ..

ئەبێ ئینسانی موسوڵمان هەر بیری لای ئەوە بێت کە خوا تەکلیفی لێ کردووە ئیمان و عەمەلی صالحی بێت، بەڕێی خێرا بڕوا، لە کوفرو کردەوەی ناپەسەند، لە کاری شەڕ، دووریی بکا . ئەو خەریکی ئەرکی خۆی ئەبێ، جا ئیتر چی ئەبێ و چی نابێ، ئەوە بەدەست خوایە .. ئەگەر خوا قەراری دابوو خێری تووش بێت، نیعمەت و ئیمکاناتی دونیای دەست کەوێت، ئەوە دەستی ئەکەوێت، ئەگەر هەزارهەزار دوژمنی هەبێت . ئەگەر قەراریشی دابوو توشی دەردەسەری و چەرمەسەری و گیروگرفت بێت، حەتمەن دێتە ڕێگەی، ئەگەر هەزار پشتیوانیشی هەبێت لە دونیادا. ئەگەر قەراری دابوو لەسەر دەستی دەستەڵاتدارێك بکوژرێ، حەتمەن ئەکوژرێ ئەگەر هەزار نۆکەریشی بۆ بکات . ئەگەر خوا قەراری دابوو بەدەستی کەس نەکوژرێ، هەزار دوژمنیشی بێ و بکەونە هەوڵ بۆ ئەوەی لە بەینی بەن، حەتمەن ناتوانن زیانو زەرەری پێ بگەیەنن‌و ناکوژرێ .. عومرو ڕزقو، خۆشیو، ناخۆشیو، ئیسراحەتو، دەردیسەرو، گیروگرفتو، خێرونیعمەتو، نەبوونی نیعمەت، ئەمانە هەموو لەدەست خوادان .. ئینسان ئەبێ هەر بیری لای ئەوە بێت چی‌بکا و چی نەکا؟ ئەوەی کەچی ئەبێ و چی

نابیّ؟ خۆشی نەبیّ یا ناخۆشی؟ مردن نەبیّ یان نا؟ لە دەست دەرچونی مالّ و سەروەت نەبیّ یان نا؟ هەرچییەك نەبیّ و هەرچییەك نابیّ، ئەوانە هەمووی عەلاقەی لەگەلّیا نیە، حەق نیە بیریان لیّ بکاتەوە . ئەوانە بەدەست خوان، خوا بڕیاری دابیّ بێن، حەتمەن ئەبن ، بڕیاری دابیّ نەبن، نابن ئینسان نەبیّ دلّی ڕەحەت بیّ، دلّی ئارام بگریّ ، ئەگەر ڕێگای بەندەیی خوا بگریّ، خەریکی ئەدای وەزیفەی بەندەیی بیّ ، ئەوەی بۆی دیاری کراوە حەتمەن پێی ئەگا، ئەوەش بۆی دیاری نەکراوە، بۆی قەرار نەدراوە ، هەزار جاریش لە ڕێگای بەندەیی لابدات دەستی ناکەویّت . ئەگەر شتێکت دەست کەوت ئەوە هی خۆت بووە، خوا هەر لە ئەوەڵەوە بڕیاری داوە و حەتمەن دەست ئەکەویّت .. ئەگەر شتێکیش لەدەستت دەرچوو، ئەوە بزانە هەر قەرار نەبووە هی تۆ بیّ، بۆیە لەدەستت دەرئەچیّ، چونکە ئەگەر هی تۆ بوایە حەتمەن هی تۆ ئەبوو، ئەبوو بەنسیبت .. جا کەوایە ئیتر ئینسانی موئمین ئەبیّ لەوپەڕی دلّئارامی وهێمنیدا خەریکی ئەدای مەسئولیەت و بەندەیی بیّ ، بیری بەلای ئەوەوە نەبیّ چی ئەبیّ و چی نابیّ و چۆن ئەبیّ و چۆن نابیّ، ئەوانە بسپێریّ بەخوا، تەوەککول بکا لەسەر خوا.. هەمیشە خەریکی ئەوە بێت کە ئیمانی زیاتر و زیاتر بکا ،کردەوەی چاك ئەنجام بدات ـ کە ئەمانە سەبەبی خۆش بەختین ـ دوای ئەوە، خوای گەورەش خێری دونیاو ئاخرەتی بۆ فەراهەم ئەکا.

ئەمە ئەوەیە پێی ئەوترێ ( قەزاو قەدەر)، پێویستە ئینسانی موسوڵمان ئیمانی پێ بێنێ، بەبێ ئائەمە ناتوانێ بەندەیی خوابکا . ئەگەر بیری بەلای ئەمەوە نەیێت و تەسلیم نەبوو بێت لە دڵیا، سەری لێ ئەشێوێت، لە جێی ئەوەی وەزیفەی بەندەیی بکا، لە جێی ئەوە عیبادەت بۆ خوا بکا، هەر لەبیری ئەوەدا ئەبێ چی ئەبێ و چی نابێ، عیبادەت و بەندەیەکەی لەدەست دەرئەچێ ، سەبەبی خۆشبەختی لەدەست ئەدا، هیچێکیش ناتوانێ بگۆڕێ ، چونکە خوای (متعال) هەر بڕیارێکی داوە هەر ئەوە ئەبێ وغەیری ئەوە نایێت ، جا لە ئاوا کاتێکدایە کە ئیتر ئینسان لە هیچ دەسەلاتدارێك ترسی نایێت ، ئەزانێ کە غەیری خوا کەسی تر ناتوانێ کەمترین زیان و زەرەرێکی پێ بگەیێنێ ، هەروەها دڵنیا ئەبێ کە هیچ خێر و چاکەیەك لە دەستی کەسی تردا نیە، هەمووی هەر لە دەستی خوادایە ، هەر ئومێدی بەوە، ترسی هەر لەوە و ترسی لەغەیری ئەو نیە ، خەفەت و ناخۆشی ڕوو ناکاتە دڵی ئینسان ، بەدڵێکی ئارام و پڕ لە هێمنییەوە خەریکی جێبەجێکردنی ئەرکی بەندەیی ئەبێ ، ڕێی بەندەیی ئەگرێ ، ئەڕوا بەرەو خۆشبەختی و بەختیاری هەمیشەیی

# بەشی شەشەم

## هەندێ لە ئەرکە ڕەوشتیەکانی سەرشانی موسڵمان

- ئەو ڕەوشتە ناپەسەندانەی لە سورەتی (القلم) باسکراون: •سوێند خواردنی زۆر •سوکی و نزمی •شکاندنی کەسایەتی خەڵکی •قسە هێنان و بردن •ڕێگرتن لە خێرو چاکە •دەست درێژی •بەدڕەفتاری •توند تەبیعەتی •نامۆیی لە خەڵکی •سەرکەشی و لە خۆبایی بوون.
- ئەو ڕەوشتانەی لە سورەتی ( المعارج) باس کراون: •ڕاڕایی ئینسان •بەردەوامی لەنوێژ •بەخشینی ماڵ و دارایی •بڕوا بە دوارۆژ •لە سزای خوا ترسان •داوێن پاکی •دەست پاکی و سپاردە پارێزی •شایەتی دانی هەق.

- **هەندێکی‌تر لە ڕەوشتە باشەکان:**

• چاکە لەگەڵ دایك و باوك • بەخشینی مافی خزم و هەژار و لێ‌قەوماو • ماڵ بەفیڕۆ نەدان و میانڕەوی لە سەرفی ماڵ • برِوا بە ڕۆزیدەری خوا • دوور کەوتنەوە لە داوێن پیسی • نزیك نەکەوتنەوە لە کوشتنی‌ناهەق • نزیك نەکەوتنەوە لە ماڵی هەتیوان • بەڵێن پارێزی و وەفاداری • دادخوازی لە کێشانەو پێوانەدا • دڵنیا بوون لە زانیاری • فیزنەکردن.

- **ئامۆژگاریەکانی لوقمان بۆ کوڕەکەی:**

• نوێژ • فەرمان بەچاکەو قەدەغەی خراپە • خۆڕاگری • لەخۆبایی نەبوون • خاکی بوون • دەنگ نزمی.

- **بەشێ لە تەفسیری سورەی (الفرقان):**

• یەواش بەزەویدا چوون • مامەڵەی چاك لەگەڵ نەفامان • شەوبێداری • ترس لەسزای دواڕۆژ • گەواهی نەدانی ناهەق • گوێ نەدان بەنەفامان • تێڕامان لە ئایەتەکانی خوا • دوعای خۆشویستنی هاوسەرو نەوە • دوعای بونە سەرمەشق.

- بەشێ لە تەفسیری سورەتی( الحجرات):

٠فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ٠ڕێزگرتن لە پێغەمبەرانی ٠ بڕوانەکردن بە فاسقان ٠گاڵتە نەکردن بەیەکتر ٠ناووناتۆرە نەوتن ٠خۆلادان لە زۆرێ لە گومان ٠سیخوڕی نەکردن ٠غەیبەت نەکردن.

- پوختەیەك لە تەفسیری سورەتی (العصر)
- پوختەیەك لە ئەحکامی سورەتی(الاحزاب):

٠هاوسەرانی ڕابەران و چۆنیەتی ڕەفتاریان ٠ئەحکامی ژنی بڕوادار لە هەڵس وکەوت و پۆشتەییدا.

- هەندێ لە ئەحکامی سورەتی( النور)
- گرنگی دوبارەکردنەوە لە پەروەردەکردندا

## هەندێ لە ئەرکە ڕەوشتیەکانی سەرشانی موسڵمان

دوای ئەوەی ئیمان و باوەڕی ئینسان بەم جۆرەی باسکرا دامەزرا و ئیمان لە دڵیا جێگیر بوو، ئیمان بەخوا، بە مەلائیکە، بەکتێبەکانی خوا، بەپێغەمبەران، بەڕۆژی قیامەت، دوای ئەوە عەزمی کردکە ڕێگای بەندەیی خوا و ئیمان و عەمەلی ساڵح بگرێتە بەر لەژیانـدا، بڕیاری دا هەر لەو ئیتاعەت بکا، بەندەیی و عیبادەت هەر بۆ ئەو بکـات ، داوای کۆمەکیشی لێ کرد ، بەتایبەت نوێژی کرد، لە خـوا پاڕایەوەکۆمـەکی بکا، بۆئەوەی بتوانێ ئەو پەیمانەی بباتە سـەر... دوای ئەوانە زۆرێـك لەتەکلیف ومەسـئولیەتەکان ڕوونەکەنـە ئینسـانی موسـوڵمان، کەلـە قورئـان و، لـە حەدیسـەکانی پێغەمبـەری خواوکردەوەکانیـدا (علیـه الصلوات والبرکات) دیاری‌کراون و ڕۆشن کراونەتەوە،ئەبێ یەك لـە دوای یەك ئەوانە بزانێ وئەنجامیان بدا، لەژیاندا بەڵێن بدا لەگەڵ ئەوانە بژی .

ئەبێ ئەوەش بزانین کە ئەو ئەرك و تەکلیفانە هەموو ژیـانی ئینسـان ئەگرنەوە ، مەسئەلەیەك، یا حاڵەتێك لەژیانی ئینساندا نیە کە لە لایەن خواوە بەرنامەو قانونی بۆ نەهاتبێ ، شتێك نیە ئینسان بتوانێ لەوشـتەدا لەغەیری خوا بەرنامە و یاسا وەرگرێ وئیطاعەت لە غەیری خوا بکا .

بۆیە پێویستە لێرەدا باسی چەند دەستوور و حوکمێك بکەین کـە لـە قورئانا باس کراون . ئەو دەستورانەی زۆر پێویستن موسوڵمان بیانزانێ

وعەمەلیان پێ بکا، چونکە تەنها بەکارکردن بەوانەو شوێنکەوتنی فرمانی خوا لەوانەدا، ئینسان ئەبێتە بەندەی خوا و ڕێگەی ئیمان و عەمەلی صالح ئەگرێتەبەر. بەبێ ڕیعایەتی ئەوانە و، بێ کارکردن بەوانە، ناکرێ پێی بوترێ بەندەی خوا.

ئەوەش بزانین کە دینی خواو دەستور و فەرمانەکانی یەك دینە و یەك بەرنامەیە، ناکرێ ئینسان هەندێکی قبوڵ بکا وهەندێکی قبوڵ نەکا . ئەوانەی وا هەندێ لەفەرمان و دەستورەکانی خوا قبوڵ ئەکەن و هەندێکی تری قبوڵ ناکەن ، یا موبالاتی پێ ناکەن، خوا لێیان قبوڵ ناکات . ئەوانە بەندەی خوانین ، نابێ دڵ خۆشکەن بەوەی ئەگەن بەخۆشبەختی و بەختیاری لە دونیا وناخیرەتدا.

جا لە زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئاندا ئەو دەستوور و فەرمانانە بەیان کراون . چەند دانەیەکیان لە چەندین ئایەتی قورئاندا باس کراون کە ئێمە باسیان ئەکەین تا بزانرێ ئەبێ چی بکرێ و ئەبێ چی نەکرێ ..

## ئەو ڕەوشتە ناپەسەندانەی لە سورەتی (القلم)دا باس کراون

لەسورەی (القلم) دا خوای گەورە دوای ئەوەی ڕێنمایی پێغەمبەرەکەی ئەکا بۆئەوەی هەر لەسەر ڕێی بەندەیی و تەبلیغ و گەیاندنی بەرنامەی خوا بمێنێتەوە، گوێ نەدا بەقسەی ئەم وئەو لە دوژمنانی خوا دڵی خۆش ئەکا و پێی ئەفەرموێ :( وَإِنَّكَ لَعَلى خُلُقٍ عَظِيمٍ): بە ڕاستی تۆ خوو ڕەوشتێکی زۆرگەورەت هەیە، لەسەر خووڕەوشتێکی زۆر بەرزو دامەزراوی . دوای ئەوە بەیانی ئەو خووڕەوشتە ناپەسەندانە ئەکا کە دوژمنەکانی ئەوهەیانە ، لەو ڕەوشتانەی کە ئینسانی موسوڵمان ئەبێ هەوڵ بدا لێیان دوور بێت ، خۆ ئەگەر شتێ لەوانەی تێدا بێ ئەبێ بە زووترین کات تێ کۆشێ بۆئەوەی خۆی لێیان دوورخاتەوە..ئەفەرموێ:

(وَلَا تُطِعْ كُلَّ حَلَّافٍ مَّهِينٍ. هَمَّازٍ مَّشَّاءٍ بِنَمِيمٍ. مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ. عُتُلٍّ بَعْدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ . أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ. إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ):

* یەکێك لەوانە(زۆرسوێندخواردن)ە، خوای گەورە وشەی ﴿حَلَّافٍ﴾ی بەکارهێناوە واتە ئەوکەسەی زۆرسوێندئەخوا.. زۆرسوێندخواردن نیشانەی ئەوەیە ئەو ئینسانە شەخسیەتی نیە، خۆشی بە خۆی ئەزانێ کە دارای شەخسیەت نیە ، دارای نرخ و ئیعتیبار نیە . لەبەرئەوە کە خۆی بڕوا بەخۆی ناکا، وائەزانێ خەڵکی تریش بڕوای

پێ ناکەن، هەرقسەیەك کە لە دەمی دەردێت لەگەڵ سوێندێکا لەدەمی دەردێت ..

جا کاتێك ئەوە لای خەڵك دەرکەوت‌و خەڵك وای ناسی، هەروا کەخۆی هەیە ، ئەوەی هەروا لێی ئەترسا هەر ئاوا دەرنەکەوێ ، تووشی ئەوە ئەبێت کە خەڵکی تریش ئەیزانن .

ئینسانێ شەخسیەتی هەبێ، قەدرو قیمەتی هەبێ، لە قسەکردنیا دەرنەکەوێ، پێش لە هەموو کەس خۆی بە خۆی بڕوا ئەکا، خۆی بە خۆی ئیعتیمادی هەیە، هەر ئەو بڕواو ئیعتیمادەی کە خۆی بەخۆی هەیەتی لای خەڵکیش مەقبوڵ ئەبێ ، خەڵکیش بڕوای پێ ئەکەن، ئیعتیمادی پێ ئەکەن، قبوڵ ئەکەن کە دارای شەخسیەتێکە، ئیتر نیازی نابێ بەوەی لەگەڵ هەر قسەیەکدا سوێند بخوا.. بەڵێ جارجار زۆرکەم ئینسان نیازی ئەبێ بەوەی بۆ ڕۆشنکردنەوەی شتێك سوێندێ بخوا، بەڵام ئینسانی موسڵمان زۆرکەم ئەوکارە ئەکا .

* یەکێکی ترلەو خووڕەوشتە پیسانە کە هەر لەپاڵ ئەوەدایە، (زیلللەت وسوکی و نزمی)یە . نە بە مەعنای (تواضع) چونکە ئەوە صیفەتێکی باشە .

زیلللەت ئەوەیە ئینسان لەبیری ئەوەدا نەبێت کە ئەگەر لەگەڵ خوادا بێ و پەیوەندی لەگەڵ ئەوبێ، سەربەرز و سەرفرازە . لەبەرئەوە کە دڵی خاڵی‌یە لە ئیمان، هەمیشە حازرە بۆ ئەم و ئەو سەردانەوێنێ،

گەردنی زیللەتیان بۆ شۆڕکا ، نۆکەریی بۆئەم و ئەوبکا، تا وای لێ دێت شەخسیەتی بۆ نامێنێ شەخسیەتی لە ژێر پێی ئەمۆئەمودا لەدەسەلآتداران و زۆرداران ورد دەکرێ، هەروەك ئەبینین زۆرێك هەن لەوپەڕی زیللەت و سەر شۆڕیدان، بەجۆرێك هەر دەستەلآتدار و زۆردارێك ئەوەی بیەوێت پێیان ئەکات بەبێ ئەوەی کەمترین هەست بکەن بە شەخسیەت و نرخ وقەدرو قیمەت بۆ خۆیان، ئائەوە لەخوورەوشتی ئیسانی موسولمان دوورە، موسولمان لە عەینی ئەوەداکە تەوازوعی هەیە، لەعەینی ئەوەدا کە (تکبر) ناکا و خۆی هەلناکێشێ بەسەر ئەم و ئەودا، لەعەینیئەوەدا ئیحساسی سەربەرزی و عیززەت ئەکا– چونکە ئیمانی لە دلآیە، وائەزانێ کەسێك عەلاقەی بەخواوە بێ و لەگەل خوادا بێ، سەربەرز و سەرفرازە، حازر نابێ بۆ غەیری خوا سەر دانەوێنێ – (تواضع) یشی هەر بۆ بڕوادارو برایانی ئیمانیی خۆیەتی .

بەلآم نیسبەت بە کافرانی دوژمن، بەتایبەت نیسبەت بە حاکمانی زالم، هەرگیز قبول ناکا سەری زیللەت و شۆڕی دانەوێنێ . حازر نابێ کەمترین زیللەت و سەرشۆڕی لە خۆیدا نیشان بدا، بەلکو زۆر زۆر بەعیززەت و زۆر زۆر بەسەرفرازیەوە لەگەلیان مامەلە ئەکا ، خۆی لەوان بەرزتر ئەگرێ ، هەرگیز ئیجازە بەخۆی نادا بۆ لەحزەیەکیش خۆی لەوان نزم تر بگرێ ..

* یەکێکی ترلەوخووڕەوشتە خراپانە ئەوەیە هەمیشە کاری ئـەوەیێ شەخسیەتی خەلکی ورد بکا، واتە ﴿هَمَّازٍ﴾ە ، بەهـەر جۆرێـك بـۆی ڕێك کەویێ هەوڵبدا بۆئەوەی شەخسیەتی خەلکی بـیێ ئیعتیبـار و بـیێ نرخ و بیێ قەدر و قیمەت بکات، لەبەر ئەوەی خۆی شەخـسیەتی نیـە، لەبەرئەوەی شەخـسیەتی خۆی وورد بـووە، حـەز ناکـا کەسـی تـریش ببینیێ کە دارای شەخسیەتێك بێت . ئەو کەسە بە جۆرەها فێلێ وحیلـە ونەخشەو پیلان هەوڵ ئەدا بۆئـەوەی شەخـسـیەتی کەسـانیێ کـە دارای شەخسیەتن ورد بکاو لە بەینیان ببات .

* دوای ئـەوە قورئـان خووڕەوشـتی ناپەسـەندی (قسـە هێنـان وقسەبردن) باس ئەکا.﴿مَّشَّاءٍ بِنَمِيمٍ﴾ واتە : هەمیشە بەرنامەی ئەوەیـە قسەی ئەم ئەبات بۆئەو و، قسەی ئەو دێنێت بۆ ئەم ، بۆئەوەی کە لـە بەینیان بدات، فەسـاد بخاتـە بـەینی خەلکـەوە ، کۆمـەڵ تێـك بـدات، بەجۆرێك کەس بڕوا و ئیعتیمادی بەکەسی تر نەمێنیێ ..

* یەکێکی تر لەو خووڕەوشتە پیسانە ئەوەیە کە ئەفەرموێ : ﴿مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ﴾، هەمیشە کاری ئەوەیە مەنع ئەکا لـەوەی خێـر بگـا بەوانـەی نیازیان پێیەتی، نیعمەت و ئیمکانات بگاتە دەست ئەوانەی موحتـاجن . ئەگەر سەروەتی هەیە مەنعی ئەکا، دریغی ئـەکا ، نایـدا بـەم وبـەو لـە نیازمەندان، ئەگەر کەسی تریش سەروەتی هەیە پێی ئـەڵیێ و داوا ئـەکا

کە نەیدا بەم و بەو، بەخشش نەکا، ئینفاق نەکا ، زەکات نەدا، هەروەك خۆی کە شتێ نادا بەکەس .

* یەکێکی ترلەو ڕەوشتە پیسانە ئەوەیە کە ئەفەرموێ ﴿مُعْتَدٍ﴾، واتە : تەجاوزکارە (لادەرە)، لە سەرزەکانی بەندەیی و مەسئولیەت هەمیشە تێ ئەپەڕێ، حازر نیە لە هیچ کاتێکدا لە سنوری بەندەیی و عیبادەتی خوادا بمێنێتەوە، هەمیشە لە فکری ئەوەدایە لە ژێر باری مەسئولیەت دەرچێ..

* یەکێتریش لەو خووڕەوشتانە ئەوەیە کە ﴿أَثِيمٍ﴾ە . هەمیشە خەریکی ئەنجام دانی ئەوکارە ناپەسەندانەیە کە ئینسان لە چوون بەرەوکەماڵ و چوون بەرە و سەعادەت و خۆشبەختی، ئەگێڕنەوە و ئەیخەنە دواوە وناهێڵن بەرەو پێش بڕوا..

* ﴿عُتُلٍّ بَعْدَ ذَلِكَ﴾ ئەمەش یەکێکی ترە لەو خوو ڕەوشتە ناپەسەندانە . بەد ئەخلاق وتوند تەبیعەتە . کاری ئەوەیە هەرشتێك بەرە وخۆی بکێشێ ، فکری بەلای‌کەسێکی ترەوە نیە ، هەر شتێك ببێت تەنها بۆخۆی ئەیبات ، هەر خۆی لەبەر چاوە ..

* یەکێ تر لە و خوو ڕەوشتە ناپەسەندانە، ئەوەیە کە ئەفەرموێت : ﴿زَنِيمٍ﴾ە. یانی بەناحەق خۆی لکاندووە بەخەڵکەوە و لە خەڵك نیە .. وەك حاکمە زاڵمەکان ، ئەوانە هەموو (زَنیم)ن، لەخەڵك نین، نە

لەگـەڵ دەردوگرفتـی خەڵکـدا بەشـدارن، نـە لەگـەڵ خواسـت ونارەزووەکانی خەڵکیدان . نە لە خۆشیی خەڵکـدا شـەریکن ، نـە لـە ناخۆشـیدا . ئەمـەولیان ئەوەیـە خـەڵکی بگـەن بـە خۆشـبەختی، نـە خۆماندوونەکـەن بۆئـەوەی خـەڵك لـەدەردی سـەر وگیروگرفـت دوورخەنەوە .. خـەڵکیتر وان بـەدەم یەکـەوە، کۆمـەك وهاوکـاریی یەکتر ئەکەن لەسەر خێر ، هەوڵئەدەن بۆئەوەی شەڕ لەیـەکتری دوور خەنەوە، بەزەیی و ڕەحمیان هەیە بۆ یەکتر، لە حدودی توانایی و قودرە تیانا هەوڵ ئەدەن بۆئەوەی چـی باشـە بیکـەن بـۆ یـەکتر، چـی خراپـە دووری خەنەوە لەیەکتر ، بەڵام ئەو حاکمە زاڵم و پیـسانەو ، ئەوانەش کە وەك ئەوانن ، هیچ عەلاقەو ڕەبتیان بەخەڵکەوە نیە، بەناحەق خۆیان لکاندوە بەخەڵکـەوە – هـەروەك چـۆن جارجـار بەگـەرووی بـزن و شتەوە گۆشتێکی زیاد دەردێت ، کەلـە ئـەعزای ئـەو بزنـە نیـە، ئـەو گۆشتە زیادە کەشۆڕ ئەبێتەوە بەقـەدیا و خـۆی چەسـپاندوە پێـەوە – (ئەوە مانای حەقیقی وشەی (زنیم) ە). هەروا ئەو حاکمە زاڵمانەش لە خەڵك نین ، بێگانەن ، بە ناحەق خۆیان سەپاندوە بەسـەر خەڵکـدا .. ئەوەش یەکێکە لە خووڕەشتە ناپەسەندەکان کەلە موسـوڵمان دورە .. بەڕاسـتی ئینسـانی موسـوڵمان لەگـەڵ ئینسـانەکانە ، بەتـەواوی هێزوتواناییەوە هەوڵ ئەدا بۆئەوەی چی خێرە و ئەوەی لە دەسـتی بێـت لە خێر، بیگەیەنێت بە خەڵکی، ئەوگیروگرفت وکۆسـپانەی کـە دێنـە

ڕێگای خەڵك، لە سنوری تواناو قودرەتیدا، لە خەڵکی دووریان خاتەوە و لە خەڵکیان لادا.

* دوای ئەوانە ئەفەرموێ : ﴿أَن كَانَ ذَا مَالٍ وَبَنِينَ . إِذَا تُتْلَى عَلَيْهِ آيَاتُنَا قَالَ أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ﴾: لەبەرئەوەی دارای دارایی و ماڵە ، خاوەنی منداڵو داروودەستەیە، لەبەرئەوەی قودرەتی هەیە ، قودرەت لە ئیختیاریایەتی، سەرکەش بووە، نافەرمان بووە، کەوتۆتە (ئاسیط) و یاخی بوون . لەجێی ئەوە کە شوکری ئەوشتانەی بکردایە ، ئەو نیعمەت وئیمکانات و قودرەتانەی لە ڕێگای بەندەیی خوادا بەکاربهێنایە، وای لێهاتوە کە کاتێ ئایەتەکانی ئێمەی بەسەردا دێت و لەشوێنێك ئەخوێنرێتەوە بە سەریدا ، بۆئەوەی عەقیدە و بیر و بڕوای بۆ ڕۆشن بکرێتەوە و حەقی بۆ دەرکەوێ ، لە جێی ئەوەی بڕوایان پێبکا و تەسلیم بێت، ئەڵێ : ئەمانە ئەفسانەکانی پێشینانن، ئەیان گێڕایەوە ، حەقیقەتیان نیە ، بەو جۆرە مامەڵە ئەکات لەگەڵ بەرنامەی هیدایەتی ئێمە ..

## ئەو ڕەوشتانەی لە سورەتی (المعارج) باسکراون

خوای گەورە لە سورەتی (المعارج)یشدا چەند خووڕەوشتێکی چاك و باشی موسڵمان بەرامبەر ئەو ڕەوشتە چەوتانە باس ئەکات. ئەفەرموێت:

﴿إِنَّ الْإِنسَانَ خُلِقَ هَلُوعاً، إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعاً، وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعاً﴾: بەڕاستی ئینسان (بەگشتی)ئاوا دروست کراوە کە دەوامی لەسەر حاڵەتێك نیە، شەخسیەتی دامەزراوی نیە، هەرساتێ بەلایەکدایە، بە جۆرێ کاتێك توشی شەڕ وگیروگرفتێك بوو صەبروتاقەتی لەدەست ئەدا، دەست ئەکات بەهاوار و فریاد، بە ناشکوری‌کردن ، بێ تاقەتی کردن . کاتێك تووشی خێرێکیش ئەبێت ، نیعمەت و ئیمکاناتێك ئەکەوێتە دەستی، مەنع ئەکا لەوەی بگا بەوانەی کە موستەحەقن ، ئەیگێڕێتەوە، ناهێڵێ کەسی لێ بەشدار بێ وکەس کەڵکی لێ وەرگرێ ..

شەخسیەتێکە ئیستیقامەتی تیا نیە، لەسەر یەك حاڵەت نیە، هەر جارە بەلایەکدائەکەوێ؛ هەرساتێ بەجۆرێکە . هەر لەبەرئەوەشە ناتوانێ موسوڵمان بێت، چونکە کەسێ ئەتوانێ بڕوادار و موسوڵمان بێت کە شەخسیەتێکی دامەزراوی هەبێ ، لەسەر یەك حاڵ بمێنێتەوە، چونکە ئیمان هێنان گیروگرفتی زۆری بەشوێنا دێت لەلایەنی دوژمنانی دینەوە

ئەگەر شەخسیەتێکی ئارام و لەسەر خۆی نەبێ، ناتوانێ ڕێگـای ئیمـان ببڕێ و بڕواتە ئاخرین پلەی ڕێی ئیمان و عەمەلی صالح...

دوای ئەوە ئەفـەرموێ : ﴿إِلَّا الْمُصَلِّينَ﴾ بێجگـە نوێـژ خوێنـان، ئەوانەی وا بەڕاستی نوێژ ئەکەن ، ئەوانە ئا لەو خووڕەوشتە بەدوورن، ئەوان ئەوەیان نیە .. شتێکی تریان هەیە، خورەوشت و سیفەتێکی تریان هەیە، لەبەرئەوەیە ئەوخووڕەوشتە ناپەسەندانەیان نیە ، ئەتوانن(مـوئمین) بن و بگەن بەخۆشبـەختی .

* ﴿الَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ﴾ : جا ئـەو چـەند خووڕەوشـتە باشە بە نوێژ دەست پێکراوە ، بەنوێژیش دوایی هاتووە . ئەوەش بەیانی ئەوەیە کە سەرەتاو کۆتایی کـاری بـڕوادار نوێـژە، ئەگـەر نوێژەکـەی دروست بوو، ڕێکوپێك بوو، هەروەك لەسەرەتاوە بەیانمان کـرد، ئـەوە هەموو کارەکانی تریشی ڕێکوپێك ئەبن، ئەگەر نوێژەکەی نوێژ نـەبوو، هیچی تری ڕێکوپێك نابێ و بەکەڵك نایەت ..

ئەوانەی هەمیشە خـەریکی نوێـژ کـردنن ، بـەردەوامن لەسـەری ، ناهێڵن لە دەستیان دەرچێ، چونکە ئەزانن بەبێ نوێژ و سـکاڵاو دوعـا و پاڕانەوەی لای خوا هیچێکیان پێ ناکرێ ..

* ﴿وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ﴾ : ئەوانـەی لەدارایی و ماڵەکانیان حەق و بەشێکی زانـراو و دیـاری کـراو هەیـە، هەم بۆئەوکەسەی ڕووی هەیە داوا بکا، بـۆ گـەدا و هـەژارێك ڕووی

هەیە سوالْ بکا و لێیان داوا بکا .. هەم بۆ ئەوکەسەی لەگەڵ هەژاری و نەداریشا ڕووی نیە داوا بکاو مەحروم و بێبەش ئەمێنێتەوە ئەمان هەولْ ئەدەن ئەوانیش بدۆزنەوە و بەشی ئەوانیش بدەن، زەکاتیان پێ بدەن، ئەوەی کە خۆیان نیازیان پێی نیە لەماڵەکانیان ـ هەروەك لەپێشا ووتمان ـ ئەوەیان پێ ئەدەن .

* ﴿وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ﴾ : ئەوانەی ئەزانن ڕۆژی پاداشت هەیە، باوەڕی پێ ئەکەن ، تەصدیقی ئەکەن، تەسلیمی ئەبن، هەست بە مەسئولیەت ئەکەن، بینا لەسەر ئەوەیە ڕێگای ئیمان و عەمەلی صالح ئەگرنە بەرو، ئەوکارانەی باس کران جێ‌بەجێ ئەکەن، وەك : نوێژ و زەکات وشتانی تریش کە لە دواییدا بەیان ئەکرێن.

* ﴿وَالَّذِينَ هُم مِّنْ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشْفِقُونَ . إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ﴾ : ئەوانەی لە ئەشکەنجە و عەزابێك -کەلە تەرەفی خاوەنەکەیانەوەیە - هەمیشە وان لە ترسا، ئەهمیەتی پێ ئەدەن و لێی ئەترسن . ئاخر چونکە عەزابی خاوەنەکەیان شتێك نیە ئینسان لێی ئەمین بێت و لێی نەترسێ و، ئیحساسی مەسئولیەت نەکا ، بیری بەلایەوە نەبێت ، بێ موبالات بێ ، ئەنجامی وەزیفەی بەندەیی نەکا . چونکە ئەگەر ئینسان ڕێگای بەندەیی خوا نەگرێ ـ دوای ئەوە کە حەقی بۆ ڕۆشن بۆوە ـ حەتمەن گرفتاری عەزابی خوائەبێ .. جائەوان

لەبەر ئەوەی گرفتاری ئەو عەزابە نەبن ، بەوجۆرە ئەهلی ئەنجام دانی کردەوە چاکەکانن .

* ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ. إِلَّا عَلَى أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ﴾ : ئەوانەی حەیای خۆیان ئەپارێزن، نزیکی هیچ ژنێك ناکەونەوە . هەروەها ئەو ژنانەی نزیکی هیچ پیاوێك ناکەونەوە، پەیوەندییان لەگەڵ هیچ کەس نابێت مەگەر لەگەڵ هاوسەرەکانی خۆیان . یا پیاوەکان لەگەڵ کەنیزەکەکانی خۆیان، (زەمانێك بوو کەنیزەك هەبوون، ئەوانیش حوکمی ژنیان بووە بەهەندێ مەرجەوە)، تەنها لەگەڵ ئەوان عەلاقەیان هەیە، تەنها نزیکی لەگەڵ ئەوان ئەکەن، ئیتر خۆیان ئەپارێزن لەوەی لەگەڵ کەسێکیتر نزیکییان بێت .. هاوسەریش هەموومان ئەزانین کامەیەو چۆنە؟ ئەوەیە بەپێی شەریعەتی خوا حەلاڵ بوویێ، غەیری ئەوئیتر ئینسانێك ئیمانی بە خوا بێت و، ڕێگای بەندەیی خاوەنی بەر نەدا، ناتوانێ لەگەڵ هیچ ژنێکیتر پەیوەندی بێ، یا ژن لەگەڵ پیاوێکیتر.. بۆ نموونە ئینسانێك کە موسوڵمان بێت، ناتوانێ بۆ ماوەیەکی کەم لەگەڵ ژنێك بێت، وەك (صیغە کردن) یا وەك بەرنامەیەکی ناپەسەند کە لەناو ئەهلی سوننەتا هەیە کە ژنێك سێ تەلاقی ئەکەوێ بەڵام بەدزیەوە بۆ شەوێك مارەی ئەبڕنو بۆ یەك شەو بەلای پیاوێکەوە ئەبێو دوایی دەستی لێ بەرئەدا،

ئەوەش ناشەرعی‌یە، ئەگەر ئینسانێك لە خوا بترسێ حەقی نیە شتی وابكا .

﴿فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ﴾ جا خوا ئەفەرموێ : ئەوانەی تەنها لەگەڵ هاوسەرەكانی خۆیان پەیوەندی‌یان هەیە ئەوانە هیچ سەرزەنشت ولۆمەیەكیان ناكرێ، حەقی خۆیانە .

﴿فَمَنِ ابْتَغَى وَرَاء ذَلِكَ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْعَادُونَ﴾ : جا كاتێ ڕوون بۆوە ئینسان لەو مەجالەدا ئەبێ پەیوەندی لەگەڵ كێ بێ ، ئیتر هەركەس هەوڵی ئەوە بدا لەوە تێپەڕێ، ئەوە لە سنور دەرچوە و بە تاوانبار ئەژمێررێ .

* ﴿وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ﴾ : ئەوانەی هەمیشە ڕیعایەتی ئەمانەتەكان ئەكەن كە پێیان سپێرراوە، هەروەها ڕیعایەتی عەهدو پەیمانەكان ئەكەن كە لەگەڵیان بەستراوە . لە گەورەترین ئەمانەتەوە كە ئەمانەتی بەندەیی‌و مەسئولیەتێكە خوا بە ئینسانی سپاردووە، (كە پێی سپاردووە لە ژیانا تەنها گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو بێ‌و تەنها ئەو بكا بە پشتیوان‌و فریادڕەس‌و كۆمەكی خۆی)، تا بچوكترین ئەمانەت لەو ئەمانەتانەی هی خەڵكەو لەلایانە ئەیپارێزن‌و ڕیعایەتی ئەكەن.. هەروەها لە گەورەترین عەهدو پەیمان كە عەهدو پەیمانی‌بەندەیی‌یە وەك ئەفەرموێ : ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ﴾ .

*﴿وَالَّذِينَ هُم بِشَهَادَاتِهِمْ قَائِمُونَ﴾ : ئەوانەی بە هەموو هێزو توانایانەوە ئەو شایەتیانەی لەسەریانە ئەیدەنو ریعایەتیان ئەکەن، بەجۆرێك کە خوای گەورە لێیان داوا ئەکا ، ئەرکی خۆیان بەجێ دێنن، لەگەورەترین شایەتیدان تا بچوکترینیان، گەورەترینیان شایەتی دانی عەبدە بەوەی غەیری خوا فەرمانڕەواو فریادڕەسێك نیە : (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله). بەپێی ئەو شایەتیدانەو دوای ئەوە، موسوڵمان ئەبێ لە ژیانیا تەنها فەرمانبەرداری فەرمانی خوا بێ‌و لە فەرمانی کەسی‌تر پەیڕەوی نەکا، ئەگەر جارێکیش توشی خەتاو کەچڕەوی بوو، نافەرمانیەکی کرد، زوو بگەڕێتەوەوتەوبە بکاو بێتەوە سەر رێگەی هەق . شایەتیدان بە پێغەمبەر بوونی محمدیش (صلوات الله وبركاته عليه)ئەوەیە : ئینسان لە ژیانیا پەیڕەوی ئەوبێ . ئەو چۆن بەندەیی بۆ خواکردووە ئاوا بەندەیی بکا.. هەروەها هەر شایەتیدانێکی تریش کە لەسەر شانی ئینسان بێت ، واجبە لەسەری بەتەواوی وەزیفەی خۆی تیادا جێبەجێ بکا، لە شتێکا ئەزانێ‌و ئەبێ شایەتی لەسەر بدا ، خیانەت نەکا .

* ﴿وَالَّذِينَ هُمْ عَلَى صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ﴾ : ئەوانەی بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیان، پارێزگاریان لێ ئەکەن، نایەڵن لە هیچ لایەکەوە نوێژەکانیان توشی کەچ‌وکوڕی‌و ناتەواوی بێن . هەم ریعایەتی رووی

دەرەوەی نوێژەکەیان ، هەم ناوەوەی نوێژەکەیان ئەکەن، هەرچیەك کە پێویستە لە نوێژەکانیاندا، لە دوعاو سکالاکانیاندا، ڕیعایەتی ئەکەنو ئەنجامی ئەدەن ، بەجۆرێ کە نوێژەکانیش ئەبن بە ڕێگر لەوەی ئەوان توشی ئەنجامی کرداری ناپەسەند بن، هەروەك ئەفەرموێ :

﴿إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ﴾.

جا لەبەیانی پاداشتی ئەوانەدا ئەفەرموێ :﴿أُوْلَئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُّكْرَمُونَ﴾ : ئەوانە وان لەناو باخانێکدا کە لەوێ ڕێزیان لێ ئەگیرێت یا ئەفەرموێ : ﴿الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾: ئەوانەی لەناو نوێژو دوعاو سکالاکانیاندا کزوگەردنکەچو بە (خشوع)ن بۆ خوای گەورە، ئەزانن هەموو بوونیان نیازمەندی‌یە بە خوای خۆیان، ئەگەر ئەو سودو قازانجێکیان پێ‌نەگەیەنێ، لە هیچ لایەك دەستیان ناکەوێ . ئەگەر ئەو زیانو زەرەرێکیان لێ دوور نەخاتەوە، هیچ شتێکی‌تر و هیچ کەسێکی‌تر ناتوانێ لێیان دوربخاتەوە . بۆیە کاتێ ئەپاڕێنەوەو سکالا ئەکەن هەموو گیانیان خۆ نزم گرتە لە حزوری خوای خۆیاندا . ئەبێ ئینسان لە نوێژدا ئاوابێ .

## هەندێکی تر لە ڕەوشتە باشەکان

لە جێی تریش چەند وانەی تر ، لەو خوورەوشتانەی ئەبێ موسوڵمان بیێ باس کراون، کە بە یەکتاپەرستیو (تەوحید) دەست پێ ئەکەن (بەوەش تەواو ئەبن). لەئایەتی (٢٣-٣٩) لە سورەتی (الأسراء)دا (١٥) ڕەوشت باس ئەکات ئەفەرموێ :

* (وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ) : خوای گەورە بەیان ئەکا کە بڕیاری داوەو واجبی کردووە ئینسان لە ژیانیا تەنها فەرمانبەرداری خوا بێ و بەندەیی و ئیتاعەت بۆ ئەو بکا.

دوای ئەوە گەورەترین حەقێك کە بەسەریەوە هەیە دوای هەقی خوای گەورە هەقی دایكو باوکە، بۆیە ئەفەرموێ :

* ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً﴾ : فەرمانی داوە ئینسان لەگەڵ باوكو دایکی بەباشی بجوڵێتەوەو بە باشی ڕەفتاریان لەگەڵ بکا، بەتایبەت لەکاتێکا زۆر نیازیان هەیە بەو، ئەفەرموێ:

﴿إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيماً ، وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً﴾ : ئەگەر هاتوو یەکێکیان یا هەردوویان ئەوەندە مانەوە کە پیربوون، لای تۆ بوونو نیازیان بە تۆ بوو، لای تۆ ژیانیان بەسەر ئەبرد، ئەوە هەرچەند زەحمەتیان بیێتو

چاودێری لێکردنیانو بەخێوکردنیان زەحمەت بێو نارەحەتیت بۆ پێش بێنێ، بیرت بێ یەکجاریش نەڵێی :(ئاه.. هـ..)، نەڵێی:(ئۆف ..) قسەی توندوتیژیان لەگەڵ نەکەی، قسەیەك کە لە گەڵیان ئەکەی با پڕلە ڕێزوئیحتیرام بێ و باش بێ، باڵی ڕەحمەتو بەزەیی‌و میهرەبانی و خۆ زەلیلگرتن ڕاخە بۆیان . چونکە نیازیان بەو ڕەحمەتو بەزەیی‌و میهربانی‌یە هەیە . هەروەها دوعای خێریان بۆ بکە، لە خوا بپارێرەوە کە بەزەیی بێتەوە پیایانداو ڕەحمیان پێبکا . بڵێ: خوایە ، ڕەحم بکە بەوانو بەزەییت بێتەوە پیایاندا، هەروەك ئەوان کاتێك من منداڵ بووم ، بەخێویان کردم، لەپاداشتی ئەو پەروەردەیەی من ، تۆ ڕەحمیان پێ بکەو، جەزایان لەباتی من بدەرەوە .

﴿رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ إِن تَكُونُواْ صَالِحِينَ فَإِنَّهُ كَانَ لِلأَوَّابِينَ غَفُوراً﴾ : خاوەنەکەتان زانایە بەوەی وا لە دەروونتاندایە، لە هەمووکەس زیاتر ئەزانێ چی لە دەروونتانایە، ئەگەر نیەتی باشتان هەبێ، ئەو لە هەمووکەس باشتر پێی ئەزانێ، جەزاو پاداشت بە پێی ئەوە ئەداتەوە . ئەگەر سالح بن . ئەگەرئەهلی‌کرداری چاكو شیاو و باش بن ئەوە دڵنیا بن جەزاو پاداشتان نافەوتێ، چونکە ئەوانەی هەمیشە ڕوو لە خوان، هەرکاتێ توشی لادانێ لەرێگەی خوا ئەبن، بە زووترین کات ئەگەڕێنەوە، ئەوە خوا دەرهەقیان (غەفور)ە، هەرکاتێ

ئینسان تووشی لادانو نافەرمانییەك بوو، بە شەرتێك بگەڕێتەوە، لە گوناهی چاوپۆشی ئەكا وئەیبەخشێ .

* ﴿وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلاَ تُبَذِّرْ تَبْذِيراً، إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُواْ إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُوراً﴾:

دوای ئەوە واجب ئەكا لەسەر ئینسان كە لەگەڵ هەندێكی ترلە بەندەكانی خوا، ئەوانەی زۆر نیازیان هەیە بەوەی لەگەڵیان چاكەكاریی بكرێ، لەگەڵیان چاك بێوكاری باشیان لەگەڵ بكا، ئەفەرموێ : ئەوانەی خزمن، هەقیان هەیە بەسەرتەوە، هەقەكەیان بدە، ئیتر چ حەقی ئیحتیرامو ڕێزلێنان بێ، چ حەقی ماددی بێ، وەك ئەوەی نیازیان بەشتێك لە ماڵو سەروەتت بێت كە ئەبێت پێیان بدەی . هەروەها هەژاران هەقیان بەسەرتەوە هەیە، هەقەكەیان بدە . هەروەها ئەوانەی لەماڵو ماوای خۆیان دووركەوتوونەتەوەو، شتێكیان بەدەستەوە نەماوە، ئەوانەی غەریب كەوتوون، ئەوانیش هەقیان بەسەرتەوە هەیە، هەقەكەیان بدە، بەلاّم هۆشت بێ لە هەق ئەداكردنولە بەخشینا حەددێك هەیە، ئەبێ هەروەك لە بەخیلیو هەقی خەڵك ئەدان دووریی بكەی، هەروایش لەماڵو نیعمەت پژاندنو زایەكردنی ماڵو نیعمەت ، خۆت دوور بگری . هەمیشە حەدی ناوەڕاست بگرە، نە بە بەخیلی، بە دریغی كردنو ئەدانی هەقی

خەڵك، نە بە زایەكردنیماڵو بەپڕاندىو بەفیڕۆدانی، هیچ كام لەوانە نەكەی، ئەوەی ناوەڕاستە بیگرە، خوا ئەوەی خۆش ئەوێ، نەك ئەوەی ماڵو نیعمەتێ خوا پێی داوی ، بێئەوەی جێی خۆی بێ صەرفی بكەیو بیپڕژێنی، ئەوانەی وا ئەوە بەرنامەو خووڕەوشتیانە، برای شەیتانەكانن، دیارە شەیتان زۆر زۆر كافرە نیسبەت بە خاوەنەكەی خۆی، ئەگەر تۆش ئاوا بكەی وەك ئەوت لێ دێت .

* ﴿وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ابْتِغَاء رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلاً مَّيْسُوراً﴾ : ئەگەر هاتوو جارێ یەكێ لەوانەی هەقی بەسەرتەوە هەیە، داوای هەقەكەی كردو نەت بوو، ڕووت لێ هەڵكرد، لەبەرئەوەی ئێستا شتێكت نیە بیدەیتێ و، بەتەمای ئەوەی خاوەنەكەت ڕەحمێكت لەگەڵ بكاو، نیعمەتێكت پێ بدا، ئەوا تاكاتێ ئەو ڕەحمەتەت دەست نەكەوێ، تا هەقی ئەو هەقدارە بدەی، قسەیەكی باشوخۆشو ڕەحمەتی لەگەڵ بكە، بە قسەی خۆش قانعی بكە تاكاتێ ئەو نیعمەتەت نەكەوێتە دەست .

* ﴿وَلاَ تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُوماً مَّحْسُوراً﴾، ئەم ئایەتە مەنعی ئینسانی موسوڵمان ئەكا لەوەی كە بەخیل بێ، هەروەها مەنعی ئەكا لەوەی هەرچییەكی هەیە بەجارێ صەرفی بكاو بیبەخشێ . ئەفەرموێ : وەك كەسێ مەبە دەستی

بەكۆتو زنجیر بەسراوە بە ملیەوەو ناتوانێ هیچ بكا، دەستی بەسراوە لەوەی خێرێك بكا . وەك كەسێكیش مەبە بە تەواوی دەستی درێژكردۆتەوەو دەستی بڵاوكردۆتەوە، بەجۆرێ هەموو سەروەتو ماڵەكەت لە ماوەیەكی كەمدا لەدەس بدەیو هەمووی خەرج بكەیت، لە دوایدا داكەویو سەرزەنشت بكرێی بەجۆرێ هەموو هێزو توانایی خۆت لەدەست دایێو هیچێكت نەمایێ .

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ إِنَّهُ كَانَ بِعِبَادِهِ خَبِيراً بَصِيراً﴾، بەخیل نەبی ،كە (إنفاق) نەكەی و وابزانی ئەگەر هاتو ئەوەت بەخشی ئیتر هیچت دەست ناكەوێتەوە، چونكە بەراستی خاوەنەكەت ئەگەر ویستی رزقو رۆزیی زۆر بەهەركەس بدا، پێی ئەدا.. ویستیشی لەهەركەسی بگرێتەوە ئەیگرێتەوە . هەروەها هەموو سەروەتو ماڵەكەشت بەجارێ خەرج نەكەیو ئەیدەی بەهەوبەو، وابزانی ئەگەر بێتو تۆ زیادە لەحەد (إنفاق) نەكەیو ماڵ خەرج نەكەی خەڵكی لە بەین ئەچن، چونكە خاوەنەكەت چاوی لە خەڵكیە، خەبەری لێیانەو ئاگادارە، ئەزانێ كێ نیازی بەچیەو كێ چ رزقو رۆزییەكی ئەوێ ،كەی پێی بدرێ پێی ئەدا، تۆ حەدی ناوەراست ریعایەت بكە، ئەملاوئەولا مەكە . دوایی ئەفەرموێ :

* ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلاقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُم إنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْءاً كَبِيراً﴾ : منالەکانتان لە ترسی ئەوەی نەکو نەدار بکەونو ماڵوداراییتان نەبێ خەرجی کەن بۆیان، مەکوژن . چونکە ئێمە رۆزیی ئەوان ئەدەین، هەروەها رۆزیی ئێوەیش ئەدەین، ئێوە ئیجازەی ئەوەتان نیە بیانکوژن، رزقو رۆزییەکیشمان بۆ ئەوان داناوە . بەراستی کوشتنیان لادانێکی گەورەیە لەرێگەی بەندەیی .. ئەڵبەتە لەم زەمانەدا، ئائەمە ئەنجام نادرێ، بەڵام شتێکی نزیك بەمە ئەنجام ئەدرێ ئەویش ئەوەیە خەڵکی لەبەرئەوەی منالەکانیان بە حسابی خۆیان داهاتوویەکی رۆشنیان بێ، وەسیلەی ژیانیان دەسکەوێ، دەستیان لێ بەرئەدەن، لەتەربیەتو بەخێوکردنیاندا بەجۆرێ ئیسلام دەستور ئەدا هیچ هەوڵێکیان لەگەڵ نادەنو کەمتەرخەمی ئەکەن، لەجیاتی ئەوە هیدایەتیان بدەنو بیانخەنە سەر رێگای بەندەیی، تەنها هەوڵیان ئەوەیە بەرەو ئەوە بیانبەن مەعاشێکیان دەست کەوێ، بەرەو ئەوە بیانبەن وەسیلەی ژیانیان دەسکەوێ، هەر ئابەوە کارێکیان لێ ئەکەن وەك ئەوەی کوژرابن وایان لێ دێت . ئەگەر ئینسان بیەوێ خوا لێی رازی بێ، واجبە لەسەری منالی بەجۆرێ پەروەردە بکا، رێگەی بەندەیی خوابگرێ . ئەڵبەتە ئەمە بە مەعنای ئەوەش نیە موسوڵمان کارناکاتو هەوڵ نادا، تەنها مانای ئەوەیە ئینسان لەسەریەتی بەندایەتیو عیبادەت بۆ خوای گەورە بکا . جا هەر لە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەدا وەسیلەیەکیش بۆ

ژیانو رزقو رۆزی بەکاردێنێ، ئیتر حەقیەتی ئەوەی خوا کردویەتی بە رزقی پێی دەگات و لێی بەشدار ئەبێ .

* ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً﴾: لە زینا نزیک مەکەونەوە، چونکە ئەوکردارە کردارێکی زۆر سوکو ناپەسەندە، ڕێگای ئەنجامدانی ئەوکردارە زۆر ڕێگایەکی پیسەو پێدا مەڕۆن .

* ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالحَقِّ﴾ : کەسێک خوا کوشتنی حەرام کردووە مەیکوژن، مەگەر ئەوەی هەقێ بەسەریەوە بێ . کەسێکیش هەقی بەسەرەوەیەو مۆڵەتی کوشتنی هەیە ،کە کەسێکی تری بە ناهەق کوشتبێ، یا فەساد بخاتە ڕێ لەسەر زەویدا..(ئەوەش بەپێی بڕیار و لە دەزگای خۆیەوە جێبەجێ دەکرێ ) .

لەلایەکیترەوە قورئان خۆی باسی کردووە ئەو فەسادە چیە، رۆشنی کردۆتەوە تەنها لەو دوو حاڵەتەدا ئەکرێ ئینسان بکوژرێ، لە غەیری ئەوانەدا – واتە غەیری ئەوەی فەسادێکی کردبێ، هەروەک قورئان باسی ئەکا، یا قەتلێکی کردبێ – جایز نیە بکوژرێ، ئەگەر چی کافریش بێ .

﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُوماً فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَاناً فَلاَ يُسْرِف فِّي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَانَ مَنْصُوراً﴾: بۆ ئەوەی بەرنامەیەک بێ بۆ تۆڵە سەندنەوە، لە کاتێکا

کەسێ کەسێکی ئەکوژرێ، خوای گەورە باس ئەکا فەرمانی تایبەتیمان دەرکردووە بۆ تۆڵەسەندنەوە . ئەفەرموێ : لەکاتێکا کەسێکتان ئەکوژرێ ریعایەتی ئەوە بکەنو لەوە لامەدەن ، ئەگەر ریعایەتی ئەوە بکەن تۆڵەی خۆتان ئەسێنەوەو داخی دڵتان دەرئەچێ، هەقتان نیە زیادەڕەوی بکەنو، لەوە زیاتر برۆن، هەرکەس بە ناهەقو مەزڵومانە کوژرا، ئەوە بۆ ساحیب خوێنەکەی، بۆ سەرپەرشتەکەی، دەسەڵاتێکمان داناوە، هەقی ئەوەمان پێداوە قاتڵەکە بکوژێتەوە، جا با هەرئەوە بکاو زیادەڕەوی نەکا ،کەسیتر غەیری قاتڵەکە نەکوژێتەوە.. خۆ ئەگەر زیادەڕەوی نەکا، ئەگەر گوێ بەفەرمانی خوا بدا ، خوایش کۆمەکی ئەکا بۆ ئەوەی هەقی خۆی بسێنێتەوە (دیارە ئەوەش لە ڕێی قەزاوە ئەکرێ، نەك هەرکەس بۆ خۆی).

* ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ﴾ :

نزیکی ماڵی هەتیو مەکەونەوە، مەگەر بەشێوەیەك کە باشترین شێوە بێ . شێوەیەك لەوە شێوەی باشتر نەبێ بۆ نزیك کەوتنەوە لە ماڵی بێباوك . شێوەیەك کە زۆرترین مەسڵەحەتی تیابێ بۆ ئەو. تا کاتێ ئەگاتە سنورێك بەتەواوی خۆی ئەگرێ، ئەبێتە پیاوێ یا ژنێکی کامڵو وای لێ دێت خۆی ئەتوانێت دیفاع لەحەقی خۆی بکا، لە حاڵەتی هەتیوبونو لاوازی دەردەچێت .

* ﴿وَأَوْفُواْ بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً﴾ :هەروەها وەفا بكەن بە عەهدو پەیمان، ئەگەر پەیمان و عەهدێكتان لەگەڵ ئەبەسرێت ، تا سەر بیبەن ، چونكە پەیمانێك كە لەگەڵ ئینسان ئەبەسرێ حەتمەن لەدوایدا لەو ئینسانە پرسیار ئەكرێ لەسەری، ئایا وەفای پێ كردووەو بردوویەتیە سەر، یان نا؟ ئەگەر نەیبردبووەتە سەر، حەتمەن تووشی سزایەك ئەبێ، مەگەر تۆبەی كردبێ :

* ﴿وَأَوْفُوا الْكَيْلَ إِذا كِلْتُمْ وَزِنُواْ بِالقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً ﴾ : لەكاتێكدا شتێك بە كاسەمەنو شتیوا ئەپێون، بەتەواوی ریعایەتی ئەو پێوانە كردنە بكەن . ئەگەر بۆ خۆتان شتێ وەرئەگرن زیاترلە ئەندازە وەرمەگرن . ئەگەر حەقی كەسیتر لاتانە، كالێ ئەیدەنەوە كەمتر نەبێ لەوەی ئەبێ بیدەن .. كاتێك شتێ ئەكێشن و وەزنی ئەكەن، ئەویش با بە میزانێ بێ رێك وپێك بێ، كەم و زیادی تیا نەبێ . ئائەوە باشترە، ئەوە سەرەنجامی چاكترە بۆتان .

* ﴿وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً﴾: مەكەونە شوێن ئەوەی پێی نازانن و ئاگادار نین لێی . خوای (تعالى) بۆیە هێزی بیستنی پێداون، بۆیە هێزی بینینی پێداون، بۆیە دڵی پێداون، كە بەكاریان بێنن بۆ زانین و شتیان پێبزانن، دوای ئەوە شتێكتان زانی، شوێنی كەونو ئەنجامی

بدەن .. لەسەر هەرکام لەوانە لە دوارۆژدا پرسیارتان لێ ئەکرێ ، پرسیار ئەکرێ چۆن سوودتان بینی لە گوێتانو هێزی بیستنتان؟ چۆن سوودتان بینی لە دڵتانو کەڵکتان لێ وەرگرت؟ ئەگەر بەو جۆرە خوا داواتان لێ ئەکا کەڵکتان لێ وەرنەگرتبێ‌و، بەکارتان نەهێنابێ بۆ ئەوەی کە شت بزانن جا عەمەلی پێ بکەن، ئەوە مەحکومن‌و خوا سزاتان ئەدا، تەنها لە کاتێکا لە ئەشکەنجەو ئەزیەت‌و ئازار رزگار ئەبن ، ئەو شتانەتان بەکارهێنابێ،کە خواپێی داون ، بۆئەوەی عیلم‌و زانستان دەست کەوێ، تا بە زانستەوە بجوڵێن‌و ژیانتان بەسەر بەرن .

کەوابوو پێویستە لەسەر ئینسان (بیستن)و( بینین)و (هێزی دڵ)ی بەکاربێنێ بۆ ئەوەی خوا بناسێ، چاك‌وخراپ لەیەك جیا بکاتەوە، دروست‌و نادروست و خێرو شەڕ بناسێ .. پاشان ئەوەی خێرە ، بیگرێ . ئەوەی شەڕە ، وازی لێ بێنێ‌و دەستی لێ بەردا.

* ﴿وَلاَ تَمْشِ فِي الأَرْضِ مَرَحاً إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ الأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولاً﴾ : بە جۆرێ مەچۆ بەسەر زەویدا کە دڵ بە خۆت خۆش بکەی‌و وابزانی شتێکی.. بە تەکەببور و خۆ بە شت زانینەوە مەچۆ بەسەر زەویدا، چونکە خۆ هەرچییەك بی ناگەیتە ئاستێ کە زەوی بدڕی، یا وەك کەژوکێوەکان قامەتت بەرزبێ‌و بگەیتە بەرزایی ئەوان! تۆ چیت؟ تەماشای خۆت بکە، بزانە چیت؟ خۆت بناسەو خۆت بە شتێك زیاتر لەوە کە هەیت، مەزانە !!

﴿كُلُّ ذَلِكَ كَانَ سَيِّئُهُ عِنْدَ رَبِّكَ مَكْرُوهــاً﴾ : هەمووئەوانــەی بــاس کران، ئەوەیان کە خراپــە لای خاوەنەکــەت ناپەســەندە، ئــەو بەباشــی نازانێ، دیارە هەرکەسێکیش بەندەی خوابێ ئەبێ ڕیعایــەتی ئــەوە نــەکا کە لەوخراپانە دووریی بکا .(ذَلِكَ مِمَّا أَوْحَى إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ الْحِكْمَــةِ وَلاَ تَجْعَلْ مَعَ اللّهِ إِلَهاً آخَرَ فَتُلْقَى فِي جَهَنَّمَ مَلُوماً مَّدْحُوراً) : ئەوانــەی باس کران لەو حیکمەتەیە کە خاوەنەکەت بۆتی ناردووە، بەرنامەیەکــە ئەگەر ڕیعایەتی بکەی ئەتوانی بەندەیی خوا بە جۆرێ بکەی نە تووشــی لادان بــەرەو لای زیــادەڕەویو (إفــــراط) بیــی، نــە تووشــی لادان بەرەوکەمتەرخەمیو کەمکاریو (تفریط) بیبی .. بــۆ ئــاخر جــار پێــت ئەڵێینەوە لەگەڵ خوادا فەرمانڕەواو فەریادڕەسی تــر قــەرار مــەدە، لــە ژیانتا پەیڕەوی لە فەرمانڕەوای‌تر مەکە، تەوەککول مەکە سەر کەسی‌تر غەیری خوا، داوای کۆمەك لە غەیری ئەو مەکە، تۆ کە خــوات هەیــە، تۆ کە (الله) فەرمانڕەواو فەریادڕەستە ، ئیتر کەســی‌تر بــە فــەرمانڕەواو فەریادڕەســی خۆت دامەنێ، تــا بــە سەرزەنشــکراویو دەرکــراوی لــە ڕەحمەتی خوا نەخرێیتە دۆزەخ .

(بەم جۆرە ئەم چــەند ڕەوشــتەش بەبەکتاپەرســتی دەســتیان پێکــراو بەوەش کۆتایی هات).

## ئامۆژگارییەكانی لوقمان بۆ كوڕەكەی :

*لــە ســورەی لوقمانــدا هــاتووە، لوقمــان -كــە یــەكێ لەبەنــدە ساڵحەكانی خوایە- نەسیحەتی كوڕەكەی خۆی ئەكرد، نەسیحەتەكەی وا دەست پێكرد كە مەنعی كوڕەكەی كرد لەوەی شەریك بۆ خوا قەراربدا، كەسی تر غەیری خوا بە فەرمانڕەوای خۆی یا فەریادڕەسی خۆی بزانێ . بەیانی ئەوە ئەكا كە هاوەڵ بۆ خوا قەرادان چەندە گەورەیە .

*دوای ئەوە خوای (متعال) خۆی بەیانی ئەوە دەكات : بە شوێن حەقی خوادا، حەقی دایكو باوكیش بەسەر ئینسانەوەیە . ئەبێ ڕیعایەتیان بكا، بەتایبەت دایك كە ڕەنجو زەحمەتی زۆری كێشاوە، لە (٣٠) مانگدا لەگەڵ منداڵ، لای كەم (٦) مانگ بارداری، (٢) ساڵیش شیر پێدانو بەخێوكردن . خوا ئەفەرموێ : تەنانەت ئەگەر دایكو باوك فرمانیان بەتۆ دا كە شەریكی بۆ قەرار بدەیو لەڕێی بەندەیی دەربچی، لەو حاڵەیشدا ئەبێ هەر لەگەڵیان بەشێوەی پەسەند ڕەفتار بكەی، بە گوێیان مەكە، فەرمانبەرداریان لێ مەكە، لە كاتێكا فەرمانێ ئەدەن كە نافەرمانی خوای تیایەو گوناهە، بەباشیو پەسەندی لەگەڵیان ڕەفتار بكە، ئەوە كە دەستور ئەدەن شەریك بۆ خوا قەرار

بدەی‌و لەرێی بەنـدەیی دەربچـی، ئـەوە نایێتـە بەهانـە کـە لەگـەڵیان بەدرەفتاریی بکەی .

*دوای ئەوە رۆژی قیامەت‌و مەسئولیەت‌و پرسینەوە ئەخاتەوە بـیر، تا هەست بە مەسئولیـەت بکا.

*پاشـان فـەرمانی گـەورەترین کـردەوەی چـاك دەدا کـە نوێـژە، ئەفەرموێ: ﴿يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ﴾، کورِەکـەم! نوێـژ بەجێبێنـە . نوێـژ بکە . بەڵام کردنێ کە بە هیچ لایەکا کـورتی‌و ناتـەواویی نـەبێ، هـەم رووی دەرەوەی، هـەم نـاوەوەی . نوێـژێ (خشـوع)و خـۆکزکردن لەبـەردەم خـوای تێـدابێ . نوێـژێ کاتـێ ئەیکـەی هۆشـت بەلای‌کردەوەکانیەوە بێ، بەلای ئەو کەلیمانەوە بێ‌کە تیایدا هەیەو، بـە زبان ئەیلێی . نوێژێ ئەو شتانەی فەرزو واجبە ریعایەتت کردبێ . ئـەو شتانەی شەرتن‌و ئەبێ بـبن وەك دەسـتنوێژو غـەیری ئەوانـە، ئەوانـەت ریعایـەت کردبـێ، هـەموو لایـەکی نوێژەکـەت نوێـژ بـێ، سـکاڵاو پارانەوەی راستەقینەی لای خوابێ .(ئەمە مانای ئیقامەی نوێژە) .

دوای‌ئەوەکـە ئەودەسـتورەی پێـدا، دوای ئـەوە کـە کورِەکـەی عەقیدەی پاك‌و دروسـت ئـەبێ‌و، ئـەبێ بـە ئـەهلی نوێـژکردن، بـەو جۆرەی باس کرا، دەسـتوری پێ‌ئەدا کە (ئەمر بە مەعروف‌و نـەهی لـە مونکەر)بکا، ئەفەرموێ :

* ﴿وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ ﴾ : ئەگەر دیت کەسێ کردەوەیەکی پەسەندی تەرك کردووەو ئەنجامی نادا، ئەمری پێ بکە کە ئەنجامی بدا. ئەگەر دیت کەسێ شتێکی ناپەسەند ئەنجام ئەدا نەهی لێ بکەو قەدەغەی بکە لە ئەنجام دانی . دیارە لەم مەیدانەدا گرفتاری زۆرو دەردی سەری‌و ئەزیەت‌و ئازارت تووش ئەبێ، لەبەرئەوە ئەفەرموێ :

* ﴿وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ﴾ : صەبر بکە لەسەر ئەو شتەی تووشت ئەبێ . هەرشتێ کە تووشت ئەبێ لە مەیدانی (ئەمر بە مەعروف‌و نەهی لە مونکەر)و، بەیان کردنی رێگەی هەقا، سەبری لەسەر بکە، شکست مەخۆو مەگەڕێ دواوە. ﴿إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾: بەڕاستی ئەوە کە ئینسان صەبر بکا لەسەر ئەوانە، ئەوە لەو شتانەیە کە زۆر گرنگن، ئەبێ ئینسان عەزمی بێ لەسەریان .

* ﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحاً﴾ : وائەبێ لەگەڵ خەلکی کە بەکەمیان بزانی‌و خۆت بە گەورەتر لەوان بگری، بە جۆرێ لەکاتی دیدار لەگەڵیان‌و پێگەیشتنیان‌و قسە لەگەڵ کردنیان، ملت لارکەیتەوە لێیان‌و، خۆت لێیان لادەی بەلای تردا‌و، فیزت ئەهێنێت کە تەماشایان بکەی‌و، لەگەڵیان ڕووبەڕووبی ..

هەروەها کاتێ ئەچی بەسەر زەویدا بە فیزو خۆبەشت زانینو دڵ بە خۆخۆشکردنەوە مەڕۆ. ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ : چونکە خوا خۆشی لە هیچ کەسێ نایەت کە خۆی بە شت ئەزانێ و فەخر ئەفرۆشێو ناز ئەکا بەسەر خەڵکا .

﴿وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ﴾ : لە ڕێکردنتا، حەدی ناوەڕاست بگرە، نەپەلەو بەڕاکردن بڕۆ، نە هەر تەواویش لەسەرخۆ. ئەوەی کە ناوەراستە بیگرە، خوا خۆشی دێت لە ناوەڕاست گری، نە کەمکاریو نەزیادەڕەویی .

﴿وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ﴾ : لەدەنگت کەم بکەرەوە، ئەگەر نیاز نی‌یە بەوەی دەنگت بەرزکەیتەوە، بەرزی مەکەوە. چەندە نیاز هەیە بە دەنگ بەرزکردنەوە هەرئەوەندە بەرزی بکەوە، چونکە : ﴿إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ﴾: ناخۆشترین دەنگەکان دەنگی گوێدرێژەکانە ،کە زۆر بەرزی دەکەنەوە، لەبەرئەو زۆربەرزکردنەوەیە زۆر زۆر ناخۆش ئەبێ، جا تۆ دەنگ بەرز مەکەرەوە تا ئەو ناخۆشی‌یە بۆ دەنگت پەیدا نەبێ .

## بەشێ لە تەفسیری سورەی (الفرقان)

لە سورەتی (فرقان)یشدا هەندێ شتی تر بەیان ئەکا، ئەوانەیان تا ئێستا باس نەکراون ئەمانەن: ئەفەرموێ :

• ﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْناً﴾: بەندە راستەقینەکانی خوای رەحمان، ئەو کەسانەن کاتێ ئەڕۆن بەسەر زەویدا بە تەوازوعەوە ئەڕۆن، خۆیان زل ناگرن، خۆیان گەورەتر لە خەڵکی ترناگرن . ئەڵبەتە ئەمە بەمەعنای خۆ زەلیل گرتن لەبەردەست ناموسڵمانانو دەسەڵاتداراندا نیە، موسوڵمان عیززەتی هەیە، سەربەرزە، خۆی بۆکەس کز ناکا، سەری خۆی بۆ کەس دانانەوێنێ، بۆ غەیری خوا کزی نانوێنێ، بەڵام کاتێ هاتوچۆ ئەکاو ئەڕوا بەملاولاداو ڕووبەڕوو ئەبێتەوە لەگەڵ خەڵکی، ئیهانەتیان پێناکا، بەکەمیان نازانێ، خۆی لەوان زیاتر ناگرێ ..

• ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَاماً﴾ : ئەوانەشن کاتێ نەزانەکان قسەیان لەگەڵ ئەکەن بە نەزانینەوە ، ئەیانەوێ تووشی پێکدادانو شەڕ و هەرایان بکەن، سەلامیان لێ ئەکەن، دوعای سەلامەتیو خێریان بۆ ئەکەن، خۆیان لە دەستیان ڕزگار ئەکەن و، جەنگیان لەگەڵ ناکەن .

• ﴿وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّداً وَقِيَاماً﴾ : هەروەها بەندەکانی خوا ئەوانەن کەلە شەودا بۆ خاوەنەکەیان (بۆخوای گەورە) کڕنوش ئەبەن،

سەری بەندەیی لەسەر زەوی دەنێن . لەکاتی بەندەیی کردن بۆ خـوا و سکالاَ و ڕاز و نیازدا هەڵدەسن و(قیام) ئەکەن . لەشەودا نوێژ ئەکـەن، لەنوێژەکانیانا لەخزمەتی خوای خۆیانا ڕائەوەسـتن . هـەروەها سـەری بەندەیی ئەنێنە سەر خاك . جا لای کەمی شەو هەسـتان نوێژی مـەغریب وعیشایە، لای تەواویشـی (نوێـژی وبـتر)ە،کەئـەویش لای زۆرەکـەی (١١) ڕەکعەتەو لای کەمی ڕەکعەتێکە و ئەگەر سـێش بێت باشترە .

* ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَـانَ غَرَاماً. إِنَّهَا سَاءَتْ مُسْتَقَرّاً وَمُقَامـاً ﴾ : ئـەو بەندانـەی خـوا لەگـەڵ ئەوەی کەئەو هەموو ئەرکانە جێبەجێ ئەکـەن، وائـاژانن ئـەو کـردەوە چـاکانە حەتمـەن ڕزگاریـان ئەکـەن لەعـەزاب، چـونکە ئەوانـە تـەنها سەبەبێکن ، ئەگەر خوا نەیەوێ ئەو سەببانە خۆیان هـیچ ناکـەن، جـا لەبەرئەوە ڕوو ئەکەنە خاوەنەکەی خۆیان و هـاوار ئەکـەن کـە: ئـەی خاوەنەکەمان، عەزابی جەهەنـەممان لێ لادە . وا ئەکەوێتـە دڵیـان وەك ئـەوەی عـەزابی جەهەنـەم خەریکـە بـەرەو ڕوویـان دێ، مەگـەر خاوەنەکەیان ـ خوای گەورە ـ لێیان لادا..

جەهەنەم جێگایەکە زۆر ناخۆشە، جێگای قـەرارگرتنی نـاخۆش و، جێ مانەوەیەکی ناخۆشە. قەرارگەیەکە ئینسـان بەڕاسـتی قـەراری تیـا ناگرێو تیایا دانامەزرێ..

* دوای ئەوە باسی ئەوە ئەکا کە لەمەوپێش ڕۆشن کرایەوە، ئینسان لەخەرجکردنی ماڵ و لەئینفاقا ئەبێ حەدی ناوەڕاست بگرێ ، نە زیادەڕەویی، نەکەمکاریی، بەشوێن ئەوانەدا چەند شتیتر ئەفەرموێ : یەکێکیان شەریك بۆ خوا قەرار دانە، یەکێکیان کوشتنی ناهەقە، یەکێکیان زینایە ، جا ئەفەرموێ : ئەگەر کەسێ ئەمانە بکا حەتمەن بۆ هەمیشە لەئاگری جەهەنەمدا ئەمێنێتەوە، مەگەرتەوبەی کردبێ و بەزوویی گەڕابێتەوە و ئیمان و عەمەلی سالحی کردبێت بەکارو پیشەی خۆی .

* ﴿وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ﴾ : ئەوانەی شایەتی درۆ نادەن، لەگەورەترین شت تا بچوکترین شت، شایەتی نادەن بەوەی کە کەسیتر غەیری خوا ئەکرێ فەرمانڕەوا یا فەریادڕەس بێ .. هەروەها هیچ شایەتییەکی درۆ نادەن .

* ﴿وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَامًا﴾ هەروەها کە ئەڕۆن بەلای شتێکی بێهودەدا بەشێوەی ئەوانەی کە بەڕێزن بەو شێوەیە خۆیانی لێ لائەدەن و ناچن بەدەم ئەو شتە بێ هودانەوە و خۆیان خەریك ناکەن پێیانەوە ..

* ﴿وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا﴾ : وەسفێکی تری بەندەکانی خوا ئەوەیە کاتێك ئایەت و نیشانە و

دەلیلەکانی خاوەنەکـەیان بیریـان خرایـەوە ، هـەروا کـەرو کوێر خـۆ ناخەن بەملیانا و دیققەتیان تیا نـەدەن ، سـەرنجیان نـەدەن ، بیریـان لێ ئەکەنەوە تـا زیـاتر و زیـاتر خوایـان پـێ بناسـێنن ، تـا زیـاتر هەسـت بەمەسئولیەت بکەن و وەزیفەی بەندەیی خۆیان بناسن .

* ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْـيُنٍ﴾ : هەروەها ئەوانە دوای ئەوەی خۆیان ئیصلاح کرد وئەوکارە باشانەیان ئەنجام داو لەوکارە خراپانە دووری‌یان گرت، نۆبەی ئەوەیە خـەریکی ئیصلاحی ژن و منـاڵیان بن . جا هەرچی هەوڵی خۆیانە ئەیدەن، پاشان لەبەرئەوەی ئەوان تەنها ڕێنمایی‌کردنیـان لەسـەرەو ئـەزانن هیدایـەت بەدەست خوایە، هاوار ئەکەنە لای خوای‌خاوەنیا ن و ئـەڵێن : ئـەی خاوەنەکەمان، لە ژن و منالەکانمان چی‌ئەبێ بەمایەی فێنکی چـاومانو خۆشی دڵـمان، ئەوەمان بۆ قەرار بدە . خوایە ژن و منالەکانمان تەوفیق بدە کەئیصلاح ببن‌و، ڕێگای بەندەیی بگرن، تا ئێمـەش دڵمـان خـۆش بێ و چاومان فێنك بێتەوە ..

*دوای ئەوەی هەوڵی خۆیـان دا بـۆ ئیصـلاحی منالـەکانیان، جـا نۆرەی ئەوەیە بکەونە فکـری ڕێنمـایی کـردنو هیدایـەتی خـەڵکی‌تر، ئەوانەی ئامادەییان هەیە بۆئەوەی لـە خـوا بترسـن و تـەقوایان هـەبێ، عەرزی خوا ئەکەن ﴿وَاجْعَلْنَـا لِلْمُـتَّقِينَ إِمَامـاً﴾ : خوایـە ، بمانکـە

بەپێشەواو ئیمام بۆئەوانەی تەقواو لەخوا ترسانیان هەیە، تا ئێمەش ببین بەرێ ڕوونکەرەوە و سەرمەشق بۆیان .

﴿أُوْلَئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَاماً. خَالِدِينَ فِيهَا حَسُنَتْ مُسْتَقَرّاً وَمُقَاماً﴾ : ئەوانـەی کـە ئاوان، جـەزا و پاداشتیان پێ ئەدرێتەوە، لەبەهەشتا ژووری باڵە خانەی چەند نهۆمیان پێئەدرێ، لەبەرئەوەی صەبریان گرت وتەحەمولی گیروگرفت و ڕەنج و زەحمەتیان کرد ، تا ئەو خووڕەوشتە باشانەیان بۆ خۆیان بەدەست هێنا و، لەو خووڕەوشتە خراپانە دووریان گرت و، دامەزران لەسەر ئەوە .. ئەوانە کاتێ ئەڕۆنە بەهەشت بە ڕێزو تەعزیمەوە مامەڵەیان لەگەڵ ئەکرێ ، دوعای خێریان بۆ ئەکرێ و سەلامەتیان پێ ئەدرێ ، کەبۆ هەمیشە لەناو ئەوەدا ئەمێننەوە ، لەجێگایەکدا کە باشترین جێگایە بۆ دامەزران و مانەوە و نیشتەجێ بوون .

## بەشێك لە تەفسیری سورەتی (الحجرات)

لە سورەی (الحجرات)یشدا چەند شتێکیتر- لەوانەی ئەبێ ئینسانی موئمین ڕیعایەتیان بکاو هۆشی پێیانە وەبێ - بەیان کراون ، بەم تەرتیبە :

لەپێشا ئەوانەی ئیمانیان هێناوە پێیان ئەفەرموێ : هۆشتان بەخۆتانەوە بێ، نەکەونە پێش خواو پێغەمبەرەکەی . پێشکەوتن ئەوەیە ئینسان شتێ ئەنجام بدا پێش لەوەی بزانێ فەرمانی خوا لەو بارەیەوە چی ئەبێ، پێش لەوەی بزانێ خوا فەرمویەتی چۆنی ئەنجام بدا . ئینسانێ بیەوێ بەندەیی خوا بکا، هەرگیز کاری وا ناکا، هەمیشە ماتڵ ئەبێ و چاوەڕوان ئەبێ خوا و پێغەمبەری خوا پێشکەون و ڕێگە ڕۆشن کەنەوە، ئەنجا بەشوێن ئەواندا ئەڕوا، یانی هەمیشە ماتڵی ئەوەئەبێ دەستورو فەرمان لەلایەن خواوە بێت و ڕێگای بۆ ڕۆشن بکاتەوە ، جادوای ئەوە ئەکەوێتە حەرەکەت و ئەو شتە کە ئەیەوێ ئەنجامی ئەدا.

* بەشوێن ئەوەدا ڕێنمایی موسوڵمانان ئەکا بۆئەوەی ئیحترامی پێغەمبەری خوا بگرن، ئەو پێغەمبەرەی خەبەری هیدایەت و دینی خوای بۆ هێناون و، ڕێی بەندەیی بۆیان ڕۆشن کردۆتەوە ، ئەبێ لەگەڵ ئەودا بە ئیحترام و ڕێزەوە هەڵس وکەوتیان هەبێ، دەنگیان لەدەنگی ئەو

بەرزترنەکەنەوە، هەروەك بە دەنگی بەرز لەگەڵ خەڵکی تر قسە ئەکەن لەگەڵ ئەو قسە نەکەن .. ئەوە ئەبێتە سەبەبی ئەوەی کردارە باشەکانیان زایە بېن و لەبەین بچن .. جا وەسف و سەنای ئەوانە ئەکا کە دەنگیان نزم ئەکەنەوە و بەدەنگی هێواش لە حزوری ئەودا قسە ئەکەن، ئەوانە ئەهلی تەقواو لە خوا ترسانن، بۆیە وەعدی ئەوەیان پێ ئەدا کە لەگوناهەکانیان خۆش بێ، ئەجرو پاداشتی گەورەیان بداتەوە، سەرزەنشتی ئەوانەش ئەکا کە ڕیعایەتی ئەو ئەدەبو ئیحترامە ناکەن . کاتێ پێغەمبەری خوا لە یەکێ لە ژوورەکانی خۆیدایە، هەر لەدەرەوە بانگی ئەکەن ، ئەزیەتی ئەکەن ، نایەڵن بەرنامەیەك کە خۆی داینــاوە بۆکارو چالاکی خۆی ، ڕیعایەتی بکا ـ حەتتەن پێغەمبەری خوا بێ کارو بێ بەرنامە لەو ژوورانەی ماڵی خۆیدا نامێنێتەوە ، هەرکاتێ کە لەوێ نیش و کاری نەما خۆی دێتە دەرەوە ـ جا خوا ئەفەرموێ : ئەگەر صەبریان بکردایە تا بهاتایەتە دەرەوە، ئەوە باشتربوو..

جا پێویستە ئەوە بزانین ئەمە تایبەتی پێغەمبەری خوا نیە، بەڵکو لەهەر زەمانێکدا هەرکەسێ ڕێبەر و ڕێنیشاندەری خەڵکی بێ بۆ ڕێگای بەندەیی خواو بە ڕاستی ڕێبەرو سەرمەشق بێت ، ئەبێ ئاوەها ئیحتیرام و ئەدەبێك لەگەڵی ڕیعایەت بکرێ .

* دوای ئەوە بە موسوڵمانەکان ئەفەرموێ کە : ئەبێ پەیوەندی وعەلاقەتان لەگەڵ ناموسەڵمان بەم جۆرە بێت : ئەگەر(فاسق)ێك هاتو

خەبەرێکی گرنگی بۆ هێنان ، بێ تەحقیق لێی قـەبوڵ نەکـەن، چـونکە ئەگەر بێ تەحقیق لێی وەرگرن، لەبەرئەوەی کـە(فاسـق)ەو لەسـنوری بەندەیی خـوا دەرچـووە، ئـەوە ڕەنگـە درۆی کردبێ، ئەگـەر ئێـوە خەبەرەکەی لێ قبوڵ کەن و ئیشـێك بکـەن ، بـەهۆی ئـەو خەبـەرەوە ڕەنگە تووشی گوناهێك ببن ، زەرەرێ بە تایەفەیەك و گەلێك بگەیەنن، پاشان لەدوایدا پەشیمان ببنەوە کە ئـەزانکاریتان کـردوە و ئیشێکتان کردوە نەئەبوایە بتانکردایە .

*دوای ئەوە چەند ئایەتیتر هەن .. بەشوێنیانا باس لـەوە ئـەکا کـە برواداران لەناو خۆیانا ئەبێ ڕەفتاریان چۆن بێت، لەگـەڵ یـەکا چـۆن هەڵسن ودانیشن . بە تایەتی کاتێ وان بەیەکەوە، ئەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَومٌ مِّن قَوْمٍ عَسَى أَن يَكُونُوا خَيْـراً مِّنْهُمْ وَلَا نِسَاء مِّن نِّسَاء عَسَى أَن يَكُنَّ خَيْراً مِّنْهُنَّ﴾ : بـانگ ئەکاتـە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، ئەفەرموێ :

هیچ قەومێکتان گاڵتە بەقەومێکی تـر نـەکات و، خـۆی لـەوی تـر زیاتر نەگرێ، وا ئەبێ کە لەبەرئەوەی خۆی بەزیاتر ئـەگرێ ، گەمـە و گاڵتە بەوی تر بکـا، چـونکە ڕەنگـە ئـەوان باشـتر بـن لـەلای خـوا. هەروەها هیچ کام لەژنەکان گاڵتە بـەهیچ کـامیتر لـەخۆیان نەکـەن، چونکە ڕەنگە ئەمان لەوان باشتر بن لەلای خوا.

* ﴿وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ﴾ : هەروەها بەزبان دڵی یەکتر برینـدار مەکەن . قسەی ناخۆش بەیەکتر مەڵێن،کە دڵـی یەکتری پـێ زامـدار بکەن .

* ﴿وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ﴾ : هەروەها لەقـەب و نـاوی نـاخۆش بەیەکترەوە مەنێن، بەجۆرێ کەیەکتر بکەن بە شوهرەو لـەناو خەڵکـدا بەناو و ناتۆرەی ناخۆش مەشهوری بکەن .

* ﴿بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ﴾: چونکە زۆرناخۆشـە ئینسـان دوای ئەوە ئیمان بوو بە ناو بۆی‌و ناوی نرا ئـەهلی ئیمـان‌و بـڕوادار، دوای ئەوە (فاسق بوون) بیێتە نازناوی . (فسوق) واتە : دەرچـون لـە سنوری بەندەیی خوا. زۆر ناخۆشە ئینسان لەپێشا پێی بڵـێن (مۆمـن) دوایی پێی بڵێن (فاسق).

﴿وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ : ئەوانەی تەوبە نەکەن‌و لەم شتانە دەسـتبەردار نـەبن، ئـەوە سـتەمکارن، ئەگـەر توشـی عـەزاب‌و ئەشکەنجە هاتن خۆیـان سـتەمیان لـەخۆیان کـردوە، خـوا زوڵمـی لێ نەکردوون. ئەمە مانای ئەوەیە کە ئەوسـێ شـتە : (گاڵتـە کـردن بـە خەڵك لەبەرئەوەی ئینسـان خۆی بەزیاتر بگـرێ‌و ئـەوان بەژێردەسـتی خۆی بزانێ . هەروەها بەزبان برینـدارکردنی دڵـی خـەڵك و قسـەی خـراپ لەگـەڵ خـەڵك کـردن‌و ئەزیـەت کردنـی خـەڵك بەقسـەی

ناخۆش . پاشان لەقەبی خراپ بەخەڵکەوە نان)، ئەم سێ شتە گوناهی گەورەن، ئەگەر ئینسان لەسەریان بڕواو دەستبەرداریان نەبێت لێیان ، ئەوە لەسنووری بەندەیی خوا دەرچووەو حەقەن تووشی عەزابی خوا ئەبێ و پێی ئەفەرموێ : ئیتر دوای ئەوە کەخوا بەیانی کردوەو ڕێگای ڕۆشن کردۆتەوە ، هیچ جێگای گلەیی نیە، ئەو شەخسە خۆی زوڵمەو ناهەقی بەخۆی ئەکا .

* دوای ئەوە چەند فەرمانێك دەرئەکات بۆ موسوڵمانان تا ڕیعایەتی بکەن . لەکاتێکدا کە لەلای یەکدا نین، لەپشتی سەری یەکتر شتێك کە لایەقی موسوڵمان نیە نەیڵێن . ئەفەرموێ :

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضاً أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾. بانگ ئەکاتە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، ئەفەرموێ : لەگومان بردن ، زۆر دووریی بگرن . لە(وائەزانمەو وائەزانم) واز بێنن، بەبێ ئەوەی شتێکتان لێ ڕۆشن بێ، چونکە هەندێ لەگومانەکان گوناهن و ئینسان لە چوون بەرەو خۆشبەختی دوائەخەن .کەوابوو زۆر خۆتان دوور بخەنەوە لەوگومانانە، نەکو لەوانە بن کە لە چوون بەرەو خۆشبەختی وسەعادەت دواتان بخات .

* هەروەها (تجسس) مەکەن . ئەگەر هاتووگومانێکتان کەوتە دڵ نیسبەت بە موسوڵمانێ مەگەڕێن بە شوێنیدا، بۆئەوەی کە بزانن چیە و چی نیە . خۆ ئەگەر هاتوو زانیتان بە عەیبێکی برایەکی دینیتان ، یان ئەگەرکەمتەرخەمی و نافەرمانیتان کرد و ( تجسس ) تان کرد و تەحقیقتان کرد، یا بەهەر ڕێگەیەك بوو خەبەردار بوون لەوەی کە برایەکی دینیتان عەیبێکی هەیە، ئەوە باهەر خۆتان پێی بزانن و لە پشتی سەر ناوی لای کەسی تر مەبەن ، با کەسی تر پێی نەزانێ . چونکە جاسوسی کردن و گەڕان بەشوێن عەیبی موسەڵمانانندا ، هەروەها ناوی موسڵمان بەخراپ بردن لای ئەم و ئەو، وەك ئەوەیە یەکێ گۆشتی برای مردووی خۆی بخوات، دەی ئایا پێی خۆشە کەسێ لەئێوە گۆشتی براکەی -لەکاتێکا مردووە- بخوا؟ دیارە پێی خۆش نیە .. کەوابە دەی ئەویشتان پێ ناخۆش بێت ، ئەوانەی پێتان وترا مەیانکەن، لێیان دووری بکەن .﴿ اتَّقُوا اللَّهَ ﴾ : خۆتان لەنارازیکردنی خوا بپارێزن . شتێ مەکەن گرفتاری دەستی خوا وعەزابی خوابن .﴿ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ﴾ : ئەوە بزانن خوا زۆر تۆبە قبوڵ ئەکات ، زۆر بەرەحم و میهرەبانە ، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆلای و دەست بکێشن لەوکارانە، حەتمەن گەڕانەوەتان لێ قبوڵ ئەکا ، ڕەحمتان پێ ئەکا، ئەو کارە باشانەی لە دوای ئەو تەوبەیە ئەیکەن لێتان وەرئەگرێ و جەزای باشی ئەوانەتان ئەداتەوە .

* دوایئەوەش باسی ئەوە ئەکات کە خەڵکی – چ ژنان، چ پیاوان ، لە هەر تایفەیەك ، یا هەر قەبیلەیەك، یا هەرگەل و هۆزێك بن– تەنها بەیەك شت لای خوا نرخ و ئیحترامتان هەیە ، ئەویش تەقوا و لە خوا ترسانە .. هەر کەس تەقواو لە خوا ترسانی بوو، لای خوا بەڕێز و موحتەرەمە . هەر کەسێ نەیبوو، لای خوا ڕێزی نیە ، ئەوانەی تەقوایان هەیە هەرکامێکیان زۆرتری بوو ئەوەیان بەڕێزو موحتەرەم ترە لای خوا، ئیتر هیچێکی تر، غەیری تەقوا و لەخوا ترسان لایخوا ڕێز و ئیحترام و نرخ بە ئینسان نادا.

## پوختەیەك لە تەفسیری سورەتی (العصر)

لەدوای ئەمانە بەجێیە سورەی (عصر) – کە سورەتێکی کورتە ، بەڵام سورەتێکی زۆر گەورەیە– بخوێنینەوەو ماناکەی باس بکەین ، کە ئەگەر ئینسان تەنها ڕیعایەتی ئەم سورەتە بکات – هەروەك ئیمامی شافعی ئەفەرموێ – بەسەیەتی بۆ ژیانی، بۆئەوەی بیگەیەنێ بە خۆشبەختی . ئەفەرموێ :

﴿وَالْعَصْرِ. إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ. إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ﴾ .

واتــە : قەســەم بەزەمانــە، ( ئــەو زەمانەی‌کــە وەك ئاوێنەیەکــە ، خۆشبەختی و بەدبەختی و سەرەنجامی خۆشی‌و سەرەنجامی ناخۆشی تێدا دەردەکەوێ . هەروا کە ئەزانین زەمانەو تەئریخ خۆی دەری ئەخا کــێ گەیشت بەخۆشبەختی وکێ گەیشت بە بەدبەختی))، قەسەم بەو زەمانە، هــەر ئینســانێ وا لــەزیانکاری و زەرەرمەندیــدا، (نــە تــەنها ســودێکی دەســت نەکەوتوە، بگرە سەرمایەشی لە دەست داوە) بێجگە ئەوانــەی حەقیان ناسی و تەسلیمی بوون ، ئەوانەی کردەوە چــاکەکانیان ئــەنجام دا، ئەوانەی بەیەکتر (توصیە)وئاموژگــاری و ســفارشــیان کردکــە رێــی حەق بگرن وصەبریشی لەسەر بکەن[1].

---

[1] - لە کۆتایی ئەم بەرهەمەمدا مامۆستا ناصر حارتێکی تر سورەتی العصر واتا لەکات سەیری دواپەڕی بکە (دەزگای بەرهەم).

## پوختەیەك لە ئەحكامی سورەتی (الأحزاب)

هەندێكی تر لە خوورەوشت وكرداره باش و خراپـەكان لـە چـەند ئایەتێكی‌تروچەند سورەتێكی تـری قورئانـدا، ناویـان بـراوە، پێویـستە ئەوانیش باس بكرێن .

لەسورەی ئەحزابدا فەرمانێ ئەدرێ بە پێغەمبەری خوا كـە پێوسـتە موسڵمانان بیزانن، بەتایبەتی ئەو كەسەی خەریكی دەعوەت كردنە بـۆ رێگەی خوا، ئەبێ بیزانێ .. چونكە لـە قۆناغێكی دەعوەتەكەیـدا ئـەگا بەوشتە، ئەویش هاوسەری كەسێكە كە كاری دەعوەت كردنە لە رێـی خوادا، خەڵكی تریش هەر باشە بیزانن، تا تێ بگـەن كـە مەسـئولیەتی ئەوكەسانەی خەریكی دەعوەتكردن و بانگ كردنن بـۆ رێگـای خـوا چیە ، مەسئولیەتی خێزان و خانەوادەی ئەوان چۆنە . ئەفەرموێ :

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الـدُّنْيَا وَزِينَتَهَـا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً. وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْراً عَظِيماً﴾ .

هەموو ئەزانن لەكاتێكدا پێغەمبەری خـوا دەسـتی كـرد بـە بـانگ كردن بۆ رێگای خوا، دەسـتەڵاتدارو حاكمـە زاڵـم و ، تاغوتـەكان و داردەستەیان، دژی وەستان ودەسـتیان كرد بە دوژمنایەتی لەگەڵی و، هەرچیەك لە دەسـتیان هـات دریغیـان نـەكرد، هـەوڵیان دا بۆتـەوەی نەهێڵن ئەو دەعوەتە سەركەوێ .. لە ئەنجامدا چارەیەك نـەبوو غـەیری

ئەوەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ یارانی کۆچ بکەن و، شاری مەککە بەجێ بهێڵن و، بڕۆن بۆ جێگەیەکی تر، تا لەوێ بتوانن مەسئولیەت و وەزیفەی بەندەیی خۆیان جێبەجێ بکەن و، ئەوەی لەسەریانە ئەنجامی بدەن .. بۆیەکۆچیان کرد بۆ مەدینە ،کافرەکانیش هەر وازیان نەهێنا ، چەندین جار لەشکریان کێشا، هوجومیان بردە سەر موسوڵمانەکان، شەڕیان لەگەڵ کردن، بەڵکو بتوانن ئەو دەعوەتە، ئەو بانگ کردنە بۆ ڕێگای خوا، لەبەین بەرن و خۆیان ڕزگارکەن لەدەستی.. جا هەرجارە دەستەیەك لەکافرەکان ئەچون بۆ شەڕ کردن، حزب حزب و دەستە دەستە ، تا دوای ئەوەی چەند جار شکستیان خوارد و نەگەیشتن بە ئامانج و ئارەزوی خۆیان و، بۆیان دەرکەوت ئەگەر حزب حزب و دەستە دەستە بڕۆن هیچیان پێ ناکرێ، کەوابوو با هەموو حزبەکان و هەموو دەستە و گرۆهەکان بەیەکەوە بڕۆنە شەڕی موسوڵمانەکان، تا لەبەینیان بەرن .. ئەوەبوو جەنگی ( ئەحزاب ) (کەلەکۆمەی هەموو حزبەکان) ڕوی دا کە هەموو حیزبەو گرۆهەکان بوون بەیەك بۆلێدانی موسوڵمانەکان . جا لەبەرئەوەی خوای(متعال) هەرگیز ڕێ نادات بەکافرەکان کە کارێ بکەن بەندەیی و عیبادەتی خوا لەسەر زەوی هەڵبگیرێ و، زەمینە نەمێنێ بۆ ئەنجامدانی، موسوڵمانەکانیش دەسەڵاتێکی وایان نەبوو کە دیفاع بکەن لەخۆیان و ، لەگەڵ ئەو هەموو دوژمنانە بە شەڕ بێن ، بۆیە خوای (متعال) ڕاستەوخۆ یارمەتی

دان وکۆمەکی کردن ونەجاتی دان ، بە لەشکرێك کە موسولمانەکانیش نەیاندی، بە لەشکرێك کە خوی ئەزانێ ئەفرادی چەند بوو، حیزبەکان وگرزکافرەکانی شکست دا، ئەو شکست دانە بوو بەهۆی ئەوە جارێکی ترکافرەکان لەبیری ئەوەدا نەبن لە رێگای جەنگ کردن لەگەڵ موسولمانەکانەوە بڕۆن بەگژی ئیسلامدا ..
دوای ئەوە وتیان ئیتر جارێکی تر بۆئەوە ناشێ بەشەربێین لەگەڵ موسولمانەکان ، باشتر ئەوەیە لەرێگایەکی ترەوە بڕۆین ، شتێکی تر بکەین بۆ لەبەین بردنی ئیسلام . ئەوەبوو دەستیان دایە هوجوم کردنە سەر موسولمانان، لە مەیدانی ئەخلاق و خووڕەوشتا، پیلان و نەخشەیان کێشا بۆئەوەی کار بکەنە سەر خێزانە موسولمانەکان، کارێ بکەن موسولمانان لەرێی خووڕەوشتی جوان و ئەخلاقی ئیسلامی لابەن ، گومرایان بکەن، لەو رێگایەوە دەستی خۆیان بوەشێنن و، ئیسلام لەبەین ببەن . جالەبەر ئەوە بوو لە دوای ئەو غەزوەیە (دوای جەنگی ئەحزاب) خوای گەورە ئەم سورەتەی ناردکە تیایدا موسولمانان ئاگادار ئەکاتەوە لەوەی خەتەرێکی زۆرگەورە ڕووی تێ کردوون، کە ئەگەر سەنگەری خۆیان مەحکەم نەکەنەوە، ئەگەر لە خووڕەوشتە خراپەکان بەتەواوی خۆیان بەدوور نەگرن ، ئەوەی خووڕەوشتی باش و جوانە مەحکەم نەیگرن ، بەتەواوی نەبن بەئەهلی ئەخلاقی ئیسلامی و خووڕەوشتی جوانی پەسەند کراوی لای

دەرەوەی نوێژەکەیان ، هەم ناوەوەی نوێژەکەیان ئەکەن، هەرچیەك کە پێویستە لە نوێژەکانیاندا، لە دوعاو سکاڵاکانیاندا، ڕیعایەتی ئەکەن‌و ئەنجامی ئەدەن ، بەجۆرێ کە نوێژەکانیش ئەبن بە ڕێگر لەوەی ئەوان تووشی ئەنجامی کرداری ناپەسەند بن، هەروەك ئەفەرموێ :

﴿إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ﴾.

جا لەبەیانی پاداشتی ئەوانەدا ئەفەرموێ :﴿أُوْلَئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُّكْرَمُونَ﴾ : ئەوانە وان لەناو باخاتێکدا کە لەوێ ڕێزیان لێ ئەگیرێت یا ئەفەرموێ : ﴿الَّذِينَ هُمْ فِي صَلَاتِهِمْ خَاشِعُونَ﴾: ئەوانەی لەناو نوێژو دوعاو سکاڵاکانیاندا کزو گەردنکەچو بە (خشوع)ن بۆ خوای گەورە، ئەزانن هەموو بوونیان نیازمەندی‌یە بە خوای خۆیان، ئەگەر ئەو سوودو قازانجێکیان پێ‌نەگەیەنێ، لە هیچ لایەك دەستیان ناکەوێ . ئەگەر ئەو زیان‌و زەرەرێکیان لێ دوور نەخاتەوە، هیچ شتێکی‌تر و هیچ کەسێکی‌تر ناتوانێ لێیان دوربخاتەوە . بۆیە کاتێ ئەپاڕێنەوەو سکاڵا ئەکەن هەموو گیانیان خۆ نزم گرتنە لە حزووری خوای خۆیاندا . ئەمێ ئینسان لە نوێژدا ئاوابێ .

## هەندێکی تر لە ڕەوشتە باشەکان

لە جێی تریش چەند وانەی تر ، لەو خووڕەوشتانەی ئەبێ موسوڵمان بیبێ باس کراون، کە بە یەکتاپەرستی‌و (تەوحید) دەست پێ ئەکەن (بەوەش تەواو ئەبن). لەئایەتی (٢٣-٣٩) لە سورەتی (الأسراء)دا (١٥) ڕەوشت باس ئەکات ئەفەرموێ :

* (وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ) : خوای گەورە بەیان ئەکا کە بڕیاری داوەو واجبی کردووە ئینسان لە ژیانیا تەنها فەرمانبەرداری خوا بێ و بەندەیی و ئیتاعەت بۆ ئەو بکا.

دوای ئەوە گەورەترین حەقێك کە بەسەریەوە هەیە دوای هەقی خوای گەورە هەقی دایك‌و باوکە، بۆیە ئەفەرموێ :

* ﴿وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً﴾ : فەرمانی داوە ئینسان لەگەڵ باوك‌و دایکی بەباشی بجوڵێتەوەو بە باشی ڕەفتاریان لەگەڵ بکا، بەتایبەت لەکاتێکا زۆر نیازیان هەیە بەو، ئەفەرموێ:

﴿إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيماً ، وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً﴾ : ئەگەر هاتوو یەکێکیان یا هەردوویان ئەوەندە مانەوە کە پیربوون، لای تۆ بوونو نیازیان بە تۆ بوو، لای تۆ ژیانیان بەسەر ئەبرد، ئەوە هەرچەند زەحمەتیان بیێت‌و

چاودێری لێکردنیانو بەخێوکردنیان زەحمەت بێو نارەحەتیت بۆ پێش بێنێ، بیرت بێ یەکجاریش نەڵێی :(ئاه.. هـ..)، نەڵێی:(ئۆف ..) قسەی توندوتیژیان لەگەڵ نەکەی، قسەیەك کە لە گەڵیان ئەکەی با پڕلە ڕێزونیحتیرام بێ و باش بێ، باڵی ڕەحمەتو بەزەیی‌و میهرەبانی و خۆ زەلیلگرتن ڕاخە بۆیان . چونکە نیازیان بەو ڕەحمەتو بەزەیی‌و میهربانی‌یە هەیە . هەروەها دوعای خێریان بۆ بکە، لە خوا بپاڕێرەوە کە بەزەیی بێتەوە پیایانداو ڕەحیان پێبکا . بڵێ: خوایە ، ڕەحم بکە بەوانو بەزەییت بێتەوە پیایاندا، هەروەك ئەوان کاتێك من مناڵ بووم ، بەخێویان کردم، لەپاداشتی ئەو پەروەردەیەی من ، تۆ ڕەحیان پێ بکەو، جەزایان لەباتی من بدەرەوە .

﴿رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمْ إِن تَكُونُواْ صَالِحِينَ فَإِنَّهُ كَانَ لِلأَوَّابِينَ غَفُوراً﴾ : خاوەنەکەتان زانایە بەوەی وا لە دەروونتاندایە، لە هەموو کەس زیاتر ئەزانێ چی لە دەروونتانایە، ئەگەر نیەتی باشتان هەبێ، ئەو لە هەموو کەس باشتر پێی ئەزانێ، جەزاو پاداشت بە پێی ئەوە ئەداتەوە . ئەگەر ساڵح بن . ئەگەرئەعلی‌کرداری چاكو شیاو و باش بن ئەوە دڵنیا بن جەزاو پاداشتتان نافەوتێ، چونکە ئەوانەی هەمیشە ڕوو لە خوان، هەرکاتێ توشی لادانێ لەڕێگەی خوا ئەبن، بە زووترین کات ئەگەڕێنەوە، ئەوە خوا دەرهەقیان (غەفور)ە، هەرکاتێ

ئینسان تووشی لادانو نافەرمانییەك بوو، بە شەرتێك بگەڕێتەوە، لە گوناهی چاوپۆشی ئەكا وئەیبەخشێ .

* ﴿وَآتِ ذَا الْقُرْبَى حَقَّهُ وَالْمِسْكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَلاَ تُبَذِّرْ تَبْذِيراً، إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُواْ إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُوراً﴾:

دوای ئەوە واجب ئەكا لەسەر ئینسان كە لەگەڵ هەندێكی تر لە بەندەكانی خوا، ئەوانەی زۆر نیازیان هەیە بەوەی لەگەڵیان چاكەكاریی بكرێ، لەگەڵیان چاك بێ وكاری باشیان لەگەڵ بكا، ئەفەرموێ : ئەوانەی خزمن، هەقیان هەیە بەسەرتەوە، هەقەكەیان بدە، ئیتر چ حەقی ئیحتیرامو ڕێزلێنان بێ، چ حەقی ماددی بێ، وەك ئەوەی نیازیان بەشتێك لە ماڵو سەروەتت بێت كە ئەبێت پێیان بدەی . هەروەها هەژاران هەقیان بەسەرتەوە هەیە، هەقەكەیان بدە . هەروەها ئەوانەی لەماڵو ماوای خۆیان دووركەوتوونەتەوەو، شتێكیان بەدەستەوە نەماوە، ئەوانەی غەریب كەوتوون، ئەوانیش هەقیان بەسەرتەوە هەیە، هەقەكەیان بدە، بەڵام هۆشت بێ لە هەق ئەداكردنولە بەخشینا حەددێك هەیە، ئەبێ هەروەك لە بەخیلیو هەقی خەڵك نەدان دووریی بكەی، هەروایش لەماڵو نیعمەت پژاندنو زایەكردنی ماڵو نیعمەت ، خۆت دوور بگری . هەمیشە حەدی ناوەڕاست بگرە، نە بە بەخیلی، بە درێغی كردنو نەدانی هەقی

خەلك، نە بە زایەكردنی ماڵو بەپڕاندنیو بەفیڕۆدانی، هیچ كام لەوانە نەكەی، ئەوەی ناوەڕاستە بیگرە، خوا ئەوەی خۆش ئەوێ، نەك ئەوەی ماڵو نیعمەتێ خوا پێی داوی ، بێ‌ئەوەی جێی خۆی بێ صەرفی بكەیو بیپڕژێنی، ئەوانەی وا ئەوە بەرنامەو خووڕەوشتیانە، برای شەیتانەكانن، دیارە شەیتان زۆر زۆر كافرە نیسبەت بە خاوەنەكەی خۆی، ئەگەر تۆش ئاوا بكەی وەك ئەوت لێ دێت .

* ﴿وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ابْتِغَاء رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلاً مَّيْسُوراً﴾ : ئەگەر هاتوو جارێ یەكێ لەوانەی هەقی بەسەرتەوە هەیە، داوای هەقەكەی كردو ئەت بوو، رووت لێ هەڵكرد، لەبەرئەوەی ئێستا شتێكت نیە بیدەیتێ و، بەتەمای ئەوەی خاوەنەكەت رەحمێكت لەگەڵ بكاو، نیعمەتێكت پێ بدا، ئەوا تاكاتێ ئەو رەحمەتەت دەست نەكەوێ، تا هەقی ئەو هەقدارە بدەی، قسەیەكی باشو خۆشو رەحمێ لەگەڵ بكە، بە قسەی خۆش قانعی بكە تاكاتێ ئەو نیعمەتەت نەكەوێتە دەست .

* ﴿وَلاَ تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلاَ تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُوماً مَّحْسُوراً﴾، ئەم ئایەتە مەنعی ئینسانی موسوڵمان ئەكا لەوەی كە بەخیل بێ، هەروەها مەنعی ئەكا لەوەی هەرچییەكی هەیە بەجارێ صەرفی بكاو بیبەخشێ . ئەفەرموێ : وەك كەسێ مەیە دەستی

بەکۆت‌و زنجیر بەستراوە بە ملیەوەو ناتوانێ هیچ بکا، دەستی بەستراوە لەوەی خێرێك بکا . وەك کەسێکیش مەبە بە تەواوی دەستی درێژکردۆتەوەو دەستی بلآوکردۆتەوە، بەجۆرێ هەموو سەروەت‌و ماڵەکەت لە ماوەیەکی کەمدا لەدەس بدەی‌و هەمووی خەرج بکەیت، لە دوایدا داکەوی‌و سەرزەنشت بکرێی بەجۆرێ هەموو هێزو توانایی خۆت لەدەست دابێ‌و هیچێکت نەمابێ .

﴿إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ إِنَّهُ كَانَ بِعِبَادِهِ خَبِيراً بَصِيراً﴾، بەخیل نەبی ،کە (إنفاق) نەکەی و وابزانی ئەگەر هات‌و ئەوەت بەخشی ئیتر هیچت دەست ناکەوێتەوە، چونکە بەراستی خاوەنەکەت ئەگەر ویستی رزق‌و رۆزیی زۆر بەهەرکەس بدا، پێی ئەدا.. ویستیشی لەهەرکەسی بگرێتەوە نەیگێڕێتەوە . هەروەها هەموو سەروەت‌و ماڵەکەشت بەجارێ خەرج نەکەی‌و نەیدەی بەم‌وبەو، وابزانی ئەگەر بێت‌و تۆ زیادە لەحەد (إنفاق) نەکەی‌و ماڵ خەرج نەکەی خەڵکی لە بەین ئەچن، چونکە خاوەنەکەت چاوی لە خەڵکی‌یە، خەبەری لێیانەو ئاگادارە، ئەزانێ کێ نیازی بەچیەو کێ چ رزق‌و رۆزییەکی ئەوێ ،کەی پێی بدرێ پێی ئەدا، تۆ حەدی ناوەراست ریعایەت بکە، ئەملاوئەولا مەکە . دوایی ئەفەرموێ :

* ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ أَوْلادَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلاقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُم إنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ خِطْءاً كَبِيراً﴾ : منالەکانتان لە ترسی ئەوەی نەکو نەدار بکەونو ماڵودارابیتان نەبێ خەرجی کەن بۆیان، مەکوژن . چونکە ئێمە ڕۆزیی ئەوان ئەدەین، هەروەها ڕۆزیی ئێوەیش ئەدەین، ئێوە ئیجازەی ئەوەتان نیە بیانکوژن، رزقو ڕۆزییەکیشمان بۆ ئەوان داناوە . بەراستی کوشتنیان لادانێکی گەورەیە لەرێگەی بەندەیی .. ئەڵبەتە لەم زەمانەدا، ئائەمە ئەنجام نادرێ، بەڵام شتێکی نزیك بەمە ئەنجام ئەدرێ ئەویش ئەوەیە خەڵکی لەبەرئەوەی منالەکانیان بە حسابی خۆیان داهاتوویەکی ڕۆشنیان بێ، وەسیلەی ژیانیان دەسکەوێ، دەستیان لێ بەرئەدەن، لەتەربیەتو بەخێوکردنیاندا بەجۆرێ ئیسلام دەستور ئەدا هیچ هەوڵێکیان لەگەڵ نادەنو کەمتەرخەمی ئەکەن، لەجیاتی ئەوە هیدایەتیان بدەنو بیانخەنە سەر ڕێگای بەندەیی، تەنها هەوڵیان ئەوەیە بەرەو ئەوە بیانبەن مەعاشێکیان دەست کەوێ، بەرەو ئەوە بیانبەن وەسیلەی ژیانیان دەسکەوێ، هەر ئابەوە کارێکیان لێ ئەکەن وەك ئەوەی کوژرابن وایان لێ دێت . ئەگەر ئینسان یەوێ خوا لێی رازی بێ، واجبە لەسەری منالی بەجۆرێ پەروەردە بکا، ڕێگەی بەندەیی خوابگرێ . ئەڵبەتە ئەمە بە مەعنای ئەوەش نیە موسوڵمان کارناکاتو هەوڵ نادا، تەنها ماناى ئەوەیە ئینسان لەسەریەتی بەندایەتیو عیبادەت بۆ خوای گەورە بکا . جا هەر لە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەدا وەسیلەیەکیش بۆ

ژیانو رزقو رۆزی بەکاردێنێ، نیز حەتمی‌یە ئەوەی خوا کردویەتی بە رزقی پێی دەگات و لێی بەشدار ئەبێ .

* ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ الزِّنَى إِنَّهُ كَانَ فَاحِشَةً وَسَاء سَبِيلاً﴾: لە زینا نزیک مەکەونەوە، چونکە ئەوکردارە کردارێکی زۆر سوکو ناپەسەندە، رێگای ئەنجامدانی ئەوکردارە زۆر رێگایەکی پیسەو پێیدا مەڕۆن .

* ﴿وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالحَقِّ﴾ : کەسێک خوا کوشتنی حەرام کردووە مەیکوژن، مەگەر ئەوەی هەقێ بەسەریەوە بێ . کەسێکیش هەقی بەسەرەوەیەو مۆڵەتی کوشتنی هەیە ،کە کەسێکی تری بە ناهەق کوشتبێ، یا فەساد بخاتە رێ لەسەر زەویدا..(ئەوەش بەپێی بڕیار و لە دەزگای خۆیەوە جێبەجێ دەکرێ ) .

لەلایەکیترەوە قورئان خۆی باسی کردووە ئەو فەسادە چیە، رۆشنی کردۆتەوە تەنها لەو دوو حاڵەتەدا ئەکرێ ئینسان بکوژرێ، لە غەیری ئەوانەدا – واتە غەیری ئەوەی فەسادێکی کردبێ، هەروەک قورئان باسی ئەکا، یا قەتڵێکی کردبێ – جایز نیە بکوژرێ، ئەگەر چی کافریش بێ .

﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُوماً فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِ سُلْطَاناً فَلاَ يُسْرِف فِّي الْقَتْلِ إِنَّهُ كَانَ مَنْصُوراً﴾: بۆ ئەوەی بەرنامەیەك بێ بۆ تۆڵە سەندنەوە، لە کاتێکا

کەسێ کەسێکی ئەکوژرێ، خوای گەورە باس ئەکا فەرمانی تایبەتیمان دەرکردووە بۆ تۆڵەسەندنەوە . ئەفەرموێ : لەکاتێکا کەسێکتان ئەکوژرێ ریعایەتی ئەوە بکەنو لەوە لامەدەن ، ئەگەر ریعایەتی ئەوە بکەن تۆڵەی خۆتان ئەسێنەوەو داخی دڵتان دەرئەچێ، هەقتان نیە زیادەڕەوی بکەنو، لەوە زیاتر برۆن، هەرکەس بە ناهەق‌وەمەزڵومانە کوژرا، ئەوە بۆ ساحیب خوێنەکەی، بۆ سەرپەرشتەکەی، دەسەڵاتێکمان داناوە، هەقی ئەوەمان پێداوە قاتڵەکە بکوژێتەوە، جا با هەرئەوە بکاو زیادەڕەوی نەکا ،کەسیتر غەیری قاتڵەکە نەکوژێتەوە.. خۆ ئەگەر زیادەڕەوی نەکا، ئەگەر گوێ بەفەرمانی خوا بدا ، خوایش کۆمەکی ئەکا بۆ ئەوەی هەقی خۆی بسێنێتەوە (دیارە ئەوەش لە رێی قەزاوە ئەکرێ، نەك هەرکەس بۆ خۆی).

* ﴿وَلاَ تَقْرَبُواْ مَالَ الْيَتِيمِ إِلاَّ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّى يَبْلُغَ أَشُدَّهُ﴾ :

نزیکی ماڵی هەتیو مەکەونەوە، مەگەر بەشێوەیەك کە باشترین شێوە بێ . شێوەیەك لەوە شێوەی باشتر نەبێ بۆ نزیك کەوتنەوە لە ماڵی بێباوك . شێوەیەك کە زۆرترین مەسڵەحەتی تیابێ بۆ ئەو. تا کاتێ ئەگاتە سنورێك بەتەواوی خۆی ئەگرێ، ئەبێتە پیاوێ یا ژنێکی کامڵ‌و وای لێ دێت خۆی ئەتوانێت دیفاع لەحەقی خۆی بکا، لە حاڵەتی هەتیوبونو لاوازی دەردەچێت .

* ﴿وَأَوْفُواْ بِالْعَهْدِ إِنَّ الْعَهْدَ كَانَ مَسْؤُولاً﴾ :هەروەها وەفا بکەن بە عەهدو پەیمان، ئەگەر پەیمان و عەهدێکتان لەگەڵ ئەبەسرێت ، تا سەر ببەن ، چونکە پەیمانێك کە لەگەڵ ئینسان ئەبەسرێ حەتمەن لەدوایدا لەو ئینسانە پرسیار ئەکرێ لەسەری، ئایا وەفای پێ کردووەو بردوویەتیە سەر، یان نا؟ ئەگەر نەیبردبووەتە سەر، حەتمەن تووشی سزایەك ئەبێ، مەگەر تۆبەی کردبێ ؛

* ﴿وَأَوْفُوا الْكَيْلَ إِذا كِلْتُمْ وَزِنُواْ بِالقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً ﴾ : لەکاتێکدا شتێك بە کاسەمەنو شتیوا ئەپێون، بەتەواوی ریعایەتی ئەو پێوانە کردنە بکەن . ئەگەر بۆ خۆتان شتێ وەرئەگرن زیاترلە ئەندازە وەرمەگرن . ئەگەر حەقی کەسیتر لاتانە، کاتێ ئەیدەنەوە کەمتر نەبێ لەوەی ئەیبێ بیدەن .. کاتێك شتێ ئەکێشنو وەزنی ئەکەن، ئەویش با بە میزانێ بێ ڕێکوپێك بێ، کەم و زیادی تیا نەبێ . ئائەوە باشترە، ئەوە سەرەنجامی چاکترە بۆتان .

* ﴿وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولـئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً﴾: مەکەونە شوێن ئەوەی پێی نازانن و ئاگادار نین لێی . خوای (متعال) بۆیە هێزی بیستنی پێداون، بۆیە هێزی بینینی پێداون، بۆیە دڵی پێداون، کە بەکاریان بێنن بۆ زانینو شتیان پێبزانن، دوای ئەوە شتێکتان زانی، شوێنی کەونو ئەنجامی

بدەن .. لەسەر هەرکام لەوانە لە دوارۆژدا پرسیارتان لیّ ئەکریّ ، پرسیار ئەکریّ چۆن سوودتان بینی لە گوێتانو هێزی بیستنتان؟ چۆن سوودتان بینی لە دڵتانو کەڵکتان لیّ وەرگرت؟ ئەگەر بەو جۆرە خوا داواتان لیّ ئەکا کەڵکتان لیّ وەرنەگرتبێ‌و، بەکارتان نەهێنابێ بۆ ئەوەی کە شت بزانن جا عەمەلی پێ بکەن، ئەوە مەحکومن‌و خوا سزاتان ئەدا، تەنها لە کاتێکا لە ئەشکەنجەو ئەزیەت‌و ئازار رزگار ئەبن ، ئەو شتانەتان بەکارهێنابێ،کە خواپێی داون ، بۆئەوەی عیلم‌و زانستتان دەست کەوێ، تا بە زانستەوە بجوڵێن‌و ژیانتان بەسەر بەرن .

کەوابوو پێویستە لەسەر ئینسان (بیستن)و( بینین)و (هێزی دڵ)ی بەکاربێنیّ بۆ ئەوەی خوا بناسیّ، چاك‌وخراپ لەیەك جیا بکاتەوە، دروست‌و نادروست و خێرو شەڕ بناسیّ .. پاشان ئەوەی خێرە ، بیگریّ . ئەوەی شەڕە ، وازی لیّ بێنیّ‌و دەستی لیّ بەردا.

* ﴿وَلاَ تَمْشِ فِي الأَرْضِ مَرَحاً إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ الأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ الْجِبَالَ طُولاً﴾ : بە جۆریّ مەچۆ بەسەر زەویدا کە دڵ بە خۆت خۆش بکەی‌و وابزانی شتێکی.. بە تەکەببور و خۆ بە شت زانینەوە مەچۆ بەسەر زەویدا، چونکە خۆ هەرچییەك بی ناگەیتە ناستیّ کە زەوی بدڕی، یا وەك کەژوکێوەکان قامەتت بەرزبێ‌و بگەیتە بەرزایی ئەوان! تۆ چیت؟ تەماشای خۆت بکە، بزانە چیت؟ خۆت بناسەو خۆت بە شتێك زیاتر لەوە کە هەیت، مەزانە !!

﴿كُلُّ ذَلِكَ كَانَ سَيِّئُهُ عِنْدَ رَبِّكَ مَكْرُوهـــاً﴾ : هەموونەوانـەی بـاس کران، ئەوەیان کە خراپـە لای خاوەنەکـەت ناپەسـەندە، ئـەو بەباشـی نازانێ، دیارە هەرکەسێکیش بەندەی خوابێ ئەبێ ڕیعایـەتی ئـەوە ئـەکا کە لەوخراپانە دووری بکا .(ذَلِكَ مِمَّا أَوْحَى إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ الْحِكْمَــةِ وَلاَ تَجْعَلْ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ فَتُلْقَى فِي جَهَنَّمَ مَلُوماً مَدْحُوراً) : ئەوانـەی باس کران لەو حیکمەتەیە کە خاوەنەکەت بۆتی ناردووە، بەرنامەیەکـە ئەگەر ڕیعایەتی بکەی ئەتوانی بەندەیی خوا بە جۆرێ بکەی نە تووشـی لادان بـەرەو لای زیـادەڕەویو (إفـــراط) بیـی، نـە تووشـی لادان بەرەوکەمتەرخەمیو کەمکاریو (تفریط) بیـی .. بـۆ ئـاخر جـار پێـت ئەڵێینەوە لەگەڵ خوادا فەرمانڕەواو فەریادڕەسی تـر قـەرار مـەدە، لـە ژیانتا پەیڕەوی لـە فەرمانڕەوایتر مەکە، تەوەککول مەکە سەر کەسیتر غەیری خوا، داوای کۆمەك لـە غەیری ئەو مەکە، تۆ کە خـوات هەیـە، تۆ کە (اللّٰه) فەرمانڕەواو فەریادڕەستە ، تیز کەسـیتر بـە فـەرمانڕەواو فەریادڕەسی خۆت دامەنێ، تـا بـە سەرزەنشـکراویو دەرکـراوی لـە ڕەحمەتی خوا نەخرێیتە دۆزەخ .

(بەم جۆرە ئەم چـەند ڕەوشـتەش بەیەکتاپەرسـتی دەسـتیان پێکـراو بەوەش کۆتایی هات).

**ئامۆژگارییەکانی لوقمان بۆ کوڕەکەی :**

*لە سورەی لوقماندا هاتووە، لوقمان -کە یەکێ لەبەندە ساڵحەکانی خوایە- نەسیحەتی کوڕەکەی خۆی ئەکرد، نەسیحەتەکەی وا دەست پێ‌کرد کە مەنعی کوڕەکەی کرد لەوەی شەریك بۆ خوا قەراربدا، کەسی تر غەیری خوا بە فەرمانڕەوای خۆی یا فەریادڕەسی خۆی بزانێ . بەیانی ئەوە ئەکا کە هاوەڵ بۆ خوا قەراردان چەندە گەورەیە .

*دوای ئەوە خوای (متعال) خۆی بەیانی ئەوە دەکات : بە شوێن حەقی خوادا، حەقی دایكو باوکیش بەسەر ئینسانەوەیە . ئەبێ ریعایەتیان بکا، بەتایبەت دایك کە ڕەنجو زەحمەتی زۆری کێشاوە، لە (٣٠) مانگدا لەگەڵ منال، لای کەم (٦) مانگ بارداریی، (٢) ساڵیش شیر پێ‌دانو بەخێوکردن . خوا ئەفەرموێ : تەنانەت ئەگەر دایكو باوك فرمانیان بەتۆ دا کە شەریکی بۆ قەرار بدەیو لەرێی بەندەیی دەربچی، لەو حاڵەیشدا ئەبێ هەر لەگەڵیان بەشێوەی پەسەند ڕەفتار بکەی، بە گوێیان مەکە، فەرمانبەرداری‌یان لێ مەکە، لە کاتێکا فەرمانێ ئەدەن کە نافەرمانی خوای تیایەو گوناهە، بەباشیو پەسەندی لەگەڵیان ڕەفتار بکە، ئەوە کە دەستور ئەدەن شەریك بۆ خوا قەرار

بدەی‌و لەرێی بەندەیی دەربچی، ئەوە نابێتە بەهانە کە لەگەڵیان بەدرەفتاریی بکەی .

*دوای ئەوە رۆژی قیامەت‌و مەسئولیەت‌و پرسینەوە ئەخاتەوە بیر، تا هەست بە مەسئولیەت بکا.

*پاشان فەرمانی گەورەترین کردەوەی چاك دەدا کە نوێژە، ئەفەرموێ: ﴿يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ﴾، کورەکەم! نوێژ بەجێبێنە . نوێژ بکە . بەڵام کردنێ کە بە هیچ لایەکا کورتی‌و ناتەواویی نەبێ، هەم رووی دەرەوەی، هەم ناوەوەی . نوێژێ (خشوع)و خۆکزکردن لەبەردەم خوای تێدابێ . نوێژێ کاتێ ئەیکەی هۆشت بەلای‌کردەوەکانیەوە بێ، بەلای ئەو کەلیمانەوە بێ‌کە تیایدا هەیەو، بە زبان ئەیڵێی . نوێژێ ئەو شتانەی فەرزو واجبە ریعایەتت کردبێ . ئەو شتانەی شەرتن‌و ئەبێ ببن وەك دەستنوێژو غەیری ئەوانە، ئەوانەت ریعایەت کردبێ، هەموو لایەکی نوێژەکەت نوێژ بێ، سکاڵاو پارانەوەی راستەقینەی لای خوابێ .(ئەمە مانای ئیقامەی نوێژە) .

دوای‌ئەوەکە ئەودەستورەی پێئەدا، دوای ئەوە کە کورەکەی عەقیدەی پاك‌و دروست ئەبێ‌و، ئەبێ بە ئەهلی نوێژکردن، بەو جۆرەی باس کرا، دەستوری پێئەدا کە (ئەمر بە مەعروف‌و نەهی لە مونکەر)بکا، ئەفەرموێ :

* ﴿وَأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وَانْهَ عَنِ الْمُنكَرِ﴾ : ئەگەر دیت کەسێ کردەوەیەکی پەسەندی تەرك کردووەو ئەنجامی نادا، ئەمری پێ بکە کە ئەنجامی بدا. ئەگەر دیت کەسێ شتێکی ناپەسەند ئەنجام ئەدا نەهی لێ بکەو قەدەغەی بکە لە ئەنجام دانی . دیارە لەم مەیدانەدا گرفتاری زۆرو دەردی سەری‌و ئەزیەت‌و ئازارت تووش ئەبێ، لەبەرئەوە ئەفەرموێ :

* ﴿وَاصْبِرْ عَلَى مَا أَصَابَكَ﴾ : صەبر بکە لەسەر ئەو شتەی تووشت ئەبێ . هەرشتێ کە تووشت ئەبێ لە مەیدانی (ئەمر بە مەعروف‌و نەهی لە مونکەر)و، بەیان کردنی ڕێگەی هەقا، سەبری لەسەر بکە، شکست مەخۆو مەگەڕێ دواوە. ﴿إِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾: بەراستی ئەوە کە ئینسان صەبر بکا لەسەر ئەوانە، ئەوە لەو شتانەیە کە زۆر گرنگن، ئەبێ ئینسان عەزمی بێ لەسەریان .

* ﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحاً﴾ : وانەبی لەگەڵ خەڵکی کە بەکەمیان بزانی‌و خۆت بە گەورەتر لەوان بگری، بە جۆرێ لەکاتی دیدار لەگەڵیان‌و پێگەیشتنیان‌و قسە لەگەڵ کردنیان، ملت لارکەیتەوە لێیان‌و، خۆت لێیان لادەی بەلای تردا، قیزت ئەهێنێت کە تەماشایان بکەی‌و، لەگەڵیان ڕووبەڕووبی ..

هەروەها کاتێ ئەچی بەسەر زەویدا بە فیزو خۆبەشت زانینو دڵ بە خۆخۆشکردنەوە مەڕۆ. ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾ : چونکە خوا خۆشی لە هیچ کەسێ نایەت کە خۆی بە شت ئەزانێ و فەخر ئەفرۆشێو ناز ئەکا بەسەر خەڵکا .

﴿وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ﴾ : لە ڕێکردنتا، حەدی ناوەڕاست بگرە، نەپەلەو بەڕاکردن بڕۆ، نە هەر تەواویش لەسەرخۆ. ئەوەی کە ناوەراستە بیگرە، خوا خۆشی دێت لە ناوەڕاست گری، نە کەمکاریو نەزیادەڕەویی .

﴿وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ﴾ : لەدەنگت کەم بکەرەوە، ئەگەر نیاز نییە بەوەی دەنگت بەرزکەیتەوە، بەرزی مەکەوە. چەندە نیاز هەیە بە دەنگ بەرزکردنەوە هەرئەوەندە بەرزی بکەوە، چونکە : ﴿إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ﴾: ناخۆشترین دەنگەکان دەنگی گوێدرێژەکانە ،کە زۆر بەرزی دەکەنەوە، لەبەرئەو زۆربەرزکردنەوەیە زۆر زۆر ناخۆش ئەبێ، جا تۆ دەنگ بەرز مەکەرەوە تا ئەو ناخۆشییە بۆ دەنگت پەیدا نەبێ .

## بەشێ لە تەفسیری سورەی (الفرقان)

لە سورەتی (فرقان)یشدا هەندێ شتی تر بەیان ئەکا، ئەوانەیان تا ئێستا باس نەکراون ئەمانەن: ئەفەرموێ :

* ﴿وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا﴾: بەندە راستەقینەکانی خوای رەحمان، ئەو کەسانەن کاتێ ئەڕۆن بەسەر زەویدا بە تەوازوعەوە ئەڕۆن، خۆیان زل ناگرن، خۆیان گەورەتر لە خەلکی ترنا گرن . ئەلبەتە ئەمە بەمەعنای خۆ زەلیل گرتن لەبەردەست ناموسلمانانو دەسەلاتدارانا نیە، موسولمان عیززەتی هەیە، سەربەرزە، خۆی بۆکەس کز ناکا، سەری خۆی بۆ کەس دانانەوێنێ، بۆ غەیری خوا کزی نانوێنێ، بەلام کاتێ هاتوچۆ ئەکاو ئەڕوا بەملاولاداو ڕووبەڕوو ئەبێتەوە لەگەل خەلکی، ئیهانەتیان پێناکا، بەکەمیان نازانێ، خۆی لەوان زیاتر ناگرێ ..

* ﴿وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا﴾ : ئەوانەشن کاتێ نەزانەکان قسەیان لەگەل ئەکەن بە نەزانینەوە ، ئەیانەوێ تووشی پێکدادانو شەڕ و هەرایان بکەن، سەلامیان لێ ئەکەن، دوعای سەلامەتیو خێریان بۆ ئەکەن، خۆیان لە دەستیان ڕزگار ئەکەن و، جەنگیان لەگەل ناکەن .

* ﴿وَالَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمْ سُجَّدًا وَقِيَامًا﴾ : هەروەها بەندەکانی خوا ئەوانەن کەلە شەودا بۆ خاوەنەکەیان (بۆخوای گەورە) کڕنوش ئەبەن،

سەری بەندەیی لەسەر زەوی دەنێن . لەکاتی بەندەیی کردن بۆ خوا و سکاڵا و ڕاز و نیازدا هەڵدەستن و(قیام) ئەکەن . لەشەودا نوێژ ئەکەن، لەنوێژەکانیانا لەخزمەتی خوای خۆیانا ڕائەوەستن . هەروەها سەری بەندەیی ئەنێنە سەر خاك . جا لای کەمی شەو هەستان نوێژی مەغریب وعیشایە، لای تەواویشی (نوێژی ویتر)ە،کەئەویش لای زۆرەکەی (١١ ) ڕەکعەتەو لای کەمی ڕەکعەتێکە و ئەگەر سێش بێت باشترە .

* ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا اصْرِفْ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَاماً. إِنَّهَا سَاءتْ مُسْتَقَرّاً وَمُقَاماً ﴾ : ئەو بەندانەی خوا لەگەڵ ئەوەی کەئەو هەموو ئەرکانە جێبەجێ ئەکەن، واشزانن ئەو کردەوە چاکانە حەقەن ڕزگاریان ئەکەن لەعەزاب، چونکە ئەوانە تەنها سەبەبێکن ، ئەگەر خوا نەیەوێ ئەو سەبەبانە خۆیان هیچ ناکەن، جا لەبەرئەوە ڕوو ئەکەنە خاوەنەکەی خۆیان و هاوار ئەکەن کە: ئەی خاوەنەکەمان، عەزابی جەهەنەمان لێ لادە . وا ئەکەوێتە دڵیان وەك ئەوەی عەزابی جەهەنەم خەریکە بەرەو ڕوویان دێ، مەگەر خاوەنەکەیان ـ خوای گەورە ـ لێیان لادا..

جەهەنەم جێگایەکە زۆر ناخۆشە، جێگای قەرارگرتنی ناخۆش و، جێ مانەوەیەکی ناخۆشە. قەرارگەیەکە نیشان بەڕاستی قەراری تیا ناگرێو تیایا دانامەزرێ..

* دوای ئەوە باسی ئەوە ئەكا كە لەمەوپێش ڕوشن كرایەوە، ئینسان لەخەرجكردنی ماڵ و لەئینفاقا ئەبێ حەدی ناوەڕاست بگرێ ، نە زیادەڕەویی، نەكەمكاریی، بەشوێن ئەوانەدا چەند شتیتر ئەفەرموێ : یەكێكیان شەریك بۆ خوا قەرار دانە، یەكێكیان كوشتنی ناهەقە، یەكێكیان زینایە ، جا ئەفەرموێ : ئەگەر كەسێ ئەمانە بكا حەتمەن بۆ هەمیشە لەئاگری جەهەنەمدا ئەمێنێتەوە، مەگەرتەوبەی كردبێ و بەزوویی گەڕابێتەوە و ئیمان و عەمەلی سالحی كردبێت بەكارو پیشەی خۆی .

* ﴿وَالَّذِينَ لَا يَشْهَدُونَ الزُّورَ﴾ : ئەوانەی شایەتی درۆ نادەن، لەگەورەترین شت تا بچوكترین شت، شایەتی نادەن بەوەی كە كەسیتر غەیری خوا ئەكرێ فەرمانڕەوا یا فەریادڕەس بێ .. هەروەها هیچ شایەتیەكی درۆ نادەن .

* ﴿وَإِذَا مَرُّوا بِاللَّغْوِ مَرُّوا كِرَاماً﴾ هەروەها كە ئەڕۆن بەلای شتێكی بێهودەدا بەشێوەی ئەوانەی كە بەڕێزن بەو شێوەیە خۆیانی لێ لائەدەن و ناچن بەدەم ئەو شتە بێ هودانەوە و خۆیان خەریك ناكەن پێیانەوە ..

* ﴿وَالَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّوا عَلَيْهَا صُمّاً وَعُمْيَاناً﴾ : وەسفێكی تری بەندەكانی خوا ئەوەیە كاتێك ئایەت و نیشانە و

دەلیلەکانی خاوەنەکەیان بیریان خرایەوە ، هەروا کەروکوێر خۆ ناخەن بەملیانا و دیققەتیان تیا نەدەن ، سەرنجیان نەدەن ، بیریان لێ نەکەنەوە تا زیاتر و زیاتر خوایان پێ بناسێنن ، تا زیاتر هەست بەمەسئولیەت بکەن و وەزیفەی بەندەیی خۆیان بناسن .

* ﴿وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ﴾ : هەروەها ئەوانە دوای ئەوەی خۆیان ئیصلاح کرد وئەوکارە باشانەیان ئەنجام داو لەوکارە خراپانە دووریان گرت، ئۆبەی ئەوەیە خەریکی ئیصلاحی ژن و منالّیان بن . جا هەرچی هەولّی خۆیانە ئەیدەن، پاشان لەبەرئەوەی ئەوان تەنها رێنمایی‌کردنیان لەسەرەو ئەزانن هیدایەت بەدەست خوایە، هاوار ئەکەنە لای خوای‌خاوەنیان و ئەلێن : ئەی خاوەنەکەمان، لە ژن و منالەکانمان چی‌ئەبێ بەمایەی فێنکی چاومانو خۆشی دلّمان، ئەوەمان بۆ قەرار بدە . خوایە ژن و منالەکانمان تەوفیق بدە کەئیصلاح ببن‌و، رێگای بەندەیی بگرن، تا ئێمەش دلّمان خۆش بێ و چاومان فێنك بێتەوە ..

*دوای ئەوەی هەولّی خۆیان دا بۆ ئیصلاحی منالەکانیان، جا نۆرەی ئەوەیە بکەونە فکری رێنمایی کردنو هیدایەتی خەلکی‌تر، ئەوانەی ئامادەیان هەیە بۆئەوەی لە خوا بترسن و تەقوایان هەبێ، عەرزی خوا ئەکەن ﴿وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾ : خوایە ، بمانکە

بەپێشەواو ئیمام بۆئەوانەی تەقواو لەخوا ترسانیان هەیە، تا ئێمەش ببین بەرێ ڕوونکەرەوە و سەرمەشق بۆیان .

﴿أُوْلَئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَاماً. خَالِدِينَ فِيهَا حَسُنَتْ مُسْتَقَرّاً وَمُقَاماً﴾ : ئەوانەی کە ئاوان، جەزا و پاداشتیان پێ ئەدرێتەوە، لەبەهەشتا ژووری باڵە خانەی چەند نهۆمیان پێئەدرێ، لەبەرئەوەی صەبریان گرت وتەحەمولی گیروگرفت و ڕەنج و زەحمەتیان کرد ، تا ئەو خووڕەوشتە باشانەیان بۆ خۆیان بەدەست هێنا و، لەو خووڕەوشتە خراپانە دووریان گرت و، دامەزران لەسەر ئەوە .. ئەوانە کاتێ ئەڕۆنە بەهەشت بە ڕێزو تەعزیمەوە مامەڵەیان لەگەڵ ئەکرێ ، دوعای خێریان بۆ ئەکرێ و سەلامەتیان پێ ئەدرێ ، کەبۆ هەمیشە لەناو ئەوەدا ئەمێننەوە ، لەجێگایەکدا کە باشترین جێگایە بۆ دامەزران و مانەوە و نیشتەجێ بوون .

## بەشێك لە تەفسیری سورەتی (الحجرات)

لە سورەی (الحجرات)یشدا چەند شتێكی‌تر- لەوانەی ئەبێ ئینسانی مونمین ڕیعایەتیان بكاو هۆشی پێیانە وەبێ - بەیان كراون ، بەم تەرتیبە :

لەپێشا ئەوانەی ئیمانیان هێناوە پێیان ئەفەرموێ : هۆشتان بەخۆتانەوە بێ، نەكەونە پێش خواو پێغەمبەرەكەی . پێشكەوتن ئەوەیە ئینسان شتێ ئەنجام بدا پێش لەوەی بزانێ فەرمانی خوا لەو بارەیەوە چی ئەبێ، پێش لەوەی بزانێ خوا فەرمویەتی چۆنی ئەنجام بدا . ئینسانێ بیەوێ بەندەیی خوا بكا، هەرگیز كاری وا ناكا، هەمیشە ماتڵ ئەبێ و چاوەڕوان ئەبێ خوا و پێغەمبەری خوا پێشكەون و ڕێگە ڕۆشن كەنەوە، ئەنجا بەشوێن ئەواندا ئەڕوا، یانی هەمیشە ماتڵی ئەوەئەبێ دەستورو فەرمان لەلایەن خواوە بێت و ڕێگای بۆ ڕۆشن بكاتەوە ، جادوای ئەوە ئەكەوێتە حەرەكەت و ئەو شتە كە ئەیەوێ ئەنجامی ئەدا.

* بەشوێن ئەوەدا ڕێنمایی موسوڵمانان ئەكا بۆئەوەی ئیحترامی پێغەمبەری خوا بگرن، ئەو پێغەمبەرەی خەبەری هیدایەت و دینی خوای بۆ هێناون و، ڕێی بەندەیی بۆیان ڕۆشن كردۆتەوە ، ئەبێ لەگەڵ ئەودا بە ئیحترام و ڕێزەوە هەڵس وكەوتیان هەبێ، دەنگیان لەدەنگی ئەو

بەرزترنەکەنەوە، هەروەك بە دەنگی بەرز لەگەڵ خەڵکی تر قسە ئەکەن لەگەڵ ئەو قسە نەکەن .. ئەوە ئەبێتە سەبەبی ئەوەی کردارە باشەکانیان زایە بن و لەبەین بچن .. جا وەسف و سەنای ئەوانە ئەکا کە دەنگیان نزم ئەکەنەوە و بەدەنگی هێواش لە حزووری ئەودا قسە ئەکەن، ئەوانە ئەهلی تەقواو لە خوا ترسانن، بۆیە وەعدی ئەوەیان پێ ئەدا کە لەگوناهەکانیان خۆش بێ، ئەجرو پاداشتی گەورەیان بداتەوە، سەرزەنشی ئەوانەش ئەکا کە ڕیعایەتی ئەو ئەدەبو ئیحترامە ناکەن . کاتێ پێغەمبەری خوا لە یەکێ لە ژوورەکانی خۆیدایە، هەر لەدەرەوە بانگی ئەکەن ، ئەزیەتی ئەکەن ، نایەڵن بەرنامەیەك کە خۆی دایناوە بۆکارو چالاکی خۆی ، ڕیعایەتی بکا ـ حەقەن پێغەمبەری خوا بێکارو بێ بەرنامە لەو ژوورانەی ماڵی خۆیدا نامێنێتەوە ، هەرکاتێ کە لەوێ ئیش و کاری تەما خۆی دێتە دەرەوە ـ جا خوا ئەفەرموێ : ئەگەر صەبریان بکردایە تا بهاتایەتە دەرەوە، ئەوە باشتربوو..

جا پێویستە ئەوە بزانین ئەمە تایبەتی پێغەمبەری خوا نیە، بەڵکو لەهەر زەمانێکدا هەرکەسێ ڕێبەر و ڕێنیشاندەری خەڵکی بێ بۆ ڕێگای بەندەیی خواو بە ڕاستی ڕێبەرو سەرمەشق بێت ، ئەبێ ئاوەها ئیحتیرام و ئەدەبێك لەگەڵی ڕیعایەت بکرێ .

* دوای ئەوە بە موسوڵمانەکان ئەفەرموێ کە : ئەبێ پەیوەندی وعەلاقەتان لەگەڵ ناموسەڵمان بەم جۆرە بێت : ئەگەر(فاسق)ێك هاتو

خەبەرێکی گرنگی بۆ هێنان ، بێ تەحقیق لێی قەبوڵ نەکەن، چونکە ئەگەر بێ تەحقیق لێی وەرگرن، لەبەرئەوەی کە(فاسق)ە و لەسنووری بەندەیی خوا دەرچووە، ئەوە ڕەنگە درۆی کردبێ، ئەگەر ئێوە خەبەرەکەی لێ قبوڵ کەن و ئیشێك بکەن ، بەهۆی ئەو خەبەرەوە ڕەنگە تووشی گوناهێك بن ، زەرەرێ بە تایەفەیەك و گەلێك بگەیەنن، پاشان لەدوایدا پەشیمان ببنەوە کە ئەزانکاریتان کردوە و ئیشێکتان کردوە نەئەبوایە بتانکردایە .

*دوای ئەوە چەند ئایەتی‌تر هەن .. بەشوێنیانا باس لەوە ئەکا کە بڕواداران لەناو خۆیانا ئەبێ ڕەفتاریان چۆن بێت، لەگەڵ یەکا چۆن هەڵسن وداتیشن . بە تایبەتی‌کاتێ وان بەیەکەوە، ئەفەرموێ:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَومٌ مِّن قَوْمٍ عَسَى أَن يَكُونُوا خَيْراً مِّنْهُمْ وَلَا نِسَاء مِّن نِّسَاء عَسَى أَن يَكُنَّ خَيْراً مِّنْهُنَّ﴾ : بانگ ئەکاتە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، ئەفەرموێ :

هیچ قەومێکتان گاڵتە بەقەومێکی تر نەکات و، خۆی لەوی تر زیاتر نەگرێ، وا نەبێ کە لەبەرئەوەی خۆی بەزیاتر ئەگرێ ، گەمە و گاڵتە بەوی تر بکا، چونکە ڕەنگە ئەوان باشتر بن لەلای خوا. هەروەها هیچ کام لەژنەکان گاڵتە بەهیچ کامی‌تر لەخۆیان نەکەن، چونکە ڕەنگە ئەمان لەوان باشتر بن لەلای خوا.

* ﴿وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ﴾ : هەروەها بەزبان دڵی یەکتر بریندار مەکەن . قسەی ناخۆش بەیەکتر مەڵێن،کە دڵی یەکتری پێ زامدار بکەن .

* ﴿وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ﴾ : هەروەها لەقەب و ناوی ناخۆش بەیەکترەوە مەنێن، بەجۆرێ کەیەکتر بکەن بە شوهرەو لەناو خەڵکدا بەناو و ناتۆرەی ناخۆش مەشهوری بکەن .

* ﴿بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ﴾: چونکە زۆرناخۆشە ئینسان دوای ئەوە ئیمان بوو بە ناو بۆیەو ناوی نرا ئەهلی ئیمانو بڕوادار، دوای ئەوە (فاسق بوون) بیێتە نازناوی . (فسوق) واتە : دەرچون لە سنوری بەندەیی خوا. زۆر ناخۆشە ئینسان لەپێشا پێی بڵێن (مۆمن) دوایی پێی بڵێن (فاسق).

﴿وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ﴾ : ئەوانەی تەوبە نەکەنو لەم شتانە دەستبەردار نەبن، ئەوە ستەمکارن، ئەگەر توشی عەزابو ئەشکەنجە هاتن خۆیان ستەمیان لەخۆیان کردوە، خوا زوڵمی لێ نەکردوون.. ئەمە مانای ئەوەیە کە ئەوسێ شتە : (گاڵتە کردن بە خەڵك لەبەرئەوەی ئینسان خۆی بەزیاتر بگرێو ئەوان بەژێردەستی خۆی بزانێ . هەروەها بەزبان برینداركردنی دڵی خەڵك و قسەی خراپ لەگەڵ خەڵك کردنو ئەزیەت کردنی خەڵك بەقسەی

ناخۆش . پاشان لەقەبی خراپ بەخەڵکەوە نان)، ئەم سێ شتە گوناهی گەورەن، ئەگەر ئینسان لەسەریان بڕواو دەستبەرداریان نەبێت لێیان ، ئەوە لەسنوری بەندەیی خوا دەرچووەو حەقەن تووشی عەزابی خوا ئەبێ‌و پێی ئەفەرموێ : ئیتر دوای ئەوە کەخوا بەیانی کردوەو ڕێگای ڕۆشن کردۆتەوە ، هیچ جێگای گلەیی نیە، ئەو شەخسە خۆی زوڵمو ناهەقی بەخۆی ئەکا .

* دوای ئەوە چەند فەرمانێك دەرئەکات بۆ موسوڵمانان تا ڕیعایەتی بکەن . لەکاتێکدا کە لەلای یەکدا نین، لەپشتی سەری یەکتر شتێك کە لایەقی موسوڵمان نیە نەیڵێن . ئەفەرموێ :

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اجْتَنِبُوا كَثِيراً مِّنَ الظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ الظَّنِّ إِثْمٌ وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضاً أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتاً فَكَرِهْتُمُوهُ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾. بانگ ئەکاتە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، ئەفەرموێ : لەگومان بردن ، زۆر دوریی بگرن . لە(وائەزانم‌و وائەزانم) واز بێنن، بەبێ ئەوەی شتێکتان لێ ڕۆشن بێ، چونکە هەندێ لەگومانەکان گوناهن و ئینسان لە چوون بەرەو خۆشبەختی دوائەخەن . کەوابوو زۆر خۆتان دوور بخەنەوە لەوگومانانە، نەکو لەوانە بن کە لە چوون بەرەو خۆشبەختی وسەعادەت دواتان بخات .

* هەروەها (تجسس) مەکەن . ئەگەر هاتووگومانێکتان کەوتە دڵ نیسبەت بە موسوڵمانێ مەگەڕێن بە شوێنیدا، بۆئەوەی کە بزانن چیە و چی نیە . خۆ ئەگەر هاتوو زانیتان بە عەیبێکی برایەکی دینیتان ، یان ئەگەرکەمتەرخەمی و نافەرمانیتان کرد و ( تجسس ) تان کرد و تەحقیقتان کرد، یا بەهەر رێگەیەك بوو خەبەردار بوون لەوەی کە برایەکی دینیتان عەیبێکی هەیە، ئەوە باهەر خۆتان پێی بزانن و لە پشتی سەر ناوی لای کەسی تر مەبەن ، با کەسی تر پێی نەزانێ . چونکە جاسوسی کردن و گەڕان بەشوێن عەیبی موسەڵمانانندا ، هەروەها ناوی موسڵمان بەخراپ بردن لای ئەم و ئەو، وەك ئەوەیە یەکێ گۆشتی برای مردووی خۆی بخوات، دەی ئایا پێی خۆشە کەسێ لەئێوە گۆشتی براکەی -لەکاتێکا مردووە- بخوا؟ دیارە پێی خۆش نیە .. کەواتە دەی ئەویشتان پێ ناخۆش بێت ، ئەوانەی پێتان وترا مەیانکەن، لێیان دووری بکەن .﴿ اَتَّقُوا اللَّهَ ﴾ : خۆتان لەنارازیکردنی خوا بپارێزن . شتێ مەکەن گرفتاری دەستی خوا وعەزابی خوابن .﴿ إِنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾ : ئەوە بزانن خوا زۆر تۆبە قبوڵ ئەکات ، زۆر بەرەحم و میهرەبانە ، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆلای و دەست بکێشن لەوکارانە، حەقەن گەڕانەوەتان لێ قبوڵ ئەکا ، ڕەحمتان پێ ئەکا، ئەو کارە باشانەی لە دوای ئەو تەوبەیە ئەیکەن لێتان وەرئەگرێ و جەزای باشی ئەوانەتان ئەداتەوە .

* دوای‌ئەوەش باسی ئەوە ئەكات كە خەڵكی - چ ژنان، چ پیاوان ، لە هەر تایفەیەك ، یا هەر قەبیلەیەك، یا هەرگەل و هۆزێك بن- تەنها بەیەك شت لای خوا نرخ و ئیحترامتان هەیە ، ئەویش تەقوا و لە خوا ترسانە .. هەر كەس تەقواو لە خوا ترسانی بوو، لای خوا بەرێز و موحتەرەمە . هەر كەسێ نەیبوو، لای خوا رێزی نیە ، ئەوانەی تەقوایان هەیە هەركامێكیان زۆرتری بوو ئەوەیان بەرێزو موحتەرەم ترە لای خوا، ئیتر هیچێكی تر، غەیری تەقوا و لەخوا ترسان لای‌خوا رێز و ئیحترام و نرخ بە ئینسان نادا.

## پوختەیەك لە تەفسیری سورەتی (العصر)

لەدوای ئەمانە بەجێیە سورەی (عصر) - كە سورەتێكی كورتە ، بەلام سورەتێكی زۆر گەورەیە- بخوێنینەوەو ماناكەی باس بكەین ، كە ئەگەر ئینسان تەنها ریعایەتی ئەم سورەتە بكات - هەروەك ئیمامی شافعی ئەفەرموێ - بەسیەتی بۆ ژیانی، بۆئەوەی بیگەیەنێ بە خۆشبەختی . ئەفەرموێ :

﴿وَالْعَصْرِ. إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ. إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ ﴾ .

واتــە : قەســەم بەزەمانــە، ( ئــەو زەمانەی‌کــە وەك ئاوێنەیەکــە ، خۆشبەختی و بەدبەختی و سەرەنجامی خۆشی‌و سەرەنجامی ناخۆشی تێدا دەردەکەوێ . هەروا کە ئەزانین زەمانەو تەئریخ خۆی دەری ئەخا کــێ گەیشت بەخۆشبەختی وکێ گەیشت بە بەدبەختی)، قەسەم بەو زەمانە، هــەر ئینســانێ وا لــەزیانکاری و زەرەرمەندیــدا، (نــە تــەنها ســودێکی دەست نەکەوتوە، بگرە سەرمایەشی لە دەست داوە) بێجگە ئەوانــەی حەقیان ناسی و تەسلیمی بوون ، ئەوانەی کردەوە چــاکەکانیان ئــەنجام دا، ئەوانەی بەیەکتر (توصیە)وئامۆژگــاری و سفارشــیان کردکــە ڕێــی حەق بگرن وصەبریشی لەسەر بکەن[1].

[1] - لە کۆتایی ئەم بەرهەمەدا مامۆستا ناصر جارێکی تر سورەتی العصر وا لەکات. سەیری دوایەش بکە (دەزگای بەرهەم).

## پوختەیەك لە ئەحكامی سورەتی (الأحزاب)

هەندێکی تر لە خوورەوشت وکردارە باش و خراپەکان لە چەند ئایەتێکی‌تروچەند سورەتێکی تری قورئانـدا، ناویـان بـراوە، پێویستە ئەوانیش باس بکرێن .

لەسورەی ئەحزابدا فەرمانێ ئەدرێ بە پێغەمبەری خوا کـە پێوستە موسڵمانان بیزانن، بەتایبەتی ئەو کەسەی خەریکی دەعوەت کردنە بـۆ ڕێگەی خوا، ئەبێ بیزانێ .. چونکە لە قۆناغێکی دەعوەتەکەیـدا ئـەگا بەوشتە، ئەویش هاوسەری کەسێکە کە کاری دەعوەت کردنە لە ڕێـی خوادا، خەڵکی تریش هەر باشە بیزانن، تا تێ بگـەن کـە مەسئولیەتی ئەوکەسانەی خەریکی دەعوەتکردن و بانگ کردنن بـۆ ڕێگـای خـوا چیە ، مەسئولیەتی خێزان و خانەوادەی ئەوان چۆنە . ئەفەرموێ :

﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الـدُّنْيَا وَزِينَتَهَـا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً. وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْراً عَظِيماً﴾ .

هەموو ئەزانن لەکاتێکدا پێغەمبەری خـوا دەسـتی کـرد بـە بـانگ کردن بۆ ڕێگای خوا، دەسـتەڵاتدارو حاکمـە زاڵـم و ، تاغوتـەکان و داورودەستەیان، دژی وەستان ودەستیان کرد بە دوژمنایەتی لەگەڵی و، هەرچیەك لە دەسـتیان هـات دریغیـان نـەکرد، هـەوڵیان دا بۆئـەوەی نەهێڵن ئەو دەعوەتە سـەرکەوێ .. لە ئەنجامدا چارەیەك نـەبوو غـەیری

ئەوەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ یارانی کۆچ بکەن و، شاری مەککە بەجێ بهێڵن و، بڕۆن بۆ جێگەیەکی تر، تا لەوێ بتوانن مەسئولیەت و وەزیفەی بەندەیی خۆیان جێبەجێ بکەن و، ئەوەی لەسەریانە ئەنجامی بدەن .. بۆیەکۆچیان کرد بۆ مەدینە ،کافرەکانیش هەر وازیان نەهێنا ، چەندین جار لەشکریان کێشا، هوجومیان بردە سەر موسوڵمانەکان، شەڕیان لەگەڵ کردن، بەڵکو بتوانن ئەو دەعوەتە، ئەو بانگ کردنە بۆ ڕێگای خوا، لەبەین بەرن و خۆیان ڕزگارکەن لەدەستی.. جا هەرجارە دەستەیەك لەکافرەکان ئەچون بۆ شەڕ کردن، حزب حزب و دەستە دەستە ، تا دوای ئەوەی چەند جار شکستیان خوارد و نەگەیشتن بە ئامانج و ئارەزوی خۆیان و، بۆیان دەرکەوت ئەگەر حزب حزب و دەستە دەستە بڕۆن هیچیان پێ ناکرێ، کەوابوو با هەموو حزبەکان و هەموو دەستە و گرۆهەکان بەیەکەوە بڕۆنە شەڕی موسوڵمانەکان، تا لەبەینیان بەرن .. ئەوەبوو جەنگی ( ئەحزاب ) (کۆمەڵەکۆمەی هەموو حزبەکان) ڕوی دا کە هەموو حیزبەو گرۆهەکان بوون بەیەك بۆلێدانی موسوڵمانەکان . جا لەبەرئەوەی خوای(متعال) هەرگیز ئیزن نادات بەکافرەکان کە کارێ بکەن بەندەیی و عیبادەتی خوا لەسەر زەوی هەڵبگیرێ و، زەمینە نەمێنێ بۆ ئەنجامدانی، موسوڵمانەکانیش دەسەڵاتێکی وایان نەبووکە دیفاع بکەن لەخۆیان و ، لەگەڵ ئەو هەموو دوژمنانە بە شەڕ بێن ، بۆیە خوای (متعال) ڕاستەوخۆ یارمەتی

دان وكۆمەكی كـردن ونـەجاتی دان ، بـە لەشـكرێك كـە موسوڵمانەكانیش نەیاندی، بە لەشكرێك كـە خـۆی ئـەزانێ ئـەفرادی چەند بوو، حیزبەكان وگرۆكافرەكانی شكست دا، ئەو شكست دانـە بوو بەهۆی ئەوە جارێكی تركافرەكان لەبیری ئەوەدا نەبن لـە ڕێگـای جەنگ كردن لەگـەڵ موسـوڵمانەكانەوە بـڕۆن بەگـژی ئیسـلامدا .. دوای ئەوە وتیان ئـیتر جـارێكی تـر بۆئـەوە ناشـێ بەشـەڕبێین لەگـەڵ موسوڵمانەكان ، باشتر ئەوەیە لەڕێگایەكی ترەوە بـڕۆین ، شـتێكی تـر بكەین بۆ لەبەین بردنی ئیسلام . ئەوەبوو دەستیان دایە هوجوم كردنـە سـەر موسـوڵمانان، لـە مەیـدانی ئـەخلاق و خووڕەوشـتا، پـیلان و نەخشەیان كێشا بۆئەوەی كـار بكەنـە سـەر خێزانـە موسـوڵمانەكان، كـارێ بكـەن موسـوڵمانان لـەڕێی خووڕەوشـتی جـوان و ئـەخلاقی ئیسلامی لابـەن ، گومڕایـان بكـەن، لـەو ڕێگایـەوە دەسـتی خۆیـان بوەشێنن و، ئیسلام لەبەین بەن . جالەبـەر ئـەوە بـوو لـە دوای ئـەو غەزوەیە (دوای جەنگی ئەحزاب) خوای گەورە ئەم سورەتەی ناردكـە تیایدا موسوڵمانان ئاگادار ئەكاتـەوە لـەوەی خەتـەرێكی زۆرگـەورە ڕووی تێ كردوون، كە ئەگەر سەنگەری خۆیان مەحكـەم نەكەنـەوە، ئەگەر لە خووڕەوشتە خراپـەكان بەتـەواوی خۆیـان بـەدوور نـەگرن ، ئەوەی خووڕەوشتی باش و جوانە مەحكـەم نـەیگرن ، بەتـەواوی نـەبن بەئەهلی ئەخلاقی ئیسلامی و خووڕەوشتی جوانی پەسـەند كـراوی لای

خوا، حەتمەن لەم شەڕەدا شکست ئەخۆن و، کافرەکان ئەگەن بەئاواتەو ئارەزووی خۆیان ..

جا لەبەرئەوەیە لەم سورەتەدا زۆرێک لەوفەرمان و دەستورانەی پێویستن بۆئەوەی موسولمانان بەڕیعایەت کردن و بەکارهێنانیان، رێگای ئیمان وعەمەلی صالح باشتر و زیاتر بگرنە بەر، زۆرێک لەو دەستورانە هاتوون ، کە بەم جۆرە دەست پێ دەکا:

* سەرەتا لەبەرئەوەی خانەوادەو خێزانی رەهبەرو پێشەوا زۆرتر لەخەتەردایە ، ئەگەر هوجومێک ببرێتە سەرئەو و دەستێک بوەشێنرێت لەو، ئیتر هوجوم بردنە سەر کۆمەلی موسولمانان و زیان گەیاندن بەوان، زۆر ئاسان ئەبێت، لەوێوە دەست پێ ئەکات . ئەفەرمووێ :

ئەی پێغەمبەر، ئەی ئەوکەسەی خەبەری هیدایەت و رێنومایی بۆ رێگای بەندەییت لەخوا وەرگرتووە، بلێ بە هاوسەرەکانت، ئەوانەی قەرارە هاوسەری تۆ بن، شایەنی و لیاقەتی ئەوەیان بێت کە لەلای تۆ بن ، پێیان بلێ : ئەگەر ژیانی دونیا – ئەو ژیانەی زوو دێت ، بەلام هەروا کە زوو دێت زووش ئەڕوات و لەبەین ئەچێ – ئەگەر ژیانی دونیا و زینەت وئارایشتی دونیاتان ئەوێ، وەرن تا هەندێ لەو مالو مەتاعەی کە هەمە، پێتانی بدەم و، دەستتان لێ بەردەم و، بەشێوەیەکی جوان دەست بەردارتان ببم ، ئێوەش بڕۆن ولە هەرکوێ ئەوەی ئەتانەوێ و دەستتان ئەکەوێ، بڕۆن بۆ ئەوێ . چونکە خوا منی بۆ

ئەوە دروست نەکردوە خەریکی ئامادەکردنی زینـەت ومـاڵ و مـەتاع بۆ چەند ژنێك بم، مەسئولیەتی من و ئەرك و واجبی من زۆرگـەورەترە لەوەی عومرم هەرلەوەدا سەرف بکەم، ئەگـەر ئـەوەتان ئـەوێ، ئـەوە لای من دەست ناکەوێ، وەرن تا بەو شێوەیە لەیەك جیا بینەوە .. خـۆ ئەگەر خـواو پێغەمبەرەکـەی و مـاڵی ئـەو دونیاشـتان ئـەوێ، ئەگـەر قیامەت و بەهەشتتان ئەوێ، ئەوە مەسئولیەت و وەزیفەتان لەسەر شان دائەنرێ، داواتان لێ ئەکرێ کە کارە چاکەکان بە پێی تواناییتان ئەنجام بدەن، چونکە ئەگەر لەوانە بن کە ئەهلی ئەنجامدانی کـارە باشـەکانن، ئـەوە خـوای میهرەبـان ئـەجر و پاداشـتێکی زۆرگـەورەی بـۆ ئامـادە کردوون ..

کاتێ ئەم دوو ئایەتە نـازڵ بـوون ، پێغەمبـەری خـوا هاوسـەرەکانی کۆکردەوەو ئەم شتەی باس کـرد لەگـەڵیان، ئـەوانیش وتیـان : ئێمـە خواو پێغەمبەری خواو ماڵی دوایی و قیامەتمان ئەوێ . ژیـانی دونیـا و زینەت و ئارایشت و زێوەری دنیامـان نـاوێ .. بـەو جـۆرە ڕۆشـنیان کـردەوە و سـەلماندیان کـە لیاقـەت و شایسـتەیی ئـەوەیان هەیـە کـە هاوسەری ئەو بن .

* دوای ئـەوە هاوسـەرانی پێغەمبـەر (صـلوات اللـه وبرکاتـه علیه )ئەمەیان دەرخست ولەو تاقیکردنەوەیـەدا نـاجح بـوون ، دوای

ئەوە چەند دەستوورو فەرمانێکی تر لای خوای گەورەوە هاتن ، لەو فەرمانانەدا ئەفەرموێ : ئێستا کە ئێوە دامەزراون لەسەر ئائەمەو، سەلماندتان کەلیاقەتو شایستەیی ئەوەتان هەیە ژنی پێغەمبەربن، چەند شتێك هەیە ئەبێ ریعایەتیان بکەن . هەندێ خوورەوشتی ناپەسەند هەن، ئەبێ خۆ دوور بگرن لێیان، هەندێ خوورەوشتی جوانیش هەن، حەتمەن ئەبێ ئەوانەتان تێدا بێ .

﴿يَا نِسَاء النَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَاعَفْ لَهَا الْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ وَكَانَ ذَلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيراً﴾ .

با پێش ئەوەی مانای ئەم ئایەتە بەیان بکەم، ئەوە بڵێم کە هەروەك لە پێشدا ئیشارەمان کرد، هەرکەسێکی تریش کاری دەعوەت کردن بکا بۆ رێگای خوا، ئەگەر زەمانێك وەك ئەو زەمانەی وا جەنگی ئەحزاب رووی دا، بێتە پێشەوە، واجب ئەبێ لەسەری کە لەگەڵ هاوسەری، یا هاوسەرانی، ئەم شتە باس بکا، بە جدیەتیشەوە لێیان داوا بکا، تا مەوقیفی خۆیان روون بکەنەوە، روونی بکەنەوە کە چیان ئەوێ و چیان ناوێ . ئەگەر دنیایان ویست دەستیان لێ بەردا بەو شێوەیە کە بەیان کرا، ئەگەر خواو پێغەمبەرو قیامەتیشیان ویست ، ئەوە ئەبێ خۆ حازرکەن بۆ ئەوەی ئەو فەرمانو دەستورانەی کە دوایی بۆیان باس ئەکرێن ریعایەت بکەن و هۆشیان بەوانەوە بێت ،

ئەوەی خوا ئەفەرموێ کە بیکەن، بیکەن . ئەوەش کە ئەفەرموێ خـۆی لێ دوور بگرن، لێی دوورکەونەوە .

ئەفـەرموێ : ئـەی ژنـانی پێغەمبـەر، هـەر کام لـە ئێـوە کردارێکی ناپەسـەند-کە دیاربێت و ئەنجامدانی نیشانەی ئەوە بێـت ئەوئەنجامـدەرە ئینسانێك نیە ئەهلی عیبادەتو بەندەیی خـوا بـێ- هـەرکام لـە ئێـوە کردارێکی وای ئەنجامداو، خەلکی پێیان زانی و بۆیان دەرکەوت ئەوە ئینسانێکی صالح نیـە، کەسـێکە ئـەهلی ئەنجامـدانی کاری نزمـە، ئـەوە ئەشـکەنجەیەك کـە بـۆی قـەرار دەدرێ، دوو بەرابـەری عـەزاب وئەشکەنجەیەکە بـۆ ژنـانی تـر ئـەنجام ئـەدرێ، لەبەرئـەوەی کـرداری ناپەسـەندی ئەو، هەم گوناهێکە بۆخۆی، هەم ئەبێتە هۆی ئەوەی ژنانی تـریش چـەندان کـرداری ناپەسـەند ئـەنجام بـدەن، چـونکە ئەبێتـە سەرمەشقێکی خراپ بۆ ژنانیتر، ئەوان بیانوونـەگرنو ئـەڵێن : کـاتێ خێزانی پێغەمبەری خواو هاوسەرانی ڕەهبەر ئـاوابن، ئـیتر ئێمـە بۆچـی خۆمان ئەخەینە زەحمەت . لەبـەر ئـەوە حـەقی خۆیـەتی ئەگـەر یـەکێ لەئێوە شتێکی ئاوای کرد، دوو بەرابەر عەزابو ئە شکەنجەی بـدرێ، ئەوە زۆرئاسانە بۆ خوا. ئەوەش کە ئێوە ژنـی پێغەمبـەری ئـەون نابێتـە ڕێگر، وەك دەڵێن ڕوو دەربایـسییەك نیە، ناڤـەرموێ لەبەرئـەوەی ژنـی پێغەمبەرنو هاوسەری ڕەهبەرن ، قـەیناکا چاوپۆشـی ئەکـەم . نـەخێر،

بەلکو لەبەرئەوەی ژنـی پێغەمبـەرن‌و هاوسـەری رەهبـەرن، ئـەبێ لـە هەموو ژنێکی تر پاکتر بن ، شێوەی ژیانیان جوانتربێ لەهەر ژنێکی‌تر.

بەکورتی لەجێی ئەوەی بەپێی ئەو بەرنامەیەی خوا کـە بـۆ جـەزاو سزای ژنەکانی تر هەیە، سزایان بدات – واتـە هـەر بەقـەد گوناهەکـە جەزاو سزا بداتەوە– دوو بەرابەر جەزاو سزا ئەداتەوە .

﴿وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِ وَتَعْمَلْ صَالِحاً نُّؤْتِهَا أَجْرَهَا مَـرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَـا رِزْقـاً كَرِيمـاً﴾ : هـەرکام لـەنێوە بـەردەوام و بـە دڵ فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەری خوا بێ وکردەوەی چـاك ئـەنجام بـدا، ئەوە دووجار پاداشتی دەدەینـەوە، یەکـەم : لەبـەر ئـەوەی کـردەوەی چاکی ئەنجام داوەو ئیتاعـەت‌و فەرمانبـەرداریی کـردووە . دووەمـیش لەبەرئەوەی بووە بە سەرمەشقی باش بۆ ژنانی تـر. هەرکـەس ئاوابـێ، رزق‌و رۆزی‌یەکی زۆر باشمان بۆ ئامادە کردووە لە قیامەتدا.

﴿يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ﴾ : ئـەی ژنـانی پێغەمبەر! ئەی ژنانی ئـەو کەسـەی خەبـەری هیدایـەت و رێنمـایی بـۆ رێگای بەندەیی هێناوە بۆ خەڵك و، رێنمایی خەڵك دەکـات بۆئـەوەی بەندەیی و عیبادەت بۆ خوا بکەن! ئەگەر لەخوا بترسن و تەقواتان بێ، وەك هیچ ژنێکی تر لە ژنان نین، چونکە ئەگەر ژنێکی‌تر لەخوا بترسـێ تەنها بۆ خۆیەتی، بەڵام ئەگەر ئێوە لە خوا بترسن ئەبن بە سەرمەشق بۆ ژنانی تر، بۆ خانەوادەکانی‌تر، ئەبن بەسەبەبی ئەوەی زۆرێك خانەوادەو

زۆرێـــك لـــە ژنـــان لـــە خانەوادەكانـــدا بكەونـــە ســـەر رێـــی بەندەیی ..كەوابوو:

﴿فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَـرَضٌ وَقُلْـنَ قَـوْلاً مَّعْرُوفاً﴾ . واتە : لە كاتێكدا كە قسە دەكەن بەنەرمی و بەنازەوە قسـە مەكەن، تا ئەوكەسەی نەخۆشی لارو چەوتی رەوشتی هەیە، ئـەوەی وا نەخۆشی ئەخلاق لە دڵیایەتی، خەتەرەو تەماعی خراپ نەكەوێتە دڵی . بۆیە با قسەیەك كە ئەیكەن قسەی پەسەند بـێ، شـێوەی قسـەكردنەكە باوایێ لە نەرمیو، لە بەنازەوە قسـەكردن دوور بـێ . بـا قسـەكەیش مانایەكی پەسەندی بێ، شتێكی تیا نەبێت كەسێ بەرەو لای گـومڕایی و لەڕێی خوا دەرچوون بكێشێ .

﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ﴾ : لە ماڵەكانتاندا دامەزرێن، با سـەنگین بـێو ویقارتان بێ، با سەنگینیتان بكەوێتە ناو ماڵەكانتان، چونكە قەرار وایە ژن جێگای ئەسڵی فەعالیەتو كـارو كۆشـشو هەوڵـدانی خانـەوادە بێـت، ناومـاڵ بێـت . چـوونە دەری لـەناوماڵ تـەنها ئـەبێ لـەكاتی زەرورەتا بێ، بەئەندازەی پێویستی زیاتر نەبێ .

﴿وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى﴾ : كـاتێكیش لەبـەر پێویسـتیو زەرورەتێك چوونە دەرەوە، خۆتان مەڕازێننەوە ، خۆتان وەك بورجێك، وەك قەسرێك یا كۆشكێك دەرمەخەن، وەك چۆن بورجو قەسرێك لـە دوورەوە دیـارە و خـەڵك سـەرنجی ئـەدەن، وا مەكـەن ئـاوا خۆتـان

برازێننەوەو خەڵکی بۆتان بڕوانن . وەك چۆن ئەوانەی لـە جاهیلیـەتی پێشوودا ئەچوونە دەرەوە، خۆیان ئەرازاندەوە، ئەوانە لەرێگای بەندەیی خوا دوور بوون و غافڵ بوون ، لایان دابوو.. بەشێوەی ئەوان خۆتـان مەرازێننەوە . جا دوورایش بـەیان نـەکرێت کـە نـەبێ ژنـی موسـڵمان لەکاتێکا کەئەچێتە دەرەوە، یالەکاتێکا کە نامـەحرەمێك لـەماڵیا بـێ، ئەبێ چۆن بێ (لەبەشی ئەحکامی پۆشتەیدا باسی ئەکەین).

﴿وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ﴾ : نوێـژەکانتان بـە رێـكو پێـکی ئـەنجام بـدەن . سکالاو دوعاتان بەرێكو پێکی بکەن، تا خواکۆمەکتان بکا بۆ ئـەوەی رێگەی بەندەیی بگرن .

﴿وَآتِينَ الزَّكَاةَ﴾ : هەروەها لەسـەروەتو دارایـیـەك کـە هەتانـە ، ئەوەی وا زیاترە لە پێویستی و نیازی خۆتان، ببەخشن، تا ببێتە مایـەی گەشەکردنتان و، چوونتان بەرەو کەماڵ .

﴿وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ﴾ : هەروەها فەرمانبەرداری و ئیتاعەت بکەن لە خواو پێغەمبەرەکەی .

پاشان دەفەرموێ: وا مەزانن ئەم دەسـتورانەی ئەیـدەین بـە ئێـوە ، سوودو ئەفعێ بە ئێمە دەگەیەنێ. نەخێر، هەمووی هەربۆخۆتانە :

﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْـلَ الْبَيْـتِ وَيُطَهِّـرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾: خوا کە ئەو دەستورانە بە ئێوە دەدات، تەنها ئەیـەوێ پیـسی جاهیلیـەت لەسەر ئێوە لا بار، دووری خاتەوە لێتان، ئەی ئەهلی ماڵی

پێغەمبەر! ئەی ژنانی پێغەمبەری خوا! نابێ ئێوە ئەو پیسی جاهیلیەتانە پێوە بێ . خوا ئەیەوێ بەڕاستی پاکتان کاتەوە، لەهەرچی خوورەوشتی جاهیلی و ناپەسەندە . وەك ئەوەی بەنازەوە قسە بکەن . وەك ئەوەی ویقارو سەنگینیتان نەبێ‌و لە ماڵەکانتانا دانەمەزرێن‌و هەمیشە لەملاولەولا بن . وەك ئەوەی کاتێ ئەڕۆنە دەرەوە خۆتان بڕازێنەوەو، غەیری ئەوانە لە خوورەوشتی ناپەسەندی‌تر.

*﴿وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَى فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ﴾ : با ئەوەی لەماڵەکانتانا یەك لە شوێن یەك ئەخوێنرێتەوە بۆ هیدایەت‌و ڕێنماییتان، لەئایەتەکانی خوای (متعال)و نیشانە و دەلیلەکان، هەمیشە لە یادتان بێت، ئەو ئایەتانەی ڕێگای بەندەیی ڕۆشن ئەکەنەوە ، دەری دەخەن هەر خوایە فەرمانڕەواو فەریادڕەس، هەروەها ڕۆشنی ئەکەنەوە کە دواڕۆژێك هەیە و ئینسان تیایدا موحاسەبە و موحاکەمەی ئەکرێ . دەری دەخەن بۆ ئینسان کە مەسئولەو بەندەی خوایە، ئەبێ ڕێگای بەندەیی بگرێ . ئەو ڕێ و ڕەوشەی دامەزراوە بۆ ئەوەی کە بەندەیی خوا بکەن، بێ ئەوەی بەرەوکەمکاری (تقصیر)و (تفریط)، یابەرەو زیادەڕەویی (إفراط) و لەحەد دەرچوون بڕۆن .. ئائەوانە یادبکەنەوەو هەمیشە لەبیریاندا بن .

﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ لَطِيفاً خَبِيراً﴾ : ئەوەش ئەبێ بزانرێت گومان لەوەدا نیە کە خوای گەورە (لطیف) واتە : ناسك بینە، ئەوەی زۆر زۆر پەنهان و پۆشراو بێ ئەو پێی ئەزانێ . هەروەها (خبیر)ە، هەمیشە گوزارشت و خەبەری پێ ئەدرێ ، لەو ڕێگایەشەوە خەبەردار ئەبێ لەهەرچی‌یەك کە ڕوونەدا، لەهەرکردارێك لەلایەن ئێوەوە دەبێت، واتە خۆی (لطیف)ە، ئاگای لە هەموو شت هەیە، (خبیر)یشە، واتە : هەمیشە خۆی خەبەری هەیە ( خەبەرداره ).

* ﴿ إِنَّ الْمُسْلِمِينَ وَالْمُسْلِمَاتِ ، وَالْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ ، وَالْقَانِتِينَ وَالْقَانِتَاتِ ، وَالصَّادِقِينَ وَالصَّادِقَاتِ ، وَالصَّابِرِينَ وَالصَّابِرَاتِ ، وَالْخَاشِعِينَ وَالْخَاشِعَاتِ ، وَالْمُتَصَدِّقِينَ وَالْمُتَصَدِّقَاتِ، وَالصَّائِمِينَ وَالصَّائِمَاتِ ،وَالْحَافِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَالْحَافِظَاتِ،وَالذَّاكِرِينَ اللَّهَ كَثِيرًا وَالذَّاكِرَاتِ ،أَعَدَّ اللَّهُ لَهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴾ :

ئەو پیاو و ژنانەی ئەهلی ئەو ڕەوشتانە بن ، ئەوانەیان کردبێت بەکارویشەو بەرنامەیان ، خوا ئەفەرموێ : ئەوە پاداشتێکی زۆر گەورەمان بۆ ئامادەکردوون، لە کەم‌وکورتی‌وگوناهەکانیان ئەبورین وچاوپۆشی ئەکەین، بۆکردەوە باشەکانیشیان ئەجر و پاداشتی گەورە قەرار ئەدەین . ئەوانەش ئەوکەسانەن کە :

یەکەم : خۆیان ڕزگار ئەکەن و خۆ ئەپارێزن لە بەندایەتی غەیری خوا. هەوڵ ئەدەن تەنها ڕوویان لە خوابێ . خۆ لائەدەن لەوەی

غەيرى خوا بكەن بە خاوەنى خۆيان ، بە فەرمانڕەواو فەريادڕەسى خۆيان، نافەرمانىو سەرپێچى لە فەرمانى خوا ناكەن .

دووەم : ئەو كەسانە هەوڵ ئەدەن ئەوحەقەى ناسيويانە (بەرنامەى هيدايەتو ڕێنمايى خواى گەورە) بەتەواويى تەسليمى بنو بەڕاستى بزانن و لەسەرى دامەزرێن .

سێيەم : هەميشە و بەردەوام – نەك ڕۆژە تا ڕۆژێ ، يا ساتە تا ساتێ– بەردەوام و بەدڵ –نە بەمەجبورى – لە هەوڵدان كە فەرمانبەردارو گوێڕايەڵى فەرمانى خوابن .

چوارەم : هەوڵ ئەدەن ڕاستگۆ بن لەوەدا كە دەيڵێن، بەندەى خوابنو موسوڵمان بن، ڕاست بكەن لەوەداو بە كردەوە بيسەلمێنن كە ڕاستە موسوڵمانن . پاشان هەوڵ ئەدەن ئەهلى صەبر بن، چونكە بەندەيى گيروگرفتو دەردیسەر دێنێ بۆ ئينسان .. بڕواداران كە لەگەڵ گيروگرفتو دەردى سەردا ڕووبەڕوو دەبن، ئەبێ صەبر بكەن، لەڕێگاى بەندەيى دەرنەچن ولا نەدەن .

پێنجەم : پاشان (خشوع) و خۆكزگرتن و خۆنزمگرتن لەبەرابەرى خواوەو، بەتەواوى تەسليم بوون بە خوا، صيفەتێكى تريانە . ئەبێ كەمترين سەرپێچى و نافەرمانى لێيان ڕوو نەدات .

شەشەم : هەروەها ئەبێ لەماڵو سەروەتو دارايىيەك كە هەيانە ، ئەوەندەى لەڕێى خوادا خەرج كەن تا بيسەلمێنن ڕاستيان كردووە

لەوەدا کە لافی ئیمانیان لێ داوە و وتویانە ئێمە بڕواداریین . ئەبێ سەدەقە بدەن، صەدەقە یەعنی ئەوەی موسولمان بیسەلمێنێ ئەهلی ڕاستبێژیو صیدقە، ڕاست ئەکا کە ئەلێ من موسلمانم، چونکە ئەگەر ئینسان سەدەقەی نەبێ، ئەگەر ماڵ و سەروەتی خۆی ـ ئەوەی کە زیاترە لە پێویستی خۆیەتی ـ لەڕێی خوا خەرجی نەکا، ئەوە دەردەکەوێ درۆی کردووە لەوەدا کە وتویەتی من (مؤمن)م .. تەنها لە کاتێکدا دەرئەکەوێ کە ڕاستی وتووە و ئەهلی (صدق)و ڕاستیە ئەوەی وا ئەبێ خەرجی بکا لەڕێی خوادا خەرجی بکاو سەرفی کا .

حەوتەم : دوای ئەوە ئەبێ ئەوکەسانە ئەهلی ڕۆژووگرتن بن، هەروەك لە پێشا ئیشارەمان کرد.. ئەو دەورەیەی خوای (متعال) دایناوە بۆ پەروەدەکردنی بەندە، بڕۆنە ناوی، ڕۆژوو بگرن، تەمرین بکەن بۆ ئەوەی هەرچیەك خوا پێی خۆشە هەرئەوەیان پێ خۆش بێ، هەرچیەکیش خوا پێی ناخۆشە ئەوانیش ئەوەیان پێناخۆش بێو لێی دووربکەونەوە .

هەشتەم : دوای ئەوە ئەبێ پیاوان خۆیان لە غەیری ژنان وهاوسەرەکانیان، هەروەها ژنانیش خۆیان لە غەیری شووەکانیان بپارێزن، تەنها پەیوەندییان لەگەڵ هاوسەرەکانی خۆیان بێو بەس، خۆیان لە حەرام دوور خەنەوە .

نوێیەم : پاشان ئەبێ هەمیشە لە یادی خوادا بن . زۆر زۆر لە بیری خوادا بن، بەو جۆرە کە هەمیشە خەریکی جێبەجێکردنی ئەرکی بەندەیی بن، بەدڵ دوای ئەوە بە زمان، پاشان بە کردەوە، زیکرو یادی خوا بکەنو بیسەلمێنن خوایان لە بیردایە و لە بیریان نەچۆتەوە.

## پوختەیەك لە ئەحکامی پۆشتەیی ئافرەت

*یەکێکی ترلەوفەرمانو دەستورانەی لە سورەتی ئەحزابدا هاتووە بەشێکە لە حوکمەکانی پۆشتەیی، کە دەفەرموێ :

﴿ يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَاءِ الْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِنْ جَلاَبِيبِهِنَّ، ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يُعْرَفْنَ فَلاَ يُؤْذَيْنَ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَحِيمًا ﴾ .

دوای ئەو تەصمیمەی کافران گرتبوویان و، موناقیقەکان بلاوەیان کردبوو بەناو شاری مەدینەداو، لەسەر هەموو کوچەو کۆلانێکا راوەستان بۆ ئەزیەت دانی ژنانی بڕوادار، خەتەرێکی زۆر گەورە خەریك بوو رووی کردبووە خانەوادە و ژنە موسوڵمانەکان، لەبەرئەوە خوای (متعال) ئەم فەرمان و دەستورە ئەنێرێ بۆ ژنانی موسڵمان تا ریعایەتی بکەن . تا موناقیقەکان ئەزیەتیان نەکەن، چونکە ئەگەر ئەمان ریعایەتی ئەم فەرمانە بکەن کە لێرەدا باس کراوە

موناڤیقەکان ئەیان ناسن، ئەزانن ئەمانە ئەهلی ئیمانن، ئیتر زاتیان نیـە و ناوێرن لێیان نزیك کەونەوە، جورئەتی ئەوە ناکـەن ئەزیـەتیان بکـەن . بەو جۆرە رزگار ئەبن لە ئەزیەتو ئازاری ئەو موناڤیقانە .

ئەفـەرموێ : ئـەی پێغەمبـەر! بڵـێ بـە هاوسـەرەکانت پـێش لـە هەموو کـەس، (چـونکە ئـەبێ لـەوێوە، لـە مـاڵی رەهبـەرەوە دەسـت پێبکرێ)، بڵێ بە کچەکانت،( چونکە لە پێشـا هاوسـەرەکە واجـب دەبێ لەسەری کە ریعایەتی ئەو شتانە بکات، دوایی کچـەکان گـەورە دەبنو، تەکلیفـو واجبـو مەسئولیەت رووەدەکاتە ئەوان)، دوای ئەوە بە ژنانی موسوڵمانان، پێیان بڵێ : کاتێ لەماڵ دەڕۆنە دەرەوە کراسـە شۆڕەکانیان بکەنە بەرو شۆڕیان بکەنـەوە بەقـەد خۆیانـا، تـا لاشـەیان داپۆشێ، چونکە ئەوە دەبێ بـەهۆی ئـەوەی بناسرێن، ئـەوە باشـترین ڕێگایە بۆ ئەوەی بناسرێنو، لە دەرەوە بزانرێ ئەمانە برِوادارنو ئەهلی ئەو جۆرە کارانە نین، ئیتر ئەزیەتیان نەکرێ لەلایەن موناڤیقانـەوە، جـا دەفەرموێ: خوا (غفـور) و (رحـیم)ە ، ئەگـەر لـەوەو پـێش ئەمـەیان نەکردووەو تووشی ئەو کردارە ناپەسندە بوون، خوا لێیـان ئـەبورێ، لە گوناهیان چاوپۆشی ئەکا . هەروەها رەحیمە، ئەگـەر لەمـەولا ئـەم دەستورو فەرمانە بەکار بێنـنو عەمـەلی پێبکـەن، لێیـان وەرئـەگرێو بەبەزەیی خۆی پاداشـتو جـەزای باشـیان دەداتـەوە. لێرەدا واجـب کراوە لەسەر ژنی موسـوڵمان لـەکاتێکا لـەماڵ دەڕواتـە دەرەوە، یـا

ئەگەر لەماڵا بوو بەڵام نامەحرەمێك لەوێ بوو، كراسی شۆڕ بكاتە بەری ، لە ملی تا سەر ئەنگوستی پێكانی داپۆشێ، بەجۆرێ هیچ كوێی بەدەرەوە نەبێ، بێجگە لەدەستەكانی ، هەروەك چۆن لە نوێژا خۆی دادەپۆشێ .( جا بەشی سەروملی با بمێنێتەوە بۆ دوایی چونكە لە ئایەتێكی تردا بەیان كراوە) . دەبێ كراسێك لەبەربكا ئەوەندە شۆڕ بێت هەموو بەدەنی داپۆشێت .

هەروەها كراسێكی وایش نەبێ زۆر پڕ لە زرقەو برق و ڕەنگی جوان بێت، ببێتە هۆی ئەوەی خەڵكی سەرنجی بدەن، وەك ئەوەی‌كراسی لەبەرا نەبێت، كراسێك بێ وەك ئەوتری ماقوڵانە بێت، بەجۆرێك داپۆشێ، دەریخا ئەم ژنە ژنێكی موحتەرەمە . ژنێك نیە ئەهلی ئەو جۆرە كارانە بێ كە تەماعی تێ بكرێ و ئەزیەتی بكرێ .

كەوابوو تا ئێرەی واجب كراوە لەسەر ژنێك كە ئیمانی هەبێ كراسێك ئابەو جۆرە كە وتمان بكاتە بەری، هەر ئەم كراسە كوردی‌یە بەشێوەیەك كەلەمەو پێش باوبووە، نەك ئەوكراسەی ئێستا لە هەندێ لە شارەكانی كوردستاندا ئەدورێت ،كە زۆر ناڵەبارە . دەبێ جۆرێ نەبێ حەجمی بەدەن دەرخا.

هەروەها كراسەكە نابێ تەنك بێ ، چونكە ئەگەر كراس یا هەر جلو لیباسێكی تر تەنك بوو، بەجۆرێ حەجمی بەدەنی دەردەخست، ئەوە هەروەك نەبوونی پۆشاك وایە . دەبێ كراسەكە وابێ حەجمی

بەدەنی دەرنەخا . خۆ ئەگەر بەشێوەیەك بوو ـ بۆ نموونە ـ لەسەر سنگیا حەجمی بەدەنی دەردەخست، ئەوە چارەی ئەوەیە سەرپۆشەکەی ئەوەندە گەورە بێ سەرسنگی داپۆشێ و ئەو بەشەش بە دەرەوە نەبێ ، وا نەبێ سەرنجی نامەحرەم رابکێشێ .

جا بۆ ئەوەی باسی پۆشتەیی تەواو بێ ، دوو ئایەتی تریش لە سورەتی (نور)داهەن، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ ،وَيَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ،ذَلِكَ أَزْكَى لَهُمْ ، إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴾ . بە پێغەمبەری خوا ـ هەروەها هەرکەسێك کە خەریکی دەعوەت کردنە بۆ رێگای خوا ـ دەفەرموێ :

بڵێ بە پیاوە ئیماندارەکان لە تەماشاکردنەکانیان کەم کەنەوە . هەمیشە خەریکی سەیرکردنی ئەمونەونەبن . سەیرکردنێ لەبەر شوێنکەوتنی هەواو هەوەس بێ . پێیان بڵێ: با لەوکارە دووریی بکەن، هۆشیان بەخۆیانەوە بێت لەو جۆرە سەیرکردنانەیان نەبێ، تەنها لەکاتێکا ئیجازەیان هەیە بڕوانن کە زەرورەتێك یا سەبەبێك هەبێت بۆ ئەو ڕوانینە، وەك ئەوەی ئینسانێکی موسوڵمان خەریکە شتێك لە دین فێری ژنی موسوڵمان ئەکا، بۆ ئەوەی باش تێی بگەیەنێ، جارجار بڕوانێ بۆی، تا ئەو هۆشی بەلایەوە بێ، بزانێ چی بۆ ئەڵێ . چونکە ئەگەر جارجارێ بۆی نەڕوانێ ئەوی‌تر تێ ناگا، دیارە لەو ڕوانینەشیا دەبێ پاکداوەن بێت، دوور بێ لەهەرجۆرە خەیاڵ و مەبەستێك کە

ناخۆشە وحەق نیە لە دڵی موسوڵماندا بێت . یا وەك ئەوەی کە پزیشك لەکاتی چارەسەردا ناچارە بڕوانێ بۆ ژنی نامەحرەم ، هەروەها شتانێکی تر لەو بابەتە .

هەروەها دەفەرموێ : پێیان بڵێ شەرمگا و حەیایان بپارێزن . لە ڕێگای ناشەرعیەوە تووشی ئەوە نەبن کە خوا پێی ناخۆشە . دیارە ئەوە زیاتر دەبێ بەسەببی ئەوەی بەرەو کامڵ بوون بڕۆن و زیاد بکەن . بیشزانن حەتمەن خوا ئاگادارە لەوەی ئەنجامی ئەدەن، خەبەری هەیە چی دەکەن و چی ناکەن . جا با هۆشیان بەخۆیانەوە بێ ، بزانن خوا لەسەر ئەوەی ئەنجامی دەدەن، موحاسەبەو موحاکەمەیان دەکا .

﴿ وَقُلْ لِلْمُؤْمِنَاتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَارِهِنَّ ،وَيَحْفَظْنَ فُـرُوجَهُنَّ ﴾ : هەروەها بڵێ بە ژنە بە ئیمانەکان، ئەوانەی بەڕاستی ئیمانیان دامەزراوە و ڕاست ئەکەن کە موسوڵمانن، پێیان بڵێ: ئەوانیش هەروەك پیاوانی بە ئیمان لە دیدو ڕوانینەکانیان کەم بکەنەوە . هەر بەوجۆرە بۆ پیاوان وترا ئەمانیش شەرمگا و حەیایان بپارێزن . خۆیان بپارێزن لەوەی لەو ڕێگایەوە تووشی ناشەرعی بن .. دیارە تەنها لەکاتێکا ئەو پاراستنە دەبێت کە لە ڕوانینەکانیانا هۆشیان بەخۆیانەوە بێ‌و سەیری ئەمو ئەو نەکەن، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی نزیك کەونەوە لەکاری حەرامو تووشی کاری زۆر ناپەسەند بن .

﴿ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ مَا ظَهَرَ مِنْهَا ﴾ : بـا زینەتـەکانیان، خشـڵو ئارایشـەکانیان دەرنەخـەن، مەگـەر ئـەوەی خـۆی دەرکـەوێ . لـە ئایەتەکەی ترا فەرمووی: کاتێك کە ئەڕۆنە دەرەوە خۆیان ئەڕازێننەوە، لێرە دەفەرموێ : زینەتو ئارایشتەکانیان دەرنەخـەن، مەگـەر ئـەوەی خۆی لەخۆیەوە دەرکەوتبێ ..

دیارە ئەو زینـەتو ئارایشـەی بەقـەد ژنـەوە دەبێـت دوو جـۆرە : بەشێکی وایە بێئەوەی ژنەکە خۆی بخاتـە زەحمـەت، بێئـەوەی هـەوڵ بدات بۆ دەرخسـتنی، دەردەکـەوێت، وەك ئەنگوسـتیلەیەك لەدەسـتا بێت، وەك ڕەنگێك بەقەد دەستیەوە بێت، وەك کلەیەك کە لـە چـاودا بێت، وەك هەر زینەتێکی ترکە بەقەد دەموچاوەوە بێت، ئەوە لەخۆیـەوە دەردەکەوێت، ئەگەر ژنی موسوڵمان خۆیشـی بـۆ نەخاتـە زەحمـەت و هەوڵی بۆ نەدا، هەردەردەکەوێ . بـەڵام زینـەت و ئارایشـێ کـە لـە غەیری ئەو دوو جێگایەدا بێت بەجۆرێکە ڕەحەت دائەپۆشرێ . ئەگەر ژن خۆی قەسدی نەبێ دەری بخا، دەرناکەوێ . کەوابوو لەسـەر ژنـی موسـوڵمان واجبـە کـە لای نامەحرەمـدا بـەوجۆرە بـێ، تـەنها ئـەو زینەتوئارایشەی لەخۆیەوە، بێئەوەی خۆی قەسدی بێ دەردەکەوێ، تەنها ئەوە دەرخاو غەیری ئەوە جائیز نییە دەری خا . جا لەو ڕەنگـو شتەش کە بەقەد دەسـتو دەمو چاوەوەیە هەنـدێکی هـەر جـایز نیـە دەرکەوێ . بۆ نمونە : ژنێ دەیەوێ بەیانی بڕوا بـۆ بـازاڕ، زەرورەتـەو

نەبێ بڕوا، یا لەماڵ بڕواتە دەر بۆ جێگایەك، ئەوە ئیتر جایز نیە ئەو شەوە لەو ڕەنگەو شتە بدا لە خۆی و خۆی برازێنێتەوە، چونکە نەزانێ بۆ بەهانی بەجوانی نەمێنێتەوە و خەڵك سەرنجیان ڕا نەکێشرێ بۆی، بەڵام ئەگەر پێش لەوە قەسدی چوون بۆ بازاڕ بکا، شتێ لەوانەی دابێ لەخۆیو، زۆرێکی لەبەین چوویێ هەر نەسەرو نیشانەیەکی مابێ، دوواییش ناچار بێ بڕواتە دەرەوە، ئەوە قەی ناکاو، پێویست نیە خۆی بۆ بخاتە زەحمەت ..

بە کورتی ، ئەوەی خۆی قەسدی بێ لە دەرخستنیا و خۆی بیەوێ دەرکەوێ، بە خۆ ڕازاندنەوە دەری بخا، ئەوە لەگەڵ ئیمان جۆر دەرنایەتو، ژنێك بڕوای بێت بەخوا، ناتوانێ شتێ ئاوا بکا .

﴿ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَى جُيُوبِهِنَّ ﴾ : با سەرپۆشەکانیان وابدەن بەسەریانا کە سەرو ملیان داپۆشێ و بەخەکانیشیان بگرێتەوە . لە ئایەتەکەی تردا ـ لە سورەتی ئەحزابدا ـ بەیانی کرد دەبێ ژنی موسوڵمان لەکاتێکا لەماڵ دەچێتە دەرەوە، یا کاتێك لای نامەحرەمێکە ، دەبێ کراسێکی شۆڕ بکاتە بەری، لێرەش باسی ئەوە دەکا واجبە لەسەر ژنانی موسوڵمان کە سەرپۆش وابدەن بەسەریاندا کە سەروملیان هەموو داپۆشێ . کەوابوو تەنها دەمێنێتەوە دەموچاو و دەست تا مەچەکی دەست، تەنها ئەو دووانە دەمێننەوە کە بەدەرەوە بن، هەروەك لە نوێژدا ژنی موسوڵمان دەوەستێ . یەکێك لە

حیکمەتەکانی ئەوەی کە ژنی موسوڵمان لە نوێژدا ئاوا لـە حـزوری خوا دەبێت ئەوەیە کە فێر بێ کە دوایی لەناو کۆمەڵیشدا هـەروابێ . بۆ ئەوەیە فێربێ لەهەرکاتێکی تریشدا کە نامەحرەم هەیە هەر ئاوابێ، تـەنها دەســتەکان و دەموچـاوی بـەدەرەوە دەبـن و ئەنـدامانی‌تری داپۆشـراون، سـەر داپۆشـراوە، مـل داپۆشـراوە، بـەدەن هـەمووی داپۆشراوە، قاچی داپۆشراوە، هەتا دەبێ گۆرەویشی لە پێـدا بێـت تـا پێی بەدەرەوە نەبن، گۆرەویەکانیش دەبێ تەنك نەبن کە ڕەنگی پێـستی لەژێر گۆرەویەکانەوە دیار بن .

﴿ وَلاَ يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلاَّ لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ آبَائِهِنَّ أَوْ آبَـاءِ بُعُـولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَائِهِنَّ أَوْ أَبْنَاءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي إِخْوَانِهِنَّ أَوْ بَنِي أَخَوَاتِهِنَّ أَوْ نِسَائِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ أَوِ التَّابِعِينَ غَيْرِ أُوْلِي الإِرْبَةِ مِنَ الرِّجَالِ أَوِ الطِّفْلِ الَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا عَلَى عَوْرَاتِ النِّسَاءِ ﴾ :

لەم بەشە لـە ئایەتەکانـدا کەسـانێك نـاو دەبـرێن کـە مـەحرەمن، دەفەرموێ : قەیناکا ئەگەر ئافرەتی موسوڵمان زینەت‌وئارایشتەکەی بۆ ئەوانــە دەرخـا، ئـەو بەشـەی وا لــە پێشـا فـەرمووی لەخۆیـەوە دەردەکەوێ، ئەوە بۆ هەمووکەس دروستە دەربکەوێ، بەڵام ئەوەی وا فەرمووی حەق نیە دەری خەن، دەفەرموێ بـۆ هەنـدێ کـەس قـەیناکا زینەت وئارایشەکەیان دەرخەن ، بۆ ئەم چەند کەسە : بۆ مێردەکانیان، بۆ باوکەکانیان، بۆ باوکی مێردەکانیان (خەزووریان)، بـۆ کوڕەکانیـان،

بۆ کوڕی مێردەکانیان ئەگەر لە ژنی تر بێ ـ واتە کۆلەبەسیان ـ، بۆ براکانیان، بۆ برازاکانیان، بۆ خوشکەزاکانیان، بۆ ژنەکانیان، (واتە : ژنانی موسوڵمان لەگەڵ هەندێ لە ژنەکان پەیوەندی و عیلاقەی تایبەتیان هەیە، زۆر بەیەکەوە دەبن، لەگەڵ ژنانی تر، بەوجۆرە نین، هەر ژنێ چەند ژنێ هەن کە زۆر لەگەڵی دەبن و هاتوچۆ و هەڵسوکەوتیان بەیەکەوە زۆر دەبێ، یەکتر دەناسن، بڕواو ئیعتیمادیان بەیەکتر هەیە، ناترسن لەیەکتر، ناترسن لەوەی ئەمیان قسەی ئەویان لای کەسێك بکا کە نامەحرەمە بۆی، ئەوی تر قسەی ئەم لای کەسێك بکا کە نامەحرەمە بۆی . ئەو ژنانە کە زۆر لەگەڵ یەك هەن و یەکتر دەناسن و بڕوایان بەیەك هەیە، ئەوە قەیناکا ئەگەر زینەت و ئارایشیان بۆ یەکتر دەرخەن، بەڵام غەیری ئەوانە ژنانی‌تر، چ ژنانێ کە نا موسوڵمانن، چ ژنانێ کە نایانناسن، نازانن چۆنن و ئەخلاق و رەوشتیان چۆنە، ئەوە دروست نیە لای ئەوانیش خۆیان دەرخەن، ئەو ژنانە هەروەك پیاو نامەحرەمن، دروست نیە غەیری دەموچاو و دەستەکانی هیچ کوێی تری بۆ دەرخا، ئەمە دەستورێکە زۆر غەریب و نەناسراوە لەناو موسوڵماناندا)..

پاشان ئەوە بەیان ئەکا لە زەمەنێکا کە عەبدو کەنیزەك هەن، بۆ ئەوانیش قەیناکا، چونکە زۆر نزیکن و زۆر عیلاقەیان هەیە بەیەکەوە، (ئێستا ئەوانە نین و زۆر لەسەری ناڕۆین).

دوای ئەوە دەفەرموێ : ئەو پیاوانەی وا تابیعی ئەهلی ئەو ماڵەن، وەك خزمەتكاروكارگەرو مزور لەوماڵەدا، لەبەرئەوەی كە تابعن، لەبەرئەوەی بوون بە پەیڕەوی ئەهلی ئەو ماڵە، تەماع ناكەنە ئەو ژنانەی كە لەو ماڵەدا هەن، ئیجازە بەخۆیان نادەن بە چاوی خیانەتەوە بۆیان بڕوانن. دیارە ئەوانەش دەبێ گەیشتبنە حەددێك نیاز بە ژن لە دڵیانا نەمابێ. تەماعی ئەوەیان نەبێ، وەك دەوترێ: دڵیان مردبێ، بیریان بەلای ژنەوە نەبێ ، ئەوانەش قەیناكا زینەتو ئارایشی ژنە موسوڵمانەكان لەلایانا دەركەوێ، هەروەك چۆن لای باوكو براكانیان دەردەكەوێ.

پاشان دەفەرموێ : ئەو منالانەش هێشتا منالن‌و ئاگاییان پەیدا نەكردووە بەسەر ئەو شتانەی ژن هەیانەو نابێ نامەحرەم ئاگایی بەسەریانا پەیدا بكا، هێشتا وایان لێ نەهاتووە خەبەرداربن لەو جۆرە مەسەلانە، هێشتا وایان لێ نەهاتووە سەرنجی ئەو شتانە بدەن كە دروست نیە ژن بۆ نامەحرەم دەریان خا، واتە : ئارەزوی ئەوەیان نەكرتووە كە بیرلەو شتانە بكەنەوە ، وەك منالی شەش حەوت ساڵو هەشت ساڵ، ئەوانەش قەیناكا ژنان زینەتو ئارایشیان لە لایان دەربكەوێ . بەلام ئەگەر گەورەتربوون، وایان لێ هات كەوتنە فیكری ئەو جۆرە شتانە، خەبەریان پەیداكرد لەو جۆرە شتانە، ئەوە ئیتر وەك پیاوی گەورە نامەحرەم دەبن ..

جا بۆ ئەوانە فەرموویەتی قەیناکا زینەت و ئارایشیان بۆ دەرخرێ.
مانای ئەوەیە – بۆ نمونە – کچ قەیناکا لای باوکیا بەتەواوی سەرپۆشەکەی نەدا بەسەریا، یا لای برایدا قەیناکا یا دەستی بەتەواوی دانەپۆشێ، یاکەمێ لە مەچەکی بەدەرەوە بێ، جێی بازنو شت بەدەرەوەبێ، یا قەیناکا یا گۆرەوی لە پێدا نەبێ وکەمێ لە قاچی بە دەرەوە بێ، یا ملی میقداریّ بەدەرەوە بێ، یاکەمێ لە سینگی بەدەرەوە بێ .. ئاوا لەو ستورەو لەو جێیانەدا کە زینەت و ئارایشیان تێدایە، قەینا بەدەرەوە بن، بەلام ئەگەر لای باوکو برایا بەتەواوی سەر ڕووت کا، یا سینگ ڕووت کا، یا قاچو قولی ڕووت کا، ئەوە ئەگەر بۆ باوکەکە، یا بۆ براکە، یا بۆ کەسێتر لەوانەی باس کران، نەبێتە هۆی ئەوە خۆی سەرنجیان ڕاکێشێ و، شتێك نیسبەت بەو لە دلّیانا پەیدا نەبێ، خۆ هیچ نەبێ ئەبێتە فیکری ژنانیتر، بەتایبەت برایەك کە گەنجە، یا برازاو خوشکەزایەك کە گەنجو جوانن، ئەوانە لە کاتێکا خزمەکەی خۆیان، مەحرەمەکەی بەو جۆرە دەبینن، هیچ نەبێ ئەکەونە فیکری ژنی بێگانە، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوە بەرەو گومڕایی و لادان بڕۆن. بۆیە لای ئەو مەحرەمانەش نابێ لە دەرخستنی زینەت و جوانیدا زیادەڕەویی بکرێ.

ئەلبەتە ئەوەیش بلێین کە بۆ مێردەکانیان زیاتر لەمەش جائیزە، بۆ مێرد هیچ مەنعێك نیە، هەرجۆرکە مێرد داوا بکا لە ژنەکەی کە خۆی بۆ دەرخا، دەبێ خۆی بۆ دەرخا، هیچ مەنعێك لەوکارەدا نیە .

﴿ وَلاَ يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِنْ زِينَتِهِنَّ ﴾ : هەروەها بـا ژنان پێیان نەدەن بە زەویدا کە ئەگەر خرخاڵێ، شتێ، لـە پێیانـدا بـور زرنگەی بێ‌و خەڵك بزانێ شتێك لە پێیاندایە . ئاخر قـەرارە هـەروەك وتمان کراسەکە ئەوەندە شۆڕ بێ پێیانی داپۆشیبێ، ئەوەیشی بەدەرەوەیە گۆرەوی داپۆشیبێ، پێی هەر بەدەرەوە نـەبێ، جـا ئەگـەر شـتێك لـە خشڵ لە پێیاندا بوو حەق نیە وەختێ ئەڕۆن بە ڕێدا تونـد پـێ بکـوتن بەزەویدا، یان لەقە بدەن لە شتێ زرنگەی بێ‌و ئەو شتەی دایانپۆشیوە خەڵك پێی بزانن، چونکە وەك ئەوەیە دەریان خستبێ . جا ئەو پێڵاوە پاژنە بەرزانەی ئێستا هەن شتێکی لەو بابەتەن، کاتێ ئەڕۆن بـە ڕێـدا و تەقـەیان دێـت، سـەرنجی پیـاو بـۆ لای خۆیـان ڕادەکێشـن، ژنێـك موسـوڵمان بێـت حـەق نیـە لەوانـە بکاتـە پێـی، یـا حاڵـەتێ وای لێ دەرکەوێ .

﴿ وَتُوبُوا إِلَى اللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَا الْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾ : دیـارە هیچ بڕوادارێك بێ‌بەش نەبووە لەوانەی ئێستا بەیان کـراون، لەوانـەی مەنعیان لێ کراوە .. هەرکەسێك کەم یا زۆر تووشی ئەو شـتانە بـووە، بۆیـە خـوا دەفـەرموێ : ئـەی ئیمانـدارەکان! هـەمووتان بـە گشـتی

بگەڕێنەوە بۆلای خوا، تەوبە بکەن، تا ئەوە ببێ بەهۆی ئەوەی بەرەو ڕزگاریو خۆشبەختی بڕۆن، ئەگەر نا، ئەگەر وانەبن خۆشبەختیو ڕزگاریتان دەست ناکەوێو، گرفتاری سزای خوا دەبن ..

* یەکێ تر لەو کردەوە نا شەرعیانەی لێرەدا دەبێ باسی بکرێ – کە ناشەرعیترو مەترسیدارترە لە سەیرکردنی نامەحرەم – خەڵوەت کردنە لەگەڵ نامەحرەم، ئەوەی کە ژنێك لەگەڵ پیاوێکی نامەحرەم لە جێگایەك بێ کە کەسی تر لەوێ نەبێ، کەسێك کە جێی بڕواو متمانە بێ، وەك مەحرەمی خۆی، وەك برای ، وەك مێردی، وەك باوکی، وەك ژنێك دارای ئیحترام بێ، بەتایبەت خەڵوەت کردن لەگەڵ خزمی مێرد، وەك خەڵوەت کردن لەگەڵ هێوەر، یا لەگەڵ ئەوانەی لەو بابەتەن، ئەوە خەتەری زۆر زۆرترە، بۆیە پێغەمبەری خوا کاتێ لێی دەپرسن : مەگەر لەگەڵ ئەوانیش هەر جائیز نیە خەڵوەت بکرێ ؟ دەفەرموێ : ئەوە ئیتر مەرگە . زۆر خەتەری زیاترە لە حاڵەتەکانیتر.

* چەند فەرمانیتر لەوانەی پێویستە ئینسانی موسوڵمان لەناو خێزانوکۆمەڵدا لەبەرچاوی بێو، ڕیعایەتیان بکاو، عەمەلیان پێبکا، ئەمانەن :

هەرلە سورەی (نور)دا فەرمانێ هاتووە بۆ ئەوەی ئینسان بە بێ ئیزنو مۆڵەت نەچێتە ماڵی کەس . ماڵێ خەڵکی تیا بێ تەنها لە

کاتێکا نەبێ بچێ کە ئیزنیان لێ وەرگرێ، نەتەنها ئەوە بەڵکو دەبێ بشزانێ ئایا پێیان ناخۆش نیە کە ئەچێ؟ ئایا نابێ بەسەبەبی نارەحەتی‌یان؟ ئایا ئامادەن بۆ ئەوەی میوانداری‌و پێشوازی لێ بکەن؟ کاتێکیش ئەچێ دەبێ بەسەلامەوە بڕواتە ماڵەکە، سەلامیان لێ بکا.. سەلام دوعای خێرکردنە . کاتێ ئینسان دەڵێ : (السلام علیکم) یانی خوا بتان پارێزێ لەهەرچییەك کە ناخۆشەو، لەهەر ئافەت‌و بەڵایەك . ئەم سەلام کردنە مانای ئەوەی تیایە ئێوە دڵتان رەحەت بێ، لەلایەن منەوە تووشی هیچ ئافەت‌و دەردو بەڵاو ناخۆشییەك نابن . من قەسدی ئەوەم نیە هیچ زیانێکتان پێ بگەیەنم، چونکە ئەگەر قەسدی ئەوەم بوایە دوعای خێرم بۆ ئەدەکردن‌و ئەم دەوت : (السلام علیکم).

دەفەرموێ : ﴿ يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ بُيُوتِكُمْ حَتَّى تَسْتَأْنِسُوا وَتُسَلِّمُوا عَلَى أَهْلِهَا، ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾ : بانگ دەکاتە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە و دەفەرموێ: مەچنە ماڵانی‌تر، ماڵانی غەیری خۆتان، هەر ماڵێکی‌ترکەکەسی تری تیایە، (تەنانەت ئەگەر ماڵەکە هی خۆی بێ بەڵام دابێتی بە کرێ و کرێنشینی تیابێ، ئەوەیش هەر ئیجازە نیە هەروا بڕواتە ناوی) ، ماڵێ کەسی تری تیایە مەچنە ناوی، تا کاتێك ئیزن وەرگرن لە ساحێب ماڵەکەو بزانن پێیان خۆشە . جا تەنها ئیجازە وەرگرتنەکە بەس نیە، ئەبێ بشزانن ئایا ئەگەر بڕۆن ئامادەن بۆ ئەوەی میوانداری و پێشوازیتان لێ بکەن، نارەحەت

نابن بەچوونی ئێوە، پێیان ناخۆش نیە برۆن؟! ئەو کاتە بـڕۆن .. پاشـان لەکاتێکا دەڕۆنە ماڵەکە سەلامیان لێ بکەن، بەسـەلام کـردن دوعـای خێریان بۆ بکەن، تا دەرکەوێ چوونی ئێوە بۆ ئەوێ ئەوەی تیا نیە کـە کەمترین زەرەرو زیانیان پێ بگات، ئائەوە باشترە بۆتـان لـەوەی بـەبێ ئیزن، یـا بـە ئیـزن وەرگرتنێـك هـەر ڕواڵـەتیو زاهـیری بـێ و، لـە حەقیقەتدا ئیزن وەرگرتن نەبێو ساحێب ماڵەکە پێی ناخۆش بێ و حەز نەکا بڕۆن . یا بڕۆن ،بەلام سەلام نەکەنو، ئەو دوعـای خێرەیـان بـۆ نەکەن .. پاشان خوا دەفەرموێ : ئـەوەتان بـۆ بـەیان دەکـەین بـەلکو بیربکەنەوە، بزانن ئەمە باشە، ئەمە جوانـە، ئەگـەر وانەکـەن ناخۆشـە، خووڕەوشـتێکی خراپە، حەق نیە ئاوا خووڕەوشتێ لـەناو موسـوڵمانان وکۆمەڵی ئیسلامیدا بێ ..

کەواتە لەسەر هەر موسوڵمانێك واجبە کاتێ دەیەوێ بڕوا بۆمـاڵی کەسێك ، بزانێ تەرەفەکە پێـی خۆشـە، ئیجـازە دەدا، ئامادەیـە، حـەز دەکا بۆ ئەوەی بڕواتە لای؟ کاتێکیش چوو سەلامیان لێ بکا . جا ئـیتر ئەوە بەشێوەی جۆرجۆر دەکرێ ئینسان پێـی بزانـێ، ئـەکرێ ئینسـان بڕواتە بەر دەرگاکەو بدا لە دەرگاو ئیـزن وەرگـرێ، جـا لەکاتێکـدا ئیجازەی دەدەن دەتوانێ سەیر بکا بزانێ لەبەر ڕوودەربایسیو شـەرمو حەیا ئیجازەیان داوە، یا بەدڵ ئیجازەیان داوە و پێیان خۆشە کـە بـڕوا؟ ئەگەر زانی ڕوویان نیە جوابی بکەن ، یا پێیـان خـۆش نیـە لەوکاتـەدا

بڕوا، ئەوە دروست نیە بڕوا، دەبێ حەتمەن بگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەر زانی پێیان خۆشە، ئامادەن بۆ ئەوەی بڕواتە ماڵەوە، ئەوە بڕواو سەلام بکاو دانیشێ ..

بەجۆرێکی تریش دەبێ، وەك ئەمڕۆکە تەلەفون هەیە، ئەوە باشترین ڕێگەیە ئەگەر دەست کەوێ بۆ ئینسان، لە پێشدا بە تەلەفونی خەبەریان پێ بدا کە ئایا ئامادەن بۆ ئەوەی لە فلان سەعاتدا بڕوا بۆ ماڵیان؟ یا ئەگەرلەو سەعاتەدا ئامادەنین، لە چ سەعاتێکی تردا گونجاوە؟ وەختیان لێ وەرگرێ ، دیاری بکا لە چ وەختێکا دەڕوا. دوای ئەوە لەو کاتەدا بڕوا.. دیارە دەبێ بە ئەندازەیەك دانیشێ کە نابێت بەهۆی نارەحەتییان .

پاشان دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّى يُؤْذَنَ لَكُمْ ﴾:

ئەگەر کەستان دەست نەکەوت لەو ماڵانەدا، یا کەس لەوێ نەبوو، یا هەبوو بەڵام وەڵامی نەدایەوە. یا ئێوە کەستان نەدی لەوێ، لەو حاڵانەدا ئەوە مەچنە ناو ماڵەکان، حەقتان نیە لەخۆتانەوە بڕۆنە ماڵەوە، تاکاتێ کە ئیزنتان پێ بدرێ، وەك ئەوەیکەسێك خۆی لەبازارە، یا لە دوکانە، یا لە باخدایە، لە جێگایەکدایە، کاتێ میوان دەڕوا بۆ ماڵەکەی، خەبەر دەزانێ کە میوانێ چاوەڕێیە، کەس دەنێرێ پێی دەڵێ : برۆ بە میوانەکە بڵێ : بڕواتە ماڵەوە، تا خۆم دێمەوە ..

ئەوە جائیزەو دروستە، بەڵام ئەگەر کەسی نەدی لەماڵەوە، کەسی دەست نەکەوت و ئیجازەشی نەدرابوو بڕواتە ماڵەوە، ئەوە حەقی نیە کە بڕوا و دەبێ بگەڕێتەوە .

﴿ وَإِنْ قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا ﴾ : ئەگەر پێتان وترا بگەڕێنەوە، ئێستا کات نیەو ئامادەنین بۆ ئەوەی میوانداری بکەین، یا ئیش وکاری ترمان هەیە، یا بە هەرجۆرێکی تر پێتان وترا بگەڕێنەوە، ئەوە بگەڕێنەوە . ﴿ هُوَ أَزْكَى لَكُمْ ﴾: چونکە ئەوە ـ ئەو گەڕانەوەیە ـ کردارێکە زیاتر خێرو بەرەکەتی تیایە بۆ ئێوە. ﴿ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴾ : هەرچییەك ئێوە ئەنجامی دەدەن، خوا بەوە زانایە. دەزانێ چی ئەکەن و چاوی لێتانەو چاودێریتان ئەکا . ئەگەر پێچەوانەی فەرمانی ئەو بجوڵێنەوە، دیارە لە دەست سزای ئەو دەرناچن . هەروەك ئەگەر فەرمانبەرداریتان لەوکرد، حەتمەن جەزای خێرتان دەست دەکەوێ .. ئەمە بە نیسبەت ماڵێکەوە کە دانیشتووی تیا بێت، بەڵام هەندێ بیناو ساختمان هەن کە عمومینو کەسی تایبەتیان تێدا نیە، وەك : هوتێل یا قوتابخانەو مەدرەسە، یا کاروان سەرا، یا سینەما ، یا هەر بیناو ساختمانێکی تری لەو بابەتە، ئەوانە دەستوورێکی تریان بۆهەیە، دەفەرموێ :

﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَكُمْ ﴾ : نابێ بە گوناح بەسەرتانەوەو لادان لەرێگە نیە، کە بڕۆنە

ناونەو ماڵانەی جێی تایبەتی کەس نین، بە شەرتێ کارێکتان بێ لەوێ‌و شتێکتان پێویست بێ .. ئەگەر کەسێك کاری بە موسافرخانەوهوتێلێك، یا مەدرەسەیەك، یا کاروانسەرایەك، یا نەخۆشخانەیەك، یاهەر شوێنێکی تری لەوبابەتە هەبوو، دەتوانێ بێ پرس بڕوا، ئەڵبەتە ئەو شوێنانەش ئەگەر ئیزنی نەدەن دیارە دەبێ ریعایەت بکا، (وەك ئەو شوێنانەی (استعلامات) وپرسگەی تێدایە ).

بەڵام ئەوەش بزانن لێرەشدا هەر دەبێ خواتان لە بیردا بێ، چونکە ڕەنگە کەسانێ ئیمانیان دانەمەزراوە ئەوە بکەن بە بەهانەو بڕۆنە ئەو ماڵە (عمومی)یانە، بەبەهانەی ئەوەکە شتێکیان لەوێیە، بەڵام ئەگەر لەکاتێکا بڕۆن مەسەلەن نامەحرەمێك لەوێیە بۆ ئەوەی بگەن بەو نامەحرەمەو شتێکی ناشەرعی تووش بێن، ئەوە دەفەرموێ:

﴿ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴾ : خوا دەزانێ چ شتێ دەرئەخەن‌و چ شتێ دەشارنەوە . ئەگەر هاتوو کەسێکتان وای دەرخست لەبەر ئیش‌و کارێ دەڕواتە ئەو شوێنە، بەڵام لە دڵیدا ئەوە هەبووکە لەوێ لەگەڵ نامەحرەمێك رووبەروو بێ‌و تووشی نامەحرەمێك بێ، ئەوە خوا بەوە دەزانێ و لەسەر ئەوە سزاو موحاکەمەی هەیە، چونکە خوا دەزانێ ئەو کەسە شتێ دەشارێتەوەو شتێکی‌تر دەردەخا. ئەڵبەتە ئەگەر لە میوانخانەدا کەسێ ژوورێکی بۆخۆی گرت، ئیتر تا کاتێ وەختەکەی تەواو دەبێ ئەو ژوورە هی

ئەوە، مەسکەنو مەئوای ئەوەو کەسی تر بەبێ ئیجازە ناتوانێ بڕواتە ماڵەوە.. بۆیە ئەوەی وتمان جائیزە بڕواتە موسافیرخانەوە، بەشێوەی گشتی بوو، بۆ ناو ئەسڵی موسافیر خانەکە بوو، نەك ئەوەی بڕواتە ژوورەکانی ئەمو ئەو.

* ئێستا حوکمێکیترو فەرمانو دەستورێکی تر لە لایەن خواوە باس دەکرێ، کە بەداخەوە هەر تەواو غەریبە و ڕەنگە زۆربەی موسوڵمانان هەر نەشیان بیستبێ، ئەویش ئەمەیە کەلەناو خێزانو خانەوادەدا هاتوچۆی منالان بۆ ژوورو هۆدەی دایكو باوك ، هەروا بێ بەرنامەو بێدەستور نابێ، دەبێ ڕیعایەتی نەزمو بەرنامەو تەرتیبێك بکرێ ، کەبەم جۆرە دەبێ :

منالێ کەوا هێشتا نەگەیشتوەتە حەددێك بتوانێ خۆی سەربەخۆو بەتەنهایی و بێیاریدانی دایکو باوك خۆراك بخوا، یا بڕواتە دەست بەئاو خۆی پاك بکاتەوە، منالێك تا حدودی پێنج ساڵ و شەش ساڵ بێ، ئەوە دیارە هەمیشە لای باوكو دایکیەتیو نیازی هەیە بەوان و، شەوو ڕۆژ لای ئەوانەو، خۆراك لای ئەوان دەخوا، شەویش لای ئەوان دەبێت ، بەلام منالێك گەیشتە ئەو حەددەی بتوانێ بۆ خۆی خۆراك بخوار بۆخۆی خۆی پاك بکاتەوە، بتوانێ بڕواتە دەست بەئاو، ئەو شتانەی پێویستن ئەنجامیان بدا بۆخۆی ، سەربەخۆ بیانکا، نیازی نەمابێ

هەمیشە دایكو باوكی بەدەمیەوە بن، وەك منالی حەوت ساڵو زیاترلەوە تا دەگاتە حدودی ١٢ ساڵو ١٣ ساڵ، بۆ ئەوانە خوا دەفەرموێ : ئیجازەی نیە، دروست نیەوحەق نیە هەمیشە لە ژووری تایبەتی دایكو باوكا بێ . بۆیە سێ كاتی دیاری كردووە كە لەو سێ كاتەدا دەبێ ئەو منالآنە لە ژووری تردا بن، غەیری ژووری دایكو باوكیان، لە ژووری خۆیاندا بن ، ئەگەر پێویستیو نیازیان هەبوو بەوەی بڕۆنە لای دایكو باوكیان دەبێ ئیزن وەرگرن جا بڕۆنە ژوورەكەیان، دەبێ لەدەرگا بدەن و ئیجازەیان بدرێ، جا دەرگا بكەنەوە و بڕۆن، ئەگەر شتێكیان ئەوێ هەڵی گرن و بڕۆنە دەرەوە، ئەمە بۆ ئەومنالآنە كە سەربەخۆ بوون و، هەمیشە ئیحتیاجیان نیە بە باوكو دایك، تا سنوری ١٢و ١٣ ساڵ، تاكاتێ هێشتا كوڕن و ئارەزوی ئەوەیان بۆ پەیدا نەبووە فیكری ژنو ئەو شتانەی كە پەیوەندی بە ژنانەوە هەیە، بكەن. هێشتا ئەوە نەكەوتۆتە دڵیان كە مەیل پەیدا بكەن بەرەو لای ژنان . یا كچن و، هێشتا نەگەیشتونەتە حاڵەتێك دڵیان حەز بكا بەوەی لەگەڵ كوڕان سەروكاریان بێت و لەگەڵیان بن .. لەوەولایش، لەكاتێكەوە ئاوەزیان بۆ پەیدا بوو، لەكاتێكەوە وایان لێ هات حەز بكەن لە جینسەكەی تر، كوڕان حەز بكەن لە كچان، كچانیش حەز بكەن لە كوڕان، لەو كاتە بەولاوە ئیتر دەبێ

هەروەك پیاوی گەورەو وەك ژنی گەورە رەفتار بكەن، دەبێ هەمیشە بە ئیجازەوە بڕۆنە ژووری دایكو باوك .

بۆ زیاتر ڕوون بوونەوە پێویستە بلێین : ژن و پیاوێك لە ماڵێكدان، مناڵێكیان هەیە یەك ساڵە، یا دوو ساڵە، یا سێ ساڵو چوار ساڵە، یان پێنجو شەشە، ئەوە هەمیشە دیارە بەلایانەوەیە، واجب نیە لە ژووری تردا بێ، بەڵكو لەكاتێكدا كە زۆر مناڵە هەر دەبێ لەو ژوورەدا بێ كە خۆیان هەنو دەبێ هەمیشە بەلایانەوە بێ و بەدەمیەوە بن .. بەڵام ژنو پیاوێك كە مناڵێكیان هەیە بووە بە حەوت ساڵ، یا هەشتو نۆ تا دوانزە ساڵ ، ئەوە لەو سێ وەختەدا كە ئێستا باسیان ئەكەین ئەبێ لە ژووری تردا بێ ، ئەبێ بە بێ ئیجازە نەیەتە ژووری دایكو باوكی .

**كاتی یەكەم** : لەكاتی پشووی نیوەڕۆدا ، كاتێ دایكو باوك بەپێی قاعیدە و عورف لەحاڵەتی ئیسراحەتدان، جل و بەرگیان لابردووە . عادەتەن دەبێ حاڵەتێكیان بێت وەك حاڵەتی كەسێك كە دەخەوێت، ئەوەش حەقی هەر ئینسانێكە، هەر موسوڵمانێك دەبێ ئەوەی لە بیر بێ، ڕیعایەتی حەقی خەڵك بكا، لەوجۆرە وەختانەدا موزاحیمی كەس نەبێ، چونكە قەرارە لەكاتی نیوەڕۆدا، لەبەینی نیوەڕۆو عەسرا، ئینسان ئیستراحەت بكا . ئیتر ئەوە بەپێی عورفو عادەت و بەرنامەی ئەو كۆمەڵگەیە، یا سەعاتێ یا سەعات و نیوێ، یا دوو سەعات ، یا تا چەندێك كە عادەتو عورفی ئەو كۆمەڵە وایە، قەرار وایە ئەو دایكو

باوکە لەحاڵەتی ئیسراحەتدا بن، ئەو جلو لیباسەی لە دەرەوە دەیکەنە بەریان لەبەریانا نەبێ، ئامادەیی ئەوەیان نەبێ کەسێك وا ناوەزی هەیە بۆیان بڕوانێ. دەی لەوکاتەدا منداڵەکانیان ئەوانەی حەوت ساڵ و بەرەو ژوورن ، حەق نیە بەبێ ئیجازە بڕۆنە ماڵەوە، ئەگەر پێویست بوو بڕۆن دەبێ بدەن لە دەرگا، کاتێ باوكو دایك ئیجازەیان دا، بڕۆنو ئەگەر شتێکیان هەیە هەڵی گرن و زوو بڕۆنە دەرەوە بۆ ژوورو ئۆتاقی تایبەتی خۆیان .. ئەوە یەکێك لە وەختەکان .

وەختێکی تریان ـ کاتی دووەم ـ دوای نوێژی عیشایە تا کاتی خەوتن . کە نوێژی عیشا کرا، ئیتر دەبێ ئەومناڵانە بڕۆنە ژووری تایبەتی خۆیان، حەقیان نیە بڕۆنە ئەو ژوورەی دایكو باوکیان لەوێیە، ئەگەر شتێکیان دەویست دەبێ ئیجازە بگرن، تەقە بدەن لەدەرگا، بە ئیجازەوە بڕۆنوئەو شتەی دەیانەوێ هەڵی بگرنو زوو بچنە دەرەوە . دیارە دەبێ لەو ژوورەی خۆشیاندا بخەون، ئیجازەیان نیە لای دایكو باوکیان بخەون ، مەگەر لەکاتێکا کە زەرورەت هەبێ، لەسەفەردا یا لە جێیەکا دوو ژوور دەست نەکەوێ، لەکاتێکدا وەزعیەتێکی ئاوا بێتە پێشەوە، ڕێك نەکەوێ لە ژووری ترا بن ، ئەوە بۆ ماوەیەکی کەم، بۆ زەرورەت، قەی ناکا، بەڵام قاعیدەو بەرنامەی ئەسڵی ئاوایە کە لە ژوورو ئۆتاقی جیادابنو لەوێ بخەون .

کاتی سێیەم : لە هەڵسانی دوای خەوە لە بەیانیاندا، تا کاتێ نوێژی بەیانی دەکرێ، تا کاتێ دایکو باوك نوێژی بەیانی دەکەن، ئەو منالانـە ئیجازەیان نیە بڕۆنە ژووری دایکو باوك ، ئەگەر شـتێکیان دەویـست دەبێ بدەن لەدەرگاو ئیجازە وەربگرن، کاتـێ ئیجازەیـان دان، بڕۆنـە ماڵەوەو ئەو شتەی دەیانەوێ هەڵی گرنو بێنە دەرەوە .

کەوابوو لەکاتی ئـەراحەتی نێـوەڕۆدا، لـەدوای نوێـژی عیشـا تـا خەوتن، هەروەها لەخەوتنیـشا تا دەگاتە بەیانیو تاکاتـێ نوێـژی بـەیانی دەکرێ، لەکاتێکەوە کە مەسەلەی جنسی و بیر لە ژن کردنو بیر لـە پیاوکردن نەکەوێتە دڵیان، لەوکاتەوە هەروەك وتمان ئەوانـە وەك ژن و پیاوی گەورەن و دەبێ بە ئیجازەوە بڕۆنە ژووری دایکو باوك، دەبـێ ژووری تایبەتی خۆیانیان هەبێ، جا ئەگەر بۆ شتێك ئیحتیاجیان هەبوو، چ لەو سێ کاتەدا، چ لە هەرکاتێکی تردا، وەك بێگانەیەك دەبێ بـدەن لە دەرگا، ئیجازە بگرن ، بڕۆنە ماڵەوە .. دیارە کاتێ دەچـنە ماڵـەوە دەبێ سەلامیش بکەن . ئەوەشیان دەبێ فێر بکەن .

ئـەم بەرنامەیـە هـەروا کـە ڕۆشـنە داوای ئـەوە دەکـا ئینسـانی موسـوڵمان دەبـێ زیـاتر لەیـەك هـۆدە و ژووری بـێ، نـاکرێ کـە موسڵمانێ تـەنها یـەك ژووری بـێ، مەگـەر لەکاتێکـدا زەروورەتێـك بێتو بۆی نەکرێ و ڕێك نەکەوێ، ئەگەر نا ئەسڵ ئەوەیە کە حەتمەن زیاتر لە ژوورێکی بێ .. لەبەرئەوە زۆرجار ئینسـان بـێ میـوان نابـێ،

بۆیە موسوڵمان نابێ لە سێ ژوور و ئۆتاق کەمتری بێ، ئەڵبەتە ئەگەر منالی حەوت ساڵ بەرەو ژووری نەبوو دەکرێ دوو ژووری بێ، ئەگەر کاتێ میوانێ هات لە ژوورەکەی تردا بێ، بەڵام ئەگەر منالی لە حەوت ساڵ بەرەو ژووری هەبوو، ئەوە حەقەن دەبێ ژوورێك بۆ خۆی و ژنەکەی هەبێ، ژوورێ بۆ منالەکانی، ژوورێکیشی بۆ میوان . تازە ئەگەر منالەکانی تەنها کوڕ نەبوون یا تەنها کچ نەبوون، بەڵکو کوڕو کچ بوون، ئەویش هەر داوای ئەوە دەکا ژووری زیاتری بێت، تا کوڕان لە ژوورێکدا بخەون، کچانیش لە ژوورێکی‌تردا، چونکە ئەوەش زۆر نابەجێ‌وخەتەرە کە براو خوشك لەو عومرەدا بەیەکەوە بخەون، لەیەك ژووردا بن، چونکە ئەگەر براوخوشك نسبەت بەیەکتر شتێك نەکەوێتە دڵیان، ئەو بەیەکەوە بوونە هەڵیان دەنێ زیاتر بیر بکەنەوە لە نامەحرەمو بێگانەکان، هەر ئەوە کەم کەم ئەیانکێشێ بۆ ئەوەی تووشی لادان لە ڕێگەو گومڕایی ببن .. کەوابوو ئەگەر ئینسانی موسڵمان دەسەڵاتی هەبوو لای کەم حەقی ئەوەیە چوار ژوور یا سێ ژووری هەبێت، ژوورێ بۆ خۆی، ژوورێ بۆ منالەکانی لە حەوت ساڵ بەرەو ژوور، بۆ کوڕان بەجیا، بۆ کچان بەجیا، ژوورێکیش بۆ میوان .. دیارە وەختێ واش دەبێت کە میوانیش ژنو پیاو دەبن، ئەوە لەوکاتەدا بە ناچاریی ڕەنگە منالەکانیان شەوێ دوو شەولای خۆیان

بکەوێتن، تا میوانەکان لەوێن . ئەوە حاڵەتی زەرورەتەو ناچارییە و قەیناکا، بەڵام ئەسڵ ئەوەیە بەوجۆرە بێ کە باسمان کرد..

بەداخەوە ئەم دەستورە هەروەك وتمان نەناسراوە و غەریبە ، ڕەنگە لای زۆرێ لە موسڵمانان هەر نەبیسرابێ ، بۆیە زۆرێك لە موسوڵمانان بێ موبالات بوون بەمە، لە کاتێکیشدا ماڵ دروست کردن زۆر سادە بوو، کۆمەڵی ئیسلامی ئەگەر چی زۆر شتی تریان هەروا بە تەقلید و شوێنکەوتنی پێشینان ریعایەت کردووە، بەڵام خەبەریان لەمە نەبووە، لەکاتێکدا توانیویانە زیاترلەیەك ژوور دروست بکەن، وەك ئەمڕۆ نەبووە کە خەرجی زۆر بێو زۆری تێ بچێ، چونکە بۆیان بەیان نەکراوە . ئەوەتا خەڵکی بەو جۆرە هاتوون کە ئێستاش لە دێهاتا کاتێ وا هەیە ژنو پیاو وکوڕوکچو میوان هەموی بەیەکەوە لەیەك ژووردا دەخەوەن، کە ئەمە زۆر زۆر نا شەرعیەو شتێکی حەرامە بۆ ئینسانی موسوڵمان دوورست نیە .. ئەم بەرنامەیە دەبێ ئەوانەی موسڵمانو ئیمانیان دامەزراوە بەو شتانەی لەمەو پێش وتومانن ، ریعایەتی بکەن، بیکەن بەباووعادەت ، بیکەن بە رەسمو یاسا لەنێو کۆمەڵدا ،کە ئەو وەزعیەتو حاڵەتە نالەبارەی کە هەیە ، بەتایبەت لەدێهاتەکانا لەبەین بچێ، خەڵك زیاتر ئاشنا ببنو نزیك بکەونەوە خوو بگرن بە ئادابو رسومی دینیەوە..

جا با ڕاستەوخۆ بچینە خزمەت ئایەتەکان :

دەفەرموێ : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ﴾ بانگ دەکاتە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، ئەگەر ئیمانتان هێناوە، ئەگەر ئیمانەکەتان ڕاستە ، دەبێ ئائەمە بکەن : ﴿ لِيَسْتَأْذِنْكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنْكُمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ﴾ .. لێرەدا باسی عەبدو کەنیزەکیش کراوە کە لە قەدیمدا هەبوون، ئەوانیش حوکمیان هەروەك حوکمی ئەومناڵانەیە لەبەینی حەوت تا دوازدە ساڵیدان، دەفەرموێ : ئەوانەی لە لاتانن لەو عەبدو کەنیزەکانە ، هەروەها ئەو منالآنەتان کە هێشتا نەگەیشتوونەتە حاڵەتێك حەز بکەن بە جنسی تر، یانی کچان حەز بکەن بە کوڕان، یان کوڕان حەز بکەن لەکچان، هێشتا نەگەیشتوونەتە ئەوحاڵەتەی دڵیان بەیەکەوە بێتو حەز بکەن لەوجۆرە شتانە، بۆ نمونە نەگەیشتوونەتە ١٣ ساڵو ١٤ ساڵ ، ئەوانە با سێ جار لەشەوو ڕۆژدا ئەگەر ویستیان بێنە ژوورەکەتان، با بەئیجازە بێن :

١-﴿ مِنْ قَبْلِ صَلَاةِ الْفَجْرِ ﴾ : پێش نوێژی بەیانی .

٢- ﴿وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُمْ مِنَ الظَّهِيرَةِ﴾ : کاتێ لیباسەکانتان لا دەبەن و ئیسراحەت دەکەن لەکاتی نیوەڕۆدا.

٣-﴿ وَمِنْ بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ ﴾ : هەروەها دوای نوێژی عیشا .
﴿ ثَلَاثُ عَوْرَاتٍ لَكُمْ ﴾ : ئەو سێ کاتە ، دەبێ خەڵك تیایاندا نەیەن بەسەرتاندا، چونکە ئێوە ئامادەی ئەوە نین و حاڵەتێکتان هەیە دەبێ لە خەڵك شاراوە و پۆشیدە بن .. بەلآم دوای ئەو سێ وەختە

دەفەرموێ : ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلاَ عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ ، طَوَّافُونَ عَلَيْكُمْ، بَعْضُكُمْ عَلَى بَعْضٍ ﴾: غەیری ئەو سێ کاتە ئیزن فەیدی نیە وگوناح نیە ، لادان لەرێ نیە ئەگەر بەبێ ئیجازەش ئەو منالآنە بێنە ناوتان. ئەوانە هاتوچۆتان دەکەن و تێکەڵی یەکترن .

﴿ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ الآيَاتِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ : بەوجۆرە خوا ئایەت و فەرمانەکانی، بۆ ئێوە بەیان دەکاو ڕۆشیان دەکاتەوە . خوا زانایەو هەرکارێ دەیکا بەجێ دەیکاو دەزانێ هەر ئەوە مەسلەحەتە، هەر ئەوە بەجێیە، لەبەرئەوەیە ئەو قانون و بەرنامەیەی ناردووە کە بەجێیەوغەیری ئەوە نابەجێیەو، ئینسان بەرەو ناخۆشی و بەرەو فەسادو لەبەین چوون دەکێشێ، لەبەین چوونی مەعنەویەت و روح و ئەخلاق و خورەوشتی جوان .

﴿ وَإِذَا بَلَغَ الأَطْفَالُ مِنكُمُ الْحُلُمَ فَلْيَسْتَأْذِنُوا كَمَا اسْتَأْذَنَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ ﴾: کاتێ منالەکانتان گەیشتنە حالەتێك حەز بکەن لە جنسیتر، کوڕ حەز بکا لە کچ وکچ حەز بکا لە کوڕ، لە دەوری١٣و ١٤ ساڵ بەولاوە، باهەروەك ئەوانەی پێش ئەوان بوون، وەك پیاوی گەورە و ژنی گەورە، هەمیشە ئیجازە بگرنو بە ئیزنەوە بێنە ژوورەکانتانەوە، ﴿ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ : خوا بەو جۆرە ئایەتەکانو فەرمانە ڕێ ڕۆشنکەرەوەکانی بۆ ئێوە دەردەخا، ئەو زانا و کار بەجێیە .

* پاش ئەمانە حوکمێکی تر بەیان دەکا، فەرمانێکیتر دەردەکاو دەفەرموێ : لەوەوپێش وتوومانە ژنان چۆن خۆیان داپۆشن، چۆن کراس بکەنە بەر، چۆن سەرپۆش و ڕووسەری بدەن بەسەرو ملیانـدا، ئێستا لێرەدا دەفەرموێ : ئەگەر ژن زۆر پیر بوو، گەیشتە حاڵەتێك تیر بەتەمای شووکردن نەبوو، نیشتەجێی ماڵ بوو بوو، وای لێهاتبوو تیر لەهاتوچۆ و کارو فەعالیەت کەوتبوو، ئەوە قەیناکا، پێویست ناکا وەك ژنەکانی تر خۆی داپۆشێ . قەیناکا وەك ئەوان سەرپۆشەکەی نەدا بەسەروملیا، قەیناکا وەك ئەوان کراسی شۆڕ ـ بەوجۆرەی لە پێشدا بەیان کرا ـ نەکاتە بەری، ئەکرێ تۆزێ کەمتر لەوان خۆی داپۆشێ . هەڵبەتە نەبەو مانایە زیادە ڕەوی بکا ، بەڵام واجب و پێویست نیە، وەك ئەوانی تر بەتەواوی خۆی داپۆشێ . جا دەفەرموێ : دەتوانێ وانەکا، بەڵام ئەگەر ئەویش جوان خۆی داپۆشێ وەك ژنەکانی تر، ئەوە خۆ باشترە بۆی :

﴿ وَالْقَوَاعِدُ مِنَ النِّسَاءِ اللاَّتِي لاَ يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَنْ يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَاتٍ بِزِينَةٍ ﴾ : ئەو ژنانەی نیشتەجێن، ئەوانەی لەماڵدا ماونەتەوەو بەتەمای شووکردن نین، ئەوە قەیناکا، لادان لەرێو گوناح نیە بۆیان کە وەك ژنانی ترخۆیان دانەپۆشن ، بەشەرتێ خۆیان نەڕازێننەوەو، خۆیان ئارایش نەکەن، بەجۆرێ کە خەڵك بۆیان بڕوانن . ﴿ وَأَنْ يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَهُنَّ ﴾: خۆ ئەگەر خۆیان

داپۆشن‌و وەك ژنەكانی تر بكەن ئەوە باشترە بۆیـان . ﴿ وَاللَّهُ سَـمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾ : خوا بیسەر و زانایە، ئەبیسێ كە هەركەس چی دەڵێ، بـەپێی ئەوەش كە دەیڵێ موحاكەمە دەكاو سـزای دەدا. دەشـزانێ هەركـەس نیەت و ڕەفتاری چیە ..

* دوای ئەوە فەرمانێكی‌تر دەرئەكا، ئەویش ئەوەیە هەنـدێ كـەس هەن لەناو كۆمەڵـدا پێیـان نـاكرێ خۆیـان وەسـیلەی ژیـانی خۆیـان كەسب بكەن، توانایی ئەوەیان نیە كار بكەن، ئەوانە بۆ ئـەوەی بتـوانن بژین‌و ژیانیان بەنە سەر، حەقیان بەسەر هەموو كەسەوە هەیـە، ئەوانـە دەتوانن بە ئیزن‌و ئیجازەوە بڕۆنە ماڵی ئەمو ئەوو، لـە خۆراكێـك كـە هەیە لەو ماڵانەدا بخۆن، ئەسڵ و قاعیدە و قانون بۆ ئەوان ئەوەیە كە لە ماڵی هـەموو كـەس ـ ئەڵبەتـە غـەیری مـاڵی هـەتیو ـ بخۆن ، بـڕۆن بەشداربن، چونكە ئەگەر وانەبێ لەبەین دەچن، خۆیـان نـاتوانن ژیـانی خۆیان تەئمین بكەن‌و وەسیلەی ژیانی خۆیان بەدەست بێنن . جاكەسێ بە ئاشكرا ئەوانە مەنع بكاو بڵێ من ئیجازەم نیە لەشتی من بخۆن، ئەوە لەوكاتەدا دەبێ خۆ دورر بگرن‌و نەڕۆن، مەگەر زەروور بێت ، واتـە : ئەگەر لەو شـتە نـەخۆن تووشـی زیـان بـن، لەوكاتـەدا ئەگـەر چـی مەنعیشیان بكرێت هەر حەقیان هەیەو دەتوانن بیخۆن .

ئەوانە ئەم چەند کەسەن : ئەوەی نابینا بێ، ئەوەی شەل بێ، ئەوەی نەخۆش بێ، ئەمانە زۆربەیان ناتوانن کەسب و کاربکەن . ئەمانە دەبێ لەکاتێکدا بڕۆن بۆ ماڵان کە بزانن خاوەنەکانیان پێیان ناخۆش نیە، جا کە چوون حەقیان هەیە خۆراك بخۆن .

* هەروەها بۆ ئەوەی پەیوەندی و ڕابیتەی ناو خزمان لەگەڵ یەکتردا مەحکەم تربێت و زیاتر بەیەکەوە بن و زیاتر نزیك بن لەیەك، خوای گەورە قانونێکی دامەزراندووە ، چەند کەسی ناو بردوون و دەفەرموێ : ئینسان دەتوانێ بڕواتە ئەو ماڵانەو لەو ماڵانە خۆراك بخوا، لەگەڵ ئەو ماڵانە نابێ وەك بێگانە ڕەفتار بکا، ئاخر قانون و قاعیدەیەك هەیە بۆ ئەوەی ئینسان ئیجازەی نیە لەماڵی بێگانەدا شتێ بخوا، مەگەر خۆی ئیزنی دابێ، خۆی ئاشکرا وتبێتی ئیجازەم هەیە بخۆیت، یا دەعوەتی کردبێت، یا بەجۆرێك گەیاندبێتی کە ئیجازەم هەیە بخۆیت، ئالەو کاتەدا حەقی هەیەو ئیجازەی هەیە. کەس ئیجازەی نیە لە سەروەت و ماڵی کەس ئیستیفادە بکا، بەڵام بۆ ئەم فرمانە کە ئێستا ناویان ئەبا قانون پێچەوانەی ئەوەیە . قانون ئەوەیە بێ ئیجازە دەتوانێ شت بخوا، مەگەر خۆی مەنعی کردبێ و وتبێتی حەقت نیە بخۆی، لەو کاتەدا ناتوانێ بخوا.. ئەوکەس و خزمانەش ئەمانەن: ماڵی باوك، ماڵی دایك، ماڵی برا، ماڵی خوشك، ماڵی مام، ماڵی پور (خوشکی باوك)، ماڵی خاڵ، ماڵی پور (خوشکی دایك)، هەروەها ئەو ماڵانەی

کلیلیان لەدەستی ئەودایە، وەك ئەوەی کەسێك هاوسێی چوو بێت بۆ سەفەرو کلیلی ماڵەکەی دابێتە لای ئەوو، وتبێتی چاودێری لێ بکەو، لەوێ بخەوەو، سەری لێ بدە، ئەویش دەتوانێ ئەگەر شتێ لەماڵەکەدا هەیە، یا خۆراکێ هەیە، لێی بخوا، چونکە ئەوان ئیعتیمادیان پێ کردووە و کلیلیان داوەتە دەستی، مەگەر مەنعی بکەنو بڵێن حەقت نیە بخۆیت، هەروەها ماڵی دۆستێك کە بەڕاستی دۆست بێت .

ئالەم چەند ماڵەدا ئینسان بۆ ئەوەی ئیحساسی بێگانە بوون نەکا، بۆ ئەوەی هەست نەکات بەوەی کە جیایە لێیان، بۆ ئەوەی زیاتر لەیەك نزیك بن و خۆیان جیا لە یەکتر نەزانن ، قاعیدە ئەوەیە کاتێ چووە ئەو ماڵانە ماتڵ نەبێ تا ئیجازەی ئاشکرای پێ بدەن، بەدەم بڵێن : دەی ئەو شتە بخۆ، تەنانەت دەتوانێ خۆی بڕواتە سەر ئەو خۆراکە، مەسەلەن بڕواتە سەر یەخچاڵو و سەلاجەکە و شتێ دەربێنێ و بیخوا، یا لەکاتێکدا سفرە ڕادەخەن و خۆراکێ دادەنێن ئەتوانێ لەوخۆراکە بخوا، مەگەر بزانێ کە پێیان ناخۆشەو ئیجازەیان نیە . ئەگەر زانی پێیان ناخۆشەو ئیجازەیان نیە ئەوە نەیخوا، بەڵام ئەگەر شتێك دەرنەکەوت و نەیانوت حەقت نیە بخۆی، ئەوە ئیتر دەتوانێ بخوا، ئەگەرچی نەشیان وتبێ ..

ئەوەش قاعیدەیەکی زۆرگرنگە بۆ ئەوەی ئەم خزمانە زیاترلە یەکتر نزیك بن، چونکە ئەگەرکەسێ حەقی نەبێ لەوماڵانە – بۆ نمونە – شتێ

بخوا تا ئیجازەی بدەن، ئیتر وای لێ دێت هەست بەوە بکا کە بێگانەیە ..

دەفەرموێ: ﴿ لَيْسَ عَلَى الأَعْمَى حَرَجٌ ، وَلاَ عَلَى الأَعْرَجِ حَرَجٌ ، وَلاَ عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ، وَلاَ عَلَى أَنفُسِكُمْ ، أَنْ تَأْكُلُوا مِنْ بُيُوتِكُمْ ، أَوْ بُيُوتِ آبَائِكُمْ ، أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَاتِكُمْ ، أَوْ بُيُوتِ إِخْوَانِكُمْ ، أَوْ بُيُوتِ أَخَوَاتِكُمْ ،أَوْ بُيُوتِ أَعْمَامِكُمْ ، أَوْ بُيُوتِ عَمَّاتِكُمْ ،أَوْ بُيُوتِ أَخْوَالِكُمْ،أَوْ بُيُوتِ خَالاَتِكُمْ ، أَوْ مَا مَلَكْتُمْ مَفَاتِحَهُ ، أَوْ صَدِيقِكُمْ ﴾ واتە : قەیناکا، مەنعیان ناکرێ ئەوانەی کە نابینان، ئەوانەی شەلن، ئەوانەی نەخۆشن، قەدەغەیان لێ ناکرێ لە هەر ماڵێك خۆراك بخۆن، چونکە نیازیان دەبێ بەوە، ئەگەر ناوا نەبێ رەنگە تووشی زەرەرو زیان ببن . هەروەها ئێوەش خۆتان قەیناکاو مەنع نیە لەو چەند ماڵەدا خۆراك بخۆن . هەروەها مەنع نیە لەماڵی خۆتان شت بخۆن، یا لەماڵی باوکەکانتان، یا دایکەکانتان، یا ئەوانەی لە پێشدا ناومان بردن ﴿ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَنْ تَأْكُلُوا جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا ﴾: جاکاتێکیش لەگەڵ یەکێ لەوانە کۆبوونەوە و چوونە یەکێك لەو ماڵانە، لەگەڵ باوك، لەگەڵ دایك، لەگەڵ برا، لەگەڵ خوشك‌و غەیری ئەوانە کە لێرە ناوبران، دروستە بەیەکەوە دانیشن شت بخۆن، هەروەها دروستە جیاجیا، هەرکام لەکاتێکا، یا هەرکام لەلایەکەوە .

﴿ فَإِذَا دَخَلْتُمْ بُيُوتًا فَسَلِّمُوا عَلَى أَنفُسِكُمْ ، تَحِيَّةً مِنْ عِنْدِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً ﴾ : جا كاتێ چوونە ئەو ماڵانەوە، سەلام بكەن لەسەر خۆتان، دوعای خێر بكەن بۆ خۆتان . ئەگەر چوونە ماڵێكەوە كەسی تیا نەبوو، دوعای خێرو سەلام لەسەر خۆتان دەكەن . سەلام كردن لەوان هەروەك سەلام كردنە لە خۆتان، سەلام لە خۆتان بكەن، دوعای خێر بۆ خۆتان بكەن، چونكە ئەو سەلامو دوعای خێرە رێزلێنانێكە و خێرێكە لەتەرەفی خواوە قەرار دراوەو بەرەكەتی تیایە، خێری تیایە، شتێكی پاك و جوانە .

﴿ كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ : بەو جۆرە خوا نایەت و فەرمانە رێ رۆشنكەرەوەكانی بۆ ئێوە روون دەكاتەوەو دەریان دەخات، بەڵكو ئێوە ئەوانە بیسنو وەریان گرن، لەبیرتان بێ و لە بیرتان نەچنەوە و بەكاریان بهێننو، بەپێی ئەوانە عەمەل بكەن .

* دوای ئەوە شتێكی تریش هەیە زۆرگرنگەو دەبێ مولاحەزە بكرێ - كە بەداخەوە زۆركەس تووشی دەبنو وادەزانن شتێكی چكۆلەیەو سزای لەسەر نیە - دەبێ باس بكرێ، ئەویش ئەوەیە كە كەسێ نیسبەتی زیناكردن لەكەسێكی تر بدات، لە ژنێك كە پاك داوێنە، توشی زیناوكاری ناشەرعی نەبووە ، بە ژنێكی پاك داوەن ناسراوە، وەك چۆن كەسێ لەناو قەڵایەكدا بێ، بەوجۆرە وا لەناو قەڵای پاك

داوێنیدا، کەسێ ئەو ژنە تاوانبار بکا بەوەی زینای کردووە، ئەوە تووشی گوناهێکی (کەبیرە)، گوناهێکی زۆرگەورە بووە، ئەگەر تەوبە نەکاو لەسەری بڕوات تا ئاخر، خوا لە ئایەتێکی تر هەر لەو سورەتەدا دەفەرموێ : ئەوکەسە لە دونیاو قیامەتا دەکەوێتە بەر لەعنەتی خواو عەزابێکی گەورەی بۆ هەیە، حەقمن ئەگا بە جەزای خۆی و، هیچ شتێك نابێتە مانع لەوەی بگا بەوجەزایە . دەفەرموێ :

﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ الْغَافِلَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾ : ئەوانەی تۆمەتی زینا و ئەوکارە نامەشروعە دەدەن لەو ژنانەی پاك داوێنن و وان لە قەڵای پاك داوێنیدا و، بێ ئاگان لەو جۆرە نیش و کارانە، ئەسڵەن بیریان بەلای ئەو کردارە ناپەسەندەوە نیە ، بڕواداران و ڕێی حەقیان ناسیوەو تەسلیمی بوون، لەسەری دامەزراون، کەسێك ئەوان (متهم) بکاو بڵێ تووشی زینا بوون، لە دنیاو لە ئاخیرەتا لەعنەتی لێ دەکرێ، دەکەوێتە بەر غەزەبی خواوعەزابێکی گەورەی بۆ هەیە .

﴿ يَوْمَ تَشْهَدُ عَلَيْهِمْ أَلْسِنَتُهُمْ وَأَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ : لە ڕۆژێکدا کە زمان و دەست وپێکانیان شایەتی دەدەن لەسەریان کە چییان کردووە .

﴿ يَوْمَئِذٍ يُوَفِّيهِمُ اللَّهُ دِينَهُمُ الْحَقَّ، وَيَعْلَمُونَ أَنَّ اللَّهَ هُوَ الْحَقُّ الْمُبِينُ ﴾: ئەو ڕۆژە خوا جەزاکەیان بەتەواوی ئەداتەوە، جەزایەك کە

بەجێیەو دروستەو دەبێ بدرێتەوە. ئەو ڕۆژە دەزانن کە خوا حەقەو دروستە و ڕوونکەرەوەی هەرشتێکە، بەمەرکردنەوەیەك جەزای موناسیی خۆی دەداتەوە، شتێك بێ جەزاو پاداشت ناهێڵێتەوە، ئەوە جەزای قیامەتی ئەوتۆمەت دانەیە..

بەڵام بە نیسبەت دنیاوە، دەفەرموێ : ئەوانەی کە توهمەتی زینا دەدەن لەو ژنە پاك داوێنانە ، دەبێ چوار شایەت بهێنن، چوار شایەتی موسوڵمانی ڕێك و پێك بهێنن و شایەتی بدەن، چوار پیاو بهێنن کە ئەوکارەیان دیوەو بەتەواوی چاویان لێوە بووە کە ئەو کارە ئەنجام بووە .. ئەگەر چوار شایەتیان نەهێنا ئەوا هەشتا دار، یا هەشتا شەلاقیان لێ بدەن، دوای ئەوەش هەرگیز شایەتی تریان لێ قبوڵ مەکەن، مەحرومیان بکەن لەو نرخ و ئیعتیبارەی کە هەر موسوڵمانێ دەبێ لە کۆمەڵی ئیسلامیدا ببێ . ئیتر دوای ئەوە دادگای ئیسلامیی ئیعلام دەکا کە ئەو شەخصە بەهیچ جۆر و لە هیچ شتێکا شایەتی لێ قبوڵ ناکرێ، ئینسانێکی نارێك و نادروستە، بۆ ئەوە ناشێ کە بگیرێ بە شایەت لە هیچ شتێکا.. دوای ئەوە دەفەرموێ : ئائەوانە لە حدودی بەندەیی خوا دەرچوون، لە دینداری خاریج بوون، مەگەر ئەوانەیان دوای ئەوکارە تەوبەیان کردبێ، دوای ئەو فەسادە، ئەو وەزعیەتە خراپەی باریان هێناوە و بوون بەسەبەبی لەکەدارکردنی شەرەف و نرخ و ڕێزی ژنێکی پاك داوێن . ئەوانە ئاژاوەیان خستۆتە ناو خێزان و

خانەوادەیەك، یا چەندەها خانەوادە، دەبێ ئەو كەسانە ئەو فەسادو ئاژاوەیە هەڵگرن، بڕۆن ئیعتیراف بكەن بەوەی درۆیان كردووە، هیچیان بەو ژنە پاك داوێنەوە نەدیوە، كارێك بكەن نەسەری ئەو كارە ناڵەبارو ناپەسەندە ، ئەو بوختانەیان لەبەین بچێت، لە جێی ئەو فەسادەی كردوویانە ئیسلاحێك بكەن، لەو كاتەدا خوای گەورە (غفور)و (رحیم)ە ، لە گوناهەكانیان ئەبورێ و چاوپۆشی دەكا، ئەو تەوبە وئیسلاحەی لە دوایدا ئەیكەن، لێیان قبوڵ دەكا، جا ئایەتەكە دەفەرموێ:

﴿ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً ، وَلاَ تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا،وَأُوْلَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ . إِلاَّ الَّذِينَ تَابُوا مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ وَأَصْلَحُوا ،فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ﴾: ئەڵبەتە شەلاق لێدان و فەلاقەكردنەكە، یا قبوڵ نەكردنی شایەتیەكە، لەكاتێكا دەبێ كە حكومەتی ئیسلامی ڕاستەقینە هەبێت، ئەوە لەسەر حوكمی ئیسلامی ڕاستەقینەیە،كە ئەوە جێبەجێ بكات، بەڵام لەكاتێكا حكومەتی ئیسلامی نیە ئەو دوو شتە ئیجرا ناكرێ .

جا ئەگەر كەسێك ئیمانی بەخوا بێت، لە ڕۆژی قیامەت بترسێ، دیارە شتی وا ناكا و نیسبەتی زینا و تۆمەتی زینا، لە ژنی پاك داوێن نادا، ئەگەر جارێكیش تووشی ئەوە بوو، حەتمەن ئەگەر ئیمانی ببێ، ئەوە تەوبە دەكاو پەشیمان دەبێتەوە، ئەگەڕێتەوە و ئیعتیراف دەكا بەو

ناهەقی‌یە، بەو درۆ وتنە، هەولیش دەدا بۆ ئەوەی لە جێی ئەوکارە فاسیدو ناباره کە کردوویەتی، کاری باش بکا، ئیسلاح بکا، ئابڕوی ئەو ژنە بسێنێتەوە کە موتەهەمی کردووە ..

ئەمانە چەند حوکمو فەرمانێك بوون لەلایەن خوای گەورەوە بۆ هەر ئینسانێك بیەوێ ڕێگای بەندەیی خوا بگرێ، پێویستە موسڵمان بیانزانێ و ڕیعایەتیان بکا، بەبێ ڕیعایەتی ئەمانەو زۆرێکی تر لەو فەرمانو حوکمانەی‌لە قورئانو سوونەتی پێغەمبەری خوادا هەن، ئینسان ناتوانێ بەندەی خوا بێ .. هەڵبەتە زۆرێکی تریش هەن، تەنها ئەمانە نین، بەڵام ئەگەر ئینسان ڕیعایەتی ئەمانە بکا کە باس کران، زۆر شتی ئەنجام داوە، دەکرێ بۆ ئەوانەی تریش لەوکەسانەی بەڕاستی زانان و لە قورئان و سونەتی پێغەمبەری خوا ئاگادارن، پرسیار بکاو زیاتر ڕێگای بەندەیی خوا بناسێ ، زیاتر ببێ بە ئەهلی (تعهد) و، ئەوەی خوا دایناوە ڕیعایەتی بکا، تا خۆشبەختی دنیاو ئاخیرەتی دەست بکەوێ .

## گرنگیی دووبارە کردنەوە لە پەروەردەکردندا

شتێك هەیە زۆر پێویستە گرنگیی پێ بدرێ ، ئەویش ئەوەیە تەنها لەکاتێکدا ئەنجامدانی هەرکردەوەیەکی چاك و دووریی گرتن لە کردەوەی خراپ سوودی هەیە بۆی، کە ئیمان دامەزراو بێ، ئەنجامدانی ئەوکردەوە چاکە، یا دووریی گرتن لەوکردەوە خراپە، لە دەروونی ئینسانەکەدا جێگیر بووبێ ، لە دڵیەوە هەڵقوڵێ .. ئەگەر وانەبێ هیچ سوود و فائیدەیەکی بۆ نیە .. جا بۆ ئەوەی رۆشن بێتەوە با نمونەیەك بێنینەوە :

ئەگەر منالێك ئەلفو بێی پێ بلێن، بەلام یەك دوو جارێ پێی بلێن، ئەویش یەك دوو جارێ بیخوێنێتەوەو دوایی لەبیری بچێتەوە، ئەوە پێی ناوترێ کە خوێندەوارە و ئەلفو بێ دەزانێ . ئەوکەسە تەنها لە کاتێکا دەبێتە خوێندەوارکە ئەو ئەلفو بێیە زۆر بۆی خوێنرابێتەوە، ئەویش خۆی دوایی زۆر دەوری‌کردبێتەوە و زۆر پیایدا چووبێتەوە، بە جۆرێك کە لە دڵیدا جێگیر بووبێ و ئیتر هەرگیز لەبیری نەچێتەوە ، هەرکاتێ بیەوێ بیخوێنێتەوە بتوانێ و رەوانی بێت ، ئالەوکاتەدا ئەوترێ ئەوکەسە خوێندەوارە ..

هەروەك لەمەو پێش وتومانە : ئەگەر پیاوێکی خوێندەوار نەخوێندەوارێك دابنێ و یەك کتێبیشی پێ بخوێنێتەوە، لەبەرئەوەی هەرلەوکاتەدا دەتوانێ ئەو شتانە بخوێنێتەوە، دوایی ئیتر نازانێ یەك

لاپەڕەش بخوێنیتەوە. ئەوە پێی ناوتری خوێندەوار، چونکە لە دڵیا جێگیر نەبووەو دانەمەزراوە لەسەرئەوە، شتێك بووە هاتووە بە دەمیا و تەواو بووە.. بەهەمان جۆر کردەوەی چاکیش تەنها لەکاتێکا سوودی هەیە بۆ ئینسان کە لە دڵیا ڕیشەی داکوتابێ ولەسەری دامەزرابێ . ئیمانی وا دامەزرا بێ هەرکاتێ بیەوێ ئەو کردەوە چاکە ئەنجام بدا، وانەبێ کە لەدەستی دەرچێت، واتە لە هەندێ کاتا ئەنجامی بدا، بەڵام لە دڵیدا ڕیشەی دانەکوتابێ.. کردەوەی خراپیش هەروایە، لە کاتێکدا ئینسان لەدەستی ئەویش ڕزگاری دەبێ، کە بەڕاستی لە دڵی دەری هێنابێ، نەك لە دڵیا مابێ و تەصمیم و عەزمی لەسەر ئەوە بێت و بیەوێت ئەو کردەوەیە ئەنجام بدا، بەڵام لە ڕواڵەت و زاهیردا لێی دوورکەوێتەوە .. ئەگەر ـ بۆ نموونە ـ ئینسانێ قەسدی لەسەر ئەوە بوو عارەق بخواتەوە، ئەگەرلە زاهیریشدا بۆی ڕێك نەکەوێ بیخواتەوە، ئەوە هەرخەریکە دەیخواتەوە!! لای خوا بە عارەقخۆر حسێب دەکرێ . هەروەك چۆن ئەگەر ئینسان قەسدی ئەوەبوو کە خێر وئیحسان بکا، لە ڕێی خوادا زەکات بدا، ئەگەر ماڵو سەروەتیشی نەبوو، هەروەك ئەوەیە زەکات بدا لە ڕێی خوادا.. ئەوە زۆرگرنگە کە ئینسان ئیمان ئاوا لە دڵیا دامەزرێ تا ببێتە سەرچاوەی کردەوەی چاك و، دووریی کردن لەکردەوەی خراپ .. بەڵام ئەگەر ئیمانەکە لە دڵیدا دانەمەزرا بوو، ئەگەر کردەوەی چاکیشی کرد ئەوە بە هیچ

حسێب ناکرێ. ئەگەر کردەوەی خراپیشی ئەنجام نەدا، بەڵام لەبەرئەوەی لە دڵیایەتی کە بیکاو قەسدیەتی لەسەری ، هەر بە خراپکار لای خوا ئەنوسرێ..

لەبەرئەوە پێویستە موسوڵمان چەند جار بگەڕێتەوە بۆ ئەو باسانەی لەمەوپێش کراون، بەتایبەت گوێ بدا بەو باسانەی لەبارەی ئاخیرەت و بەهەشت و جەهەننەم و دادگای خواوە لەمەوپێش کراون. زۆر لەسەر ئەوانە بهێنێتەوە، بەڵکو خوای (متعال) تەوفیقی بدا و ئیمان لە دڵیا جێگیر بێ، وای لێ بێت بێتە ئەهلی کردەوەی چاك . وای لێ بێت هەروەك چۆن خوێندەوارەکە هەرکات ویستی کتێب بخوێنێتەوە دەتوانێ بخوێنێتەوە، ئەویش هەرکات ویستی کردەوەی چاك ئەنجام بدات، ئەنجامی بدات، کردەوە خراپەکانیش ریشەیان لە دڵی هەڵکەنرێ، یا ئەسڵەن هەر کردەوەی خراپ ئەنجام نەدات، یا ئەگەر جارێ لەدەستی دەرچوو ئەنجامی دا، بە زووترین کات بگەڕێتەوەو تەوبە بکاو بڕواتەوە بۆلای خوای خۆی و، داوای لێبوردنی لێ بکا، داوای لێ بکا ئەو تەوبەو ئەوکردەوە چاکانەی دوای تەوبەکەی ئەیکا قبوڵ بکا ..

## کۆتایی

لەکۆتاییدا ئەوە دەخەینەوە بیرکە پێشتر وتمان :

ئەگەر ئینسان مانای سورەتی (العصر) بزانێ و بەراستی ریعایەتی بکا، ئەگا بە خۆشبەختی دونیاو ئاخیرەت .. ئەیخەمەوە بیرو دەڵێم : هەر موسڵمانێك دەتوانێ لەبەری بکات یا لەبەری بکات ، هەروەك چۆن سورەی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ)یان لەبەر کردووە، ئەوانەی نەخوێنەوارنو لە نوێژدا ئەیخوێنن یا ئەمەش لەبەر بکەن، بەلام بەماناکەیەوە . لەو دوورکاتە نوێژەدا کە دوای سورەی فاتیحە سورەی تر ئەخوێنن، یا ئەم سورەتە لەیەکێك لە رکاتەکانا بیخوێنن، (قُلْ هُوَ اللَّهُ)یش لەو رکاتەکەی تردا .. دیارە دەبێ بەماناکەیەوە بیخوێنن، هۆشیان بەلای ماناکەیەوە بێت، یا تەفسیر لە دڵیاندا بکاو، کەم کەم وایان لێ بێ کە دڵیان دامەزرێ لەسەر ئەوەی ئەو سورەتە چییان لێ داوا دەکاو، بەوجۆرە بن کە دەفەرموێ :

﴿ وَالْعَصْرِ(١) إِنَّ الإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ(٢) إِلاَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ(٣) ﴾:

قەسەم بە زەمانە! ئەو زەمانەی ئینسان ئەگەر باش سەرنجی بدات دەزانێ هەرکەس عاقیبەتی چۆنە . عاقیبەتی ئیمانو عەمەلی صالح چیە، عاقیبەتی کوفرو خراپکاریش چیە، هەر زەمانەی خۆی دەری دەخا، هەرکەس نەتیجەی چی بووەو بەچی گەیوە و چ سەرەنجامێکی

دەست کەوتووە! قەسەم بەزەمانە! بێگومان و بە ڕاستی ئینسان ـ هەر ئینسانێ ـ وا لە خەسارەت‌و زیانکاریدا، نە تەنها سوودی دەست نەکەوتووە لە ژیانی دونیاداو لە تیجارەتی ژیانی دونیادا، بەڵکو سەرمایەکەشی لەدەست دەرچووە، خۆیشی لەدەست داوە، مەگەر ئەوانەی ئیمانیان هێنا، ئەوانەی ڕێی بەندەیی خوایان ناسی‌و تەسلیمی بوون و، لەسەری دامەزران، ئەوانەی کردەوە چاکەکانیان ئەنجام دا، وەك ئەو کردەوانەی لەمەوپێش باس کران، ئەوانەی بەیەکێ وەسیەت دەکەن، بەیەکێ سفارش دەکەن، لەیەکێ داوا دەکەن کەلەسەر حەق بن، لەسەر بەرنامەی دروستی خوابن، لەسەر بەرنامەی ئیمان‌و عەمەلی صالح بن، هەروەها ئەوانەی کە وەصیەت بەیەکێ دەکەن، نەصیحەتی یەکێ دەکەن کەلەسەر ڕێی بەندایەتی صەبر بکەن‌و خۆڕاگر بن .

# پێرست



# پوختەی چەند پەرەگرافێك لەم كتێبە :

*هەمومان دەزانین خوای گەورە بۆ بەندەیی ( عیبادەت )
خەلقی كردووین ، بەندەییش بەوە ئەكرێ ئینسان پەیڕەوی
بەرنامەیەك بێ كەخوا بۆی داناوە . ئەو بەرنامەیەی
لە كتێبەكەیدا ناردویەتی ، واتە : قورئان

* ( بەندەیی بۆ خوا ئەوەیە لە ژیانتا بەجۆرێك بیت كە خوا لێت داوا دەكا ... )

* ( ئەبێ ئینسان ئەوە بزانێ كە لە ژیانیا نیازمەندە بەخوایەك كە خاوەنیەتی ..

*دەبێ بزانێ بۆ هەر هەنگاوێك هەڵی دەگرێ لەژیاندا " نیازی بەخوا هەیە ، كە
دەبێ شتانێكی لەلایەن خواوە بۆ ئامادە بكرێ ، هەروەها كۆسپ وگرفتی سەر
رێیشی بۆ لابەرێ.. )).. جا كاتێ ئەمەی زانی نەتیجە ئەوە دەبێ كە هەمو گیانی پڕ
بێ لە ئومێد و مەیل و رەغبەت بۆ لای خوا .. )

* ( دوای ئەوە ئەبێ ئینسان بیری ئەوەش بكاتەوە كە خوای گەورە هیچ شتێك بەبێ
حیكمەت ئەنجام نادات و، كاری بێ هودە ناكات ، بەتایبەتی لەگەڵ ئینساندا ،
پاشان ئەوەش ئەبێ بزانێ كە خوا خاوەنی رۆژێكە كەتیایدا لە ئینسان ئەپرسێتەوە
و ئەیكێشێتە دادگا و لێی داوا دەكا : كە لە ژیانی دونیادا چی كردووە و چی
نەكردووە ؟

* جا ئەگەر بەجۆرێ ژیانی بەسەر بردبێت كە خوا لێی داواكردووە ، ئەوە پاداشتێكی
ئەدرێتەوە ، گونجاو لەگەڵ ئەو ژیانەی بەسەری بردووە .. ئەگەر بەجۆرێكی تر
ژیانی بەسەر بردبێ ، سزایەكی ئەدرێ گونجاو لەگەڵ ئەو ژیانە..

* جا كاتێ ئینسان ئەمانەی زانی ، ئەگەر كەمێك دڵی بۆ خۆی بسوتێ و، بەتەواوی
لە غەفڵەتدا نەبێ ، ئەوە هەم ئومێد وهیوا ،هەم ترس و ئەرز ، هەموو گیانی
داگیرئەكاو ،كارێ ئەكا سەر شۆڕی ئەو رۆژە نەبێ و ، خۆشبەختی هەمیشەیی
دەست كەوێ ...

لێرەوە ئینسان پەیمانی بەندەیی بۆ خوا و شوێن كەوتنی پەیامەكەی ئەبەستێ .. )

ناصری سوبحانی

dazgayberham@yahoo.com